بسم الله الرحمن الرحيم

مەملەکەتی نوور

# ڕۆمانی ژیانی باشترین مرۆڤ

## لە فەتحەوە بۆ خیلافەت

(بەرگی سێیەم)


نووسینی: **ماکوان کەریم**

پێداچوونەوەی: **شەوبۆ جەلال، زیوەر ئەنوەر**

نووسینەوەی: **فیردەوس موحەممەد**

کتێبخانەی **حاجی قادری کۆیی**




بەڕێوەبەری گشتی: **موحەممەد خضر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤**

بەڕێوەبەری هونەری: **موستەفا موحەممەد کوردی ٠٧٥٠٩٩٩٨١٨٢**

فەیسبووک: **کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana**

ئینستگرام: **کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana**

لقی یەکەم: **بەرانبەر دەرگەی قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری**

لقی دووەم: **چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەلاف**

ئیمێل: **mdmaktaba@gmail.com**

نەخشەسازیی ناوەوە: **موستەفا موحەممەد کوردی**

نەخشەسازیی بەرگ: **برەو نەججاڕ**

چاپی یەکەم: **٢٠٢٤**

پێوانە: **١٧ * ٢٤**

تیراژ: **٤٠٠٠**

نرخ: **٣٠٠٠٠**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان**

**ژمارە سپاردنی (١٨٨)ی ساڵی (٢٠٢٠) پێدراوە**

بەهاری بێ خەزانە پەیامی محمد

بەهەشتی جاویدانە پەیامی محمد

بۆنخۆشی کرد و کردیە نێرگزەجاڕ ئەم جیهانە بە

پەیامی محمد



## یەکەم ڕۆژی فەرمانڕەوایی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککەدا

ماکوان: هەموو فەتحی مەککە نیو ڕۆژی نەخایاند، واتا هەموو چەند کاتژمێرێکی پێ چوو، پێغەمبە ﷺ هاتە ناو شار وەکو سەرکردەی سەرکەوتووی دنیایی نەبوو بەڵکو زۆر بە تەوازوع و گەردنکەچی بۆ خوای پەروەردگار سەری نەوی کردبوو، ئەیویست ئەوە بۆ خەڵکی مەککە و سوپاکەی و گشت موسڵمانان بڵێت: فەتح کردن مانای زیاد کردنی موڵک نییە بۆ سەر موڵکی تاکە کەس و مەلیک و پاشا، لێرەوە مانای حوکمی خوای گەورەمان فێر دەکات کە حوکمی خوای گەورە فەرمانڕەوایی دەکات نەک هێز و ئەقڵی مرۆڤەکان

﴿... إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ...﴾ [یوسف]

واتە: ...بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە خوا شایستەی کەسی تر نی یە...

پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ناو شار و فەتحی مەککەی کرد بە عەزیزی و سەرکەتووانە لەگەڵ ١٠ هەزار سەربازدا -ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت- بێ بەرگری کردن و خوێن ڕژان، تەنها چەند خولەکێک جەنگ ڕووی دا و خالید چارەسەری ڕەوشەکەی کرد و کۆتایی هات و هەموو هاتنە ناو شاری مەککەی پیرۆز.

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووە و کەعبە تەشریفی برد چووە حەوشەی کەعبە، یەکەم کاری کە ئەنجامی دا شکاندنی پەیکەر و بتەکانی دەوری کەعبە بوو کە بریتی بوو لە ٣٦٠ بت لە ناو کەعبە و لەسەر بانی کەعبە و لە دەوروپشتی پڕ بوون لە پەیکەری خوای قوڕەیش، هەندێک پەیکەری لە بەرد و هەندێکیان لە خۆڵ و قوڕ و بەرد دروست کرابوون، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە شکاندنی هەموو خواکانی قوڕەیش.

ئەوەی جێگای سەرنجە پێغەمبەری خوا ﷺ ٢١ساڵی تەواو چاوەڕوانی کرد هەوڵی دا وا ئەمڕۆ هەموو بت و خواکانی شکاند.

پێغەمبەری خوا ﷺ ١٣ ساڵ لە مەککە دا بانگەوازی کرد بە بەردەوامی ڕۆژێک لە ڕۆژان بیری لەوە نەکردەوە بتێک بشکێنێت، یان بیر لە وتەیەکی ناشرین بەرامبەر بە

خواکانیان بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی دەکرد و ٣٦٠ بتی تێدابوو، پاشان لە عومرەی قەزادا هیچی نەکرد، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی واقیعی بوو، پاشان بە ئاڕاستەی وەحی کاری دەکرد پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکەین، پێشتر ٢١ ساڵ ئارامی گرت، بەڵام ئێستا یەک چرکەسات ناتوانێت بوەستێت لە لانەبردن و شکاندنی پەیکەرەکان بەڵکو لە حەوشەی کەعبەدا نە نوێژی کرد نە تەوافی کرد، بەڵکو کاری یەکەمی شکاندنی هەموو خواکانی قوڕەیش بوو پاکی کردەوە لەو پیسیانە.



ماکوان: کاتێک لێکۆڵینەوە لەسەر کارەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەکەین بە گشتی و بەتایبەت لە بواری شکاندنی ئەو پەیکەرانە، یاخود هەر کارێکی تری پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، هەموو مەبەستێکی خوای لە پشتەوەیە، هەموو کارەکانی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بە فەرمانی پەروەردگار بووە، بە چاودێری وەحی بووە، بە ئاگاداری تەواوی خوای پەروەردگار بووە، واتا هیچ کردارێکی هەروا و (عەشوائی) لە پشتەوە نەبووە، هەموو بە پێوەر و بە ستراتیژی قەزا و قەدەرەوە ئەنجام دراوە، بۆتە تەشریع و یاسا و ڕێسا بۆ موسڵمانان.

ئەوەتا ئێستا بۆ یەک چرکەساتیش ئارام ناگرێت و هەرچی بت هەیە دەیشکێنێت، خۆ ئەگەر لەسەردەمی مەککە ئەو کارەی بکردایە هەموو لێی هەڵدەستانەوە سەر چنگ، دنیایان لێ دەکردە شەوی تاریک، لە شاری مەککە دا هەموو موسڵمانانیان بە تەواوەتی لەناو دەبرد، بەڵام ئێستا لە شاری مەککە خۆی حاکم و فەرمانڕەوایە و بگرە لە هەموو نیوەدوورگەی عەرەبیدا، ئارام ناگرێت لەسەر ئەو هەموو شیرک و خوانەناسییە، چیتر ناهێڵێت هاوبەش بۆ خوای گەورە ئەنجام بدرێت، بۆیە دەستی کرد بە شکاندنی بتەکان و لەگەڵیدا دەیفەرموو:

﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ۝﴾ [الإسراء].

واتە: هەروەها بڵێ: تازە حەق و ڕاستی هاتووە و بەرپا بووە و بەتاڵ و ناحەقی، پووچ و تەفرو توونا بووە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەرتیاچووە و جێگیر نەبووە و بەزیوە.

شکاندنی ئەو پەیکەرانە هەنگاوێکی سیاسی پڕ مانا و بەها بوو بۆ ئەوانەی کە چاودێری ڕووداوەکان بوون، بەدڵنیاییەوە لە ڕووی عەقیدەییەوە بڵاوکردنەوەی تەوحیدە، بەڵام لە ڕووی سیاسیەوە هەنگاوێکی زۆر گرنگ بوو، بەتەواوەتی مەعنەویاتی خەڵکی شاری مەککەی هێنایە خوار و لە ڕووی دەرونییەوە وێرانی کردن، چونکە ئەو پەیکەرانە بە درێژایی هەزاران ساڵ خەڵکی دەیپەرستن! پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هەمووی شکاندن!



هەموو خەڵکی مەککە وایان دەزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی شکاندنی خواکانیان تووشی کێشە دەبێت و زەرەر و زیانی پێ دەگات، بەڵام هەمووی شکاند و هیچ رووی نەدا، سوپای ئیسلامی هەروەکو خۆی مایەوە ئیتر لێرەدا ڕاست و دروستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ موشریکەکانی مەککە دەرکەوت و ئەوەی کە گومانی هەبوو گومانی لا نەما، بۆیان دەرکەوت کە بە درێژایی مێژوو لە گومڕایی و سەرلێشێواوی دابوون، چاوەڕوانی تەیرولئەبابیل بوون بەڵام هیچ دیار نەبوو!

قوڕەیش بەتەواوەتی بێهیوا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بە ٣٦٠ بتەکەی ناو کەعبە نەوەستا، بەڵکو مەفرەزە و سریەی لەسەر یەکتر دەنارد بۆ شکاندنی هەموو بتەکانی چواردەوری شاری مەککە، چونکە بێجگە لەو ژمارە زۆرەی ناو حەرەمی پیرۆزدا هەموو لە چواردەوری شاری مەککە پڕ بوو لە بت.

پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد بۆ دەرەوەی شاری مەککە بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید بۆ شکاندنی پەیکەری (عوزا) ئەم پەیکەرە گەورەترین خوای عەرەب بوو لە مەردۆخی سۆمەری ژوپیتەری یۆنانەوە وەریانگرتبوو.

هێز و مەفرەزەیەکی تری نارد بۆ ڕووخاندنی بتی (مەنات) بە سەرکردایەتی سەعدی کوڕی زەید ئەمیش بەناوبانگترین خوای عەرەب بوو لە عەشتاری سۆمەر و ڤینۆسی یۆنانەوە وەریان گرتبوو.

هەروەها بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص هێزێکی تری نارد بۆ ڕوخاندنی بتی (سواع) کە لەناو عەرەبدا بەناوبانگ بوو لە ناو سۆمەرەکاندا بە خوای (قیسارە) ناسرابوو لە یۆنان و ڕۆمدا بە (زیۆس) ناسرابوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆی بتی (هوبەل)ی شکاند لە ناو حەوشەی کەعبە، پەیکەری (لات) مابوو لە طائیف بوو لای هۆزی سەقیف، ئەویش یەکێک بوو لە بەناوبانگترین بتەکانی عەرەب، دوای فەتحی طائیف و لە ساڵی ٩ کۆچی دا ئەو بتە ئەشکێنێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەواوەتی شاری مەککەی پاک کردەوە لە بت و شیرک، ئاڵای یەکتا پەرستی تێدا هەڵکرد، بەمەش دڵ و دەروون و مەعنەویاتی قوڕەیش بە تەواوەتی



ڕوخا، توانای هیچ بەرگرییەکیان نەما، ئەمەش کاری یەکەم ڕۆژی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو لە ناو شاری مەککە دا.



## کاری دووەمی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە شاری مەککە دا

**ماکوان:** کاری دووەمی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دوای شکاندنی بتەکان، بانگدان بوو، بۆ بەرزکردنەوەی ناوی خوای پەروەردگار بوو بەگوێی هەموو خەڵکیدا لەسەر کەعبە و لەڕێگای هاوەڵی بەرێزی (بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی).

ئەم هەنگاوە بۆ پەروەردە و فێرکردنی ئیسلام بوو بەگشتی بۆ خەڵکی و بەتایبەت قوڕەیش، بۆ ئەوەی تێبگەن لە حەقیقەتی ئیسلام، خوای گەورە بە ئیسلام خەڵکی بە عیزەت دەکات نەک بە عەشیرەت و نەتەوە، بە چاوپۆشی لە هەموو ڕەگەز و نەتەوەیەک، لە هەموو جۆرە خەڵک و ڕەنگی پێست و کیشوەر و لایەک وا دەبینن پێغەمبەر صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بانگی بیلال دەکات کە بانگ بدات لەسەر بانی کەعبەوە، لە عومرەی قەزاش دا هەمان کاری ئەنجامدا، وا هەمان کار دووبارە دەکاتەوە، بیلال سەرکەوت و دەنگی بەرز کردەوە بەوەی کە خوای پەروەردگار هیچ شتێک لەو گەورەتر نییە.

هەموو لەبیرمانە لە یادگارییەکانی بیلال لە شاری مەککە چۆن ئازاریان ئەدا و لێوی وشک ببوو، بە دەنگێکی پڕ ناسۆر و پڕ ئازار دەیووت (احد احد)، لە دوای خوای پەروەردگار تەنها خاوەنەکەی گوێی لە نرکە و ناڵەی ئەحەدون ئەحەدی بیلال دەبوو بە قامچی ئازاریان ئەدا، بەڵام ئەمڕۆ بیلال لەوان بەرزترە و لە شاری مەککەدا لە پیرۆزترین جێگا دا موسڵمان و موشریک گوێیان لە دەنگییەتی هاوار دەکات و بانگی ئیسلام دەکات.

بانگدانی بیلال لەسەر بانی کەعبەدا زۆر کاریگەری لەسەر موشریکەکانی قوڕەیش دروست کرد.

لەو کاتەی بانگی دا سێ سەرکردەی مەککە لە نزیکەوە گوێیان لێبوو، لە هەمان کات دا چاویان لێبوو لەسەر بانی کەعبەدا بانگ ئەدات، لەوان( ئەبو سوفیان و عەتتابی کوڕی ئوسەید و حارسی کوڕی هیشام برای ئەبو جەهل)



وتیان: خوای گەورە ڕێزی لە گەورە و سەیدەکانمان گرت کە مردن و گوێیان لە دەنگی نەبوو تا تورەبن، ئاخر محمد کەسی تری نەدۆزییەوە بێجگە لەم قەلە ڕەشە!

ئەم سێ کەسە لە نزیک کەعبەدا بوون واتا دوانیان موشریک بوون ئەبو سوفیان موسڵمان بوبوو، عەتابی کوڕی ئوسەید لە گەنجەکانی قوڕەیش بوو، تەمەنی ٢٢ ساڵ بوو ، ئەوەی قسەکەی کرد وتی قەلەڕەش، عەتابی کوڕی ئوسەید بوو، حارسی کوڕی هیشام وتی:

وەڵاهی ئەگەر بزانم لەسەر حەقە شوێنی دەکەوم.

ئەبو سوفیان وتی: بەخوا من هیچ ناڵێم، خۆ ئەگەر هەرچی بڵێم ئەو دار و بەرد و خۆڵە بۆی دەگێڕنەوە.

بە تەواوەتی ئەبو سوفیان هەستی کردبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری حەقە، مەبەستی ئەوە بوو هەرچی بڵێم بە وەحی ئاگادار دەکرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە پشتیانەوە هات و پێی وتن:

ئەوەی وتوتانە هەمووی دەزانم!

پاشان هەمووی بۆ باسکردن، تۆ ئەی فلان وات وت، تۆش ئەی فلان وات وت.

ئینجا ئەبو سوفیان وتی: خۆ من هیچ قسەیەکم نەکردووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە پێکەنین.

هەردوو کەسەکە عەتاب و حارس وتیان: سوێند بە خوا شاهێدی ئەدەین کە تۆ پێغەمبەری، ئەو قسانەی کە کردمان کەس ئاگای لێ نەبوو، تا بڵێین هەواڵیان پێ داویت".

هەروەها لە کاتی بانگ دانی بیلال دا، خەڵکانێک لە بەنو سەعدی کوڕی عاص بە براکەی ئەبو جەهلیان وت، خوای گەورە ڕێزی لە سەعدی باوکمان گرت کە مردووە و گوێی لەم ڕەشە نەبوو لە سەربانی کەعبە دایە، ئینجا دوای موسڵمانبوونی حارسی کوڕی هیشام براکەی ئەبو جەهل وەڵامی دانەوە وتی: وازی لێ بهێنن ئەگەر خوای گەورە پێی خۆش نەبێت دەیگۆڕێت، سەرەتای بانگەوازی بووی لە دوای چەند خولەکێک لە موسڵمان بوون.



# ئەبو میحزەر چۆن موسڵمان بوو

ماکوان: کۆمەڵێک لە لاوانی قورەیش گاڵتەیان بە دەنگی بیلال دەکرد، ڕقیان لێبوو کە بەندەیەک چۆتە سەر کەعبە و بانگ ئەدات، یەکێک لەو گەنجانە لاسایی دەنگی بیلالی دەکردەوە کوڕێکی تەمەن ١٦ ساڵ بوو ناوی ئەبو میحزەری جەمعی بوو بەڵام دەنگی زۆر خۆش بوو، یەکێک بوو لە دەنگە خۆشەکانی قورەیش، کاتێک دەنگی بەرز کردەوە بۆ بانگدان گاڵتەی بە بیلال کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دەنگی بوو زانی توانا و هێزی دەنگی خۆشی هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد، کوڕەکە لەبەردەم پێغەمبەر ﷺ دا وەستا و وایزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەردەنی ئەدات، چونکە بڕوای وابوو کە حەددی لەسەر دادەنرێت چونکە گاڵتەی بە پیرۆزی ئیسلام کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خۆش بوو، پاشان دەستی خستە سەر سینگی و پاشان نێوچاوانی بە دەستی موبارەکی، ئیتر بوو بە بانگدەر لە شاری مەککەدا.

ئەبو میحزەر دەڵێت: کە پێغەمبەر ﷺ دەستی موبارەکی خستە سەر سینگ و نێوچاوم دڵم پڕ بوو لە ئیمان و یەقین، ئیتر زانیم ئەوە بەڕاستی پێغەمبەری خوایە.

لە دواییدا کە ئیمانی هێنا ڕاستگۆبوو لەگەڵ ئیمانەکەی دا پێغەمبەری خوا ﷺ کردی بە بانگبێژی شاری مەککە، لە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شاری مەدینە ئەبو میحزەر بانگبێژی شاری مەککە بوو تا کۆچی دوایی کرد، دەڵێن هەندێک لە نەوەکانی تاماوەیەکی دوور و درێژ بانگبێژی شاری مەککە بوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی لە ڕێگای بانگدانەوە ئەوە فێری قورەیش بکات، خوای گەورە و موتەعال هەرکەسێکی بوێت بەرزی دەکاتەوە بە هۆکاری ئەم دینە و هەرکەسێکیشی بوێت زەلیل و سەرشۆڕی دەکات، عیزەت و سەربەرزی تەنها و تەنها بە ئیسلام دەست دەکەوێت، ئیتر قورەیش باش لەو وانەیە تێگەیشتن.



# حیکمەتی پێغەمبەر ﷺ و فەرمانڕەوایی دوای فەتحی مەککە

ماکوان: فەتحی مەککە گومانی تێدا نییە لە ڕێگای سەربازی و جەنگەوە فەتح کراوە، هەروەها جەنگی سیاسی و دەروونی تێدا بەکار هاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە جوانترین و باشترین شێوە ئەنجامی داوە، لە ڕووی سەربازییەوە هێز و سوپای زۆر بە توانای بۆ کۆکردۆتەوە، باشترین جۆری پلانی دانا بۆ ئەوەی سوپاکەی ئاشکرا نەبێت، تاگەیشتە لای قورەیش و بێئاگابوون لە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، ٢٢کم مابوو بگاتە مەککە ئینجا زانیان سوپا هاتۆتە سەریان.

پاشان جەنگێکی سیاسی زۆر بەهێزی ئەنجامدا لەگەڵ ئەبو سوفیان سەرۆکی مەککە، بەڵکو بەکاری هێنا بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان دژی بەرگری قورەیش کە هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەک ئەنجام نەدەن.

پاشان چەند جۆر جەنگی دەروونی بەکارهێنا دژیان، سەرەتا بە دەرخستنی ژمارەی موسڵمانان و کردنەوەی ئاگر، بینینی سوپاکان و نیشاندانی بە ئەبو سوفیان هۆزی جۆرا و جۆر و شکاندنی بتەکان و بانگدانی بیلال لە سەربانی کەعبەدا، شکاندنی شکۆی موشریکی قورەیش و شکستی دەروونیان و بۆ ئەوەی هەرچی ڕۆح و گیانی بەرگرییە تیایاندا بمرێنێ.

ئەم هەموو توانا و هێزەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەکاری هێنا لەم فەتحی مەککەدا هەموو ئاماژەن بۆ کۆکردنەوەی خەسڵەتی قیادی لە کەسایەتی پێغەمبەر دا ﷺ و لە هەمانکاتدا بە ئاڕاستەی وەحی واتا سەرکردە و پێغەمبەرایەتی ﷺ لە کەسایەتی محمد دا کۆببووەوە.

ئەمەش حیکمەتی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە دوای فەتحی شاری مەککە بۆمان ئاشکرابوو.



## وەفای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بنەماڵەی عەبدولدار

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بەو هێز و توانایەی پێشتر ئاماژەم پێدا نەوەستا، بەڵکو وەسیلەیەکی تری بەکارهێنا کە زۆر دەگمەنە سەرکردە و گەورەی وڵاتان ئەو شێوە هۆکارانە بگرنەبەر، ئەویش وەسیلەی ڕاکێشانی دڵی گەل و میللەتە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی شاری مەککەی فەتح کرد، دەشیزانی کێ زۆر داخ لە دڵە و حیقد و قینی هەیە، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەیویست ئەو بوغز و ئیرەییە لە دڵیاندا دەرپەڕێنێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمتیازی شەرەف و فەخری بەخشی بە ئەبو سوفیان، ئەویش گەورە و سەرۆکی هۆزی بەنو ئومەییە، دڵی ئەوی ڕازی کرد، بەو فەخر و شانازییەی وەرگرت لەلایەن پێغەمبەرەوە، بەنو ئومەییە هۆزێکی عەزیز و گەورە و بەهێزی ناو قوڕەیش بوون.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێت هۆزێکی تری قورەیش کە هیچی کەمتر نییە لە هۆزی بەنو ئومییە، ئەویش هۆزی بەنو عەبدولدارە.

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو حەوشەی کەعبە و نوێژی تێدا کرد، پاشان بانگی عوسمانی کوڕی طەڵحەی کرد، کە لە ساڵی ٨ کۆچی موسڵمان ببوو لەگەڵ خالید و عەمر لەیەک ڕۆژدا.

عوسمان لە هۆزی بەنو عەبدولدار بوو، ئەم هۆزە خاوەنی کلیلی کەعبە بوون واتا کلیلی کەعبە ئەوان هەڵیان دەگرت و لای ئەوان بوو بە درێژایی مێژووی شاری مەککەی پیرۆز.

عوسمانی بانگ کرد کە کلیلەکەیان بداتێ، هەموو خەڵک وایانزانی پێغەمبەری خوا ﷺ کلیلی کەعبە ئەداتە بەنو هاشم، بەنو هاشم خاوەنی ئاوی زەمزەم بوون و خاوەنی (حیجابە) بوون وایانزانی کە شەرەفی هەڵگرتنی کلیل دەچێتە لای ئەوان، عەلی کوڕی



ئەبو تاڵیب زۆر بە ڕاشکاوی داوای کرد لە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کە ئەو شەرەفە بداتە نەوەکانی هاشم کە خودی بنەماڵەی پێغەمبەرە.

بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دوای وەرگرتنی کلیلەکان دایەوە دەستی عوسمانی کوڕی طەڵحە واتا بەهەمان شێوە ئێوە هەڵگری کلیلی کەعبە دەبن، ئەمەش موعجیزە و حیکمەت و دڵنەرمکردنی زۆری لە دواوە بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مامۆستای ڕازیکردنی دڵەکان بوو.



# موعجیزەی کلیلی کەعبەی پیرۆز

**ماکوان: لە دوای مردنی طەلحەی باوکی عوسمان، قورەیش کلیلی کەعبەی دایەوە دەست عوسمان، عوسمان کوڕی طەڵحە یەکێک بوو لە گەورە و ناوداری قورەیش و سەرۆکی هۆزی بەنو عەبدولدار، لە جەنگی قورەیش دا هەڵگری ئاڵای شاری مەککە بوون.**

**پێش هیجرەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککە داوای کرد لە عوسمانی کوڕی طەڵحە دەیەوێت نوێژ بکات کلیلی دەرگای کەعبەی بداتێ بۆ نوێژ کردن، بەڵام عوسمان ڕەتی کردەوە کە کلیل بداتە پێغەمبەری خوا ﷺ.**

**پێغەمبەری خوا ﷺ بە عوسمانی وت؛ ڕۆژێک دادێت ئەم کلیلانە لە دەستی من دادەبێت و من سەرپشک دەبم دەیدەم بە کێ.**

**عوسمان وتی: ئەوەی باسی ئەکەی ئەگەر ڕووبدات کەواتە هەموو خەڵکی قورەیش لە ناوچوون یان قورەیش زەلیل بوون.**

**پێغەمبەر فەرمووی: نەخێر؛ بەڵکو ئاوەدان دەبێت ئەوکات دەبنە خاوەنی عیزەت.** [1]

**ڕۆژان ڕۆیشت و پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی شاری مەککەی کرد و داوای کلیلی لە عوسمان کرد و دایە دەستی بێ دوودڵی و سەرپێچی، عوسمان ئێستا ئەو یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن لە فەرمانی پێغەمبەر دەردەچێت، ئەو لەوە دڵنیابوو کە پێغەمبەر ﷺ ئەیداتە کەسێکی تر.**

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[1] ـ وَأَمَرَ ٱلرَّسُولُ مِنْ عُثْمَانْ أَنْ يَمْنَحَهُ مِفْتَاحُ ٱلْكَعْبَةِ. حَتَّى يُمْكِنَ مِنْ ٱلدُّخُولِ إِلَى ٱلْكَعْبَةِ، وَلَكِنْ بَعْدَ ذَلِكَ رَفَضَ أَنْ يَمْنَحَهُ ٱلمِفْتَاحُ. فَقَالَ لَهُ "يَا عُثْمَانْ ، لَعَلَّكَ تَرَى هَذَا ٱلمِفْتَاحِ يَوْمًا بِيَدِي أَضَعُهُ حَيْثُ شِئْتُ ). فَقُلْتُ، لَقَدْ هَلَكَتْ قُرَيْشَ وَذَلَّتْ. قَالَ: «بَلْ عَمَّرَتْ يَوْمئِذٍ وَعَزَتْ"



بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جاری دووەم دایەوە دەستی عوسمان و فەرمووی: کلیلەکانت بگرە ئەی عوسمان، ئەمڕۆ ڕۆژی وەفایە و چاکەکردنە با تا کۆتایی لاتان بێت هیچ کەس ناتوانێت لێتان وەربگرێت مەگەر زاڵم بێت، واتا ئێوەی نەوەی بەنو عەبدولدار تا ڕۆژی قیامەت هەڵگری کلیلی کەعبەدەبن.[٢]

تا ئەمڕۆش هەر لە دەستی وەچە و نەوەی بەنو عەبدولدارە لە وڵاتی سعودیە.

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ موعجیزەی پێغەمبەرایەتییەکەی بۆ عوسمان ئاشکرا کرد و پاشانیش دڵی هەموو هۆزی بەنو عەبدولداری بەلای دەوڵەتی ئیسلامی و دینی ئیسلامدا ڕاکێشا، هەموو خەڵکی هەستیان بەوە کرد کە پێغەمبەر بە هەموو کەس مەقام و ڕێزی خۆی ئەداتێ، بۆ ئەوانیش ئەو کلیلە جێگای فەخر و شانازی بوو.

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ توانی بە شێوەیەکی زۆر بەرفراوان دەست بەسەر شاری مەککەدا بگرێت و ئاسایشی خەڵک دابین بکات، پێشتر دڵی بەنو ئومەییەی ڕازی کردبوو وا ئێستا دڵی بەنو عەبدولداریشی ڕازی کرد.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢] ـ (وَفِيهِ أَنَّهُ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ يَوْمُ اَلْفَتْحِ : " يَا عُثْمَانْ اِئْتِنِي بِالْمِفْتَاحِ " ؛ فَأَتَيْتَهُ بِهِ ، فَأَخَذَهُ مَنِيٌّ ، ثُمَّ دَفْعِهِ إِلَيَّ وَقَالَ : "خُذُوهَا تَالْدَة خَالِدَةً وَلَا يَنْزِعُهَا مِنْكُمْ إِلَّا ظَالِمٌ ، يَا عُثْمَانْ اِنَّ اَللَّهُ اِسْتَأْمَنَكُمْ عَلَى بَيْتِهِ ؛ فَكَلُوا مِمَّا يَصِلُ إِلَيْكُمْ مِنْ هَذَا اَلْبَيْتِ بِالْمَعْرُوفِ).



## ڕازیکردنی هەموو خەڵکی قورەیش لە شاری مەککەدا

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکی زۆر ئەستەمی کرد کە هیچ کەس تواناى کردنی نییە، ناتوانی لە مێژوو دا هاوشێوەی بدۆزیتەوە، لە هیچ دەوڵەت و سەرکردەیەکدا نایبینیت.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەوشەی کەعبەدا دوای شکاندنی بت و نوێژکردن، بانگی کرد لە خەڵکی شاری مەککە کە هەموو لە کەعبە کۆببنەوە، هەموو بە خەفەتباری و گەردنکەچی هاتن، ترس لە دڵیان دابوو داخۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بانگیان دەکات؟ ئەوەشیان لەبەر چاو گرتبوو کە بە درێژایی چەندین ساڵ دژایەتی ئەم ئازیزەیان کردووە، وا ئێستا بە سەرکەوتوویی و بە عیزەتەوە شارەکەی فەتح کردووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە شێوەی پرسیار کردندا فەرمووی، چاوەڕوانی چین؟ یاخود چاوەڕوانی چی لە من دەکەن لەگەڵتان ئەنجام بدەم؟![٢]

پرسیارێکی زۆر سادە لە دوای ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجە و دەربەدەرییەی بەسەر من و هاوەڵانمدا هێناتان، ماوەی چەندین ساڵ وازتان لێنەهێناین، ئێستا لە ڕووی یاسا و سەربازی و جەنگەوە دەکرێت هەموو خەڵکی شاری مەککە بکاتە دیل و غەنیمەت و دەستکەوت و ئافرەتەکان بکاتە کۆیلە و کەنیزە، چونکە فەتحێکی سەربازی تەواو بووە, پێغەمبەر بە هێز چۆتە ناو شاری مەککە بە ١٠ هەزار سەرباز چواردەوری مەککەی پیرۆزی داوە پێغەمبەری خوا ﷺ دیدوبۆچوونی لەمەڕ هەموو فەتحێک ڕوون و ئاشکرابوو، حەزی بە موسڵمانبوونیان کردووە، بەهەمان شێوە حەزی بە موسڵمانبوونی شاری مەککەشە، جەنابیان بە موسڵمانبوونی یەک کەس لایان خۆشەویستر بوو لە هەرچی سەروەت و سامانی دونیایە، پێغەمبەری خوا ﷺ باش دەزانێت هێز و توانای قورەیش داڕوخاوە هەموو بتەکانیان شکێندراوە، ئێستا هیوای زۆری بە موسڵمانبوونیان هەیە، ئەزانێ وا نزیک بوونەتەوە

---

٢ ـ (إِلَى أَنْ قَالَ : يَا مَعْشَرُ قُرَيْشٍ، مَا تَرَوْنَ أَنِّي فَاعِلٌ بِكُمْ؟).



لە ئیمان، بۆیە زۆر بە لوتف و ڕێز بە دەنگێکی غەمگینەوە لە شێوەی پرسیار دەفەرمووێت: چاوەڕوانی چی لە من دەکەن ئەی خەڵکی شاری مەککە!؟

خەڵکی مەککە بە گشتی وتیان: برایەکی بەڕێز و بەخشندەی و کوڕی برایەکی بەڕێزو بەخشندەی.[٤]

ئێستا قوڕەیش لە قەیران دایە، قەیرانێکی زۆر قورس، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی هەموو ئازار و ناڕەحەتییەکانی نەکرد بە دەستیان، پاشان باسی ئەوەی نەکرد کە من ئەشرەف بنەماڵەی عەرەبم و لە نەسەبدا و لە ناو قوڕەیش دا و صادق و ئەمینم و ڕاستگۆی ناوتانم، بۆ پەیامەککەی منتان وەرنەگرت بەدرۆتان خستمەوە، ئەمانەی هیچ نەوت، زۆر بە هێمنی و بەڕێزەوە پێی فەرموون:

هەر وەکو چۆن یوسف بە براکانی وت ئەمڕۆ کاری تۆڵەسەندنەوەتان لەگەڵ ناکەم، بەڵکو داوا دەکەم خوای گەورە لێتان خۆش بێت، چونکە خوای گەورە بە بەزەیی و ڕەحمەتە، پاشان فەرمووی بڕۆن هەمووتان ئازادن، لە کەعبە و مەککە دەنگی پێغەمبەری خوای ئەدایەوە، بڕۆن هەمووتان ئازادن، ئازادن، ئازادن. أذهبوا فأنتم الطلقاء.

﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ٩٢﴾ [يوسف]

واتە: یوسف وتی: خەمتان نەبێت ئەمڕۆ ئیتر هیچ سەر زەنشتێکتان لەسەر نی یە، خوا لێتان خۆش بێت، بێگومان ئەو زاتە لە هەموو میهرەبانان میهرەبانترە.

هەموویانی ئازاد کرد و بەبێ هیچ پارە و فیدیەیەک، ئەیتوانی هەموو شتێک بکات بە دیل بیانگرێت و بە پارە ئازادیان بکات، دەوڵەتی ئیسلامی سەرەتای بوو پێویستی بە پارە و ئابووری بوو، بەڵام ئازادی کردن، بە هیوای موسوڵمانبوونیان تاوەکو خوای گەورە بیانکاتە هەوێنی ئەم دینە، پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمانبوونیانی لە پارە و سەروەت و سامان پێ باشترە و چاکترە.

---

٤ ـ (قَالُوا : خَيْرًا ، أَخٌ كَرِيمٌ ، وَابْنُ أَخٍ كَرِيمٍ).



لە دوای ئەو ئازادکردنە گەورەیە، هەموو خەڵکی شاری مەککە لەسەر کێوی صەفا کۆبوونەوە.



## موسڵمانبوونی خەڵکی مەککە لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ

ماکوان: لە دوای ئازادکردنی شاری مەککە، ئەوەشی دەترسا هاتە دەرەوە و چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر کێوی صەفا دا، یەک بە یەک بەیعەتی موسڵمانبوونی خۆیان بە خۆشەویستی و ئازایەتی و بەخشندەی ئەو پێغەمبەرە ڕاگەیاند.

ئەوەش ئەوپەڕی بیرکردنەوە و ئومێدی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو:

﴿لَعَلَّكَ بَـٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ۝٣﴾ [الشعراء]

واتە: ئەی پێغەمبەر صلی الله عەلیە وسلم خەریکیت لە داخ و خەفەتدا خۆت دەفەوتێنیت کاتێک دەبینیت خوانەناسان باوەڕناهێنن.

پێغەمبەری خوا ﷺ خەمبار دەبوو لەوەی کە کەسێک موسڵمان نابێت، داخۆ ئێستا ئەو پێغەمبەرە چەندە دڵخۆش بێت کە گەڵێک بە گشتی موسڵمان دەبن و بەیعەتی ئیسلامەتی ئەدەنە پێغەمبەری خوا، بەڕاستی ئەوە سەرکەوتن و فەتحە.

هەربۆیە خوای گەورە باسی ئەو حاڵەتەمان بۆ دەکات و بە سرووش و وەحی لە شێوەی فیلمێکی سینەمایی هەموو دەخاتە بەرچاومان لە قورئانی پیرۆز لە سورەتی النصر دا دەفەرمووێت:

﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١﴾

کاتێ یارمەتی و کۆمەکی خوا دێت، شاری مەککە ڕزگار دەکرێت و دەرگای ئازادی واڵا دەکرێت.

﴿وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢﴾

خەڵکیشت بینی پۆل پۆل دەچنە ڕیزی ئایینی خواوە.



﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا ٣﴾

ئەوسا ئیتر تۆ سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە و داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، چونکە بەڕاستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات و تۆبە وەرگرە (.. ئومێدە لە ئاییندەیەکی نزیکدا، خوای باڵادەست سەرکەوتنێک ببەخشێت، ئەو کاتە ئیمانداران هەست دەکەن ئەم سورەتە تازە دابەزیوە).

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ٢١ساڵ بەر لە ئێستا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە هەمان شوێن وەستاوە، بانگەوازی خەڵکی شاری مەککەی کرد لە وێدا هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە، فەرمووی:

سوێند بە خوا هەموو دەمرن چۆن دەخەون، زیندوو دەکرێنەوە هەروەک چۆن لە خەو هەڵدەستن، لەسەر کردەوەکانتان لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکرێت، یان بۆ بەهەشتی هەمیشەیی، یاخود بۆ ئاگری هەمیشەیی.[٥]

ئەوکاتە هیچ کەس بڕوای پێ نەهێنا، ماوەیەکی زۆر کاری کرد تا چەند کەسێک موسڵمان بوون کە بەدرێژایی ٥ ساڵ ٦ کەس موسڵمان بوون لە ماوەی ١٣ ساڵ دا ١٦٠ بۆ ١٧٠ کەس موسڵمان بوون، دوای کارکردن و ماندوبوون وا گەلی مەککە هەموو موسڵمان بوون لەیەک ڕۆژدا.

بەڕاستی ئەمە سەرکەوتنە، عیزەتە سەربەرزییە، سەروەری و سەرکەوتنی ئیسلامییە، کەس گومانی لە پێغەمبەرایەتی نەما، هەموو زانیان ئەو کاتەی دەیفەرموو تەنها بڵێن (لا اله الا الله) ڕزگارتان دەبێت، عەرەب و عەجەم دەخەنە ژێر دەسەڵاتتان، ئەوەتا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم عەرەب و عەجەم و ڕۆمی خستە ژێر دەسەڵاتی و ژیار و شارستانییەتی دروست کرد، ئەوەی بەڕاستی گرتی سەربەرز بوو، ئەوەی وازی لێ هێنا لە جەهەننەم دا بۆ هەتا هەتایە مایەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٥ ـ (وَاللَّهُ لِتَمُوتِنَ كَمَا تَنَامُونَ ولَتَبَعْثِنْ كَمَا تَسْتَيْقِظُونَ ولَتَحَاسَبَنْ بِمَا تَعْمَلُونَ وَلِتجزُونْ بِالْإِحْسَانِ إِحْسَانًا وَبِالسُّوءِ سُوءًا وَإِنَّهَا لَجْنَةٌ أَبَدًا أَوْ النَارِ أَبَدًا).



# موسڵمانبوونی سوهەیلی کوڕی عەمر

ماکوان: هەندێک لە خەڵکی شاری مەککە لە دەرەوەی شاردا بوون، هەندێک لە سەرکردە و گەورەکانی قورەیش تائێستا ترسی زۆریان لە دڵ دابوو، لەبەر گەندەڵی و کاری خراپەیان دەرحەق بە موسڵمانان. یەشتا موسڵمان نەبوبوون، هەندێکیان ڕایان کرد بۆ دەرەوەی شاری مەککە و هەندێک هەر لە ماڵەکەی خۆیان ماونەتەوە، هەندێک داوای داڵدەیان دەکرد، ئەوانەی ڕایان کرد هەموو مێژوویان ڕەشە لە بەرامبەر پێغەمبەر دا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

یەکێک لەو ڕاکردووانە خۆی شاردۆتەوە (سوهەیلی کوڕی عەمری هۆزی بەنو عامری کوڕی لوئەیە) یەکێکە لە گەورەی هۆزی قورەیش، هەروەها لە تەمەندا گەورەیە و بەساڵ دا چووە.

زۆرێک لە کەس و کارەکەی پێشتر موسڵمان بوون، پاشان هەموو منداڵەکانی موسڵمان بوون زۆربەیان لە سوپا و کاربەدەستانی وڵاتی ئیسلامیدا بوون، کاتێک سوپای ئیسلام هاتە ناو شاری مەککە سوهەیل هیچ شتێکی نەبوو کە خۆی پێ بپارێزێت، لەبەردەم سوپاکە دا هەڵهات و چووە ماڵەکەی خۆی دەرگای لەسەر خۆی داخست.

خۆی دەڵێت:

دەرگام لەسەر خۆ داخست و چوومە ماڵەکەم تا پارێزراو بم.

عەبدوڵڵای کوڕی سوهەیل یەکێک بوو لە سەربازەکانی سوپای فەتحی مەککە، داوای لێ کردم کە بڕۆم داڵدەدان لە پێغەمبەر وەربگرم.

منیش نەموێرا و بڕوام نەکرد داڵدە وەربگرم، گومانی ئەوەم هەبوو کە دەکوژرێم

چونکە دەیزانی چەندە کاری خراپی کردووە، خۆی باسی مێژووی خۆی دەکات و دەڵێت:



من بووم لەگەڵ پێغەمبەر دا پەیمانی حودەیبییەم مۆر کرد و ڕێکەوتین، وا ئێستا ئەو پەیماننامەیە شکێندراوە، منیش نوێنەری قوڕەیش بووم، دانوستانم لەگەڵ پێغەمبەر دا کرد ﷺ، هەروا بە ئاسانی وازم لێ ناهێنن و دەمکوژن.

پاشان بەشدار بووە لە جەنگی بەدر و ئوحود و خەندەقدا دژی موسڵمانان، بۆیە هەموو ئەمانەی بۆ عەبدوڵلا باسکرد، عەبدوڵلای کوڕی چووە خزمەت پێغەمبەر و داوای داڵدەدانی باوکی کرد و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ببەخشە و با پارێزراو بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵی ئەو پارێزراوە و داڵدەدراوە، با خۆی دەربخات و چیتر خۆی نەشارێتەوە.[٦]

ئەمە حاڵ و گوزەرانی سەرکردەکانی قوڕەیش بوو، لەوپەڕی زەلیلی و سەرشۆڕی دابوون و بە پێچەوانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە چ عیزەتێک و سەربەرزییەک دایە، پێغەمبەر چۆن مامەڵە دەکات، ئاخر لەکام دەوڵەتی شکست خواردودا سەرکردە و وەزیر و کاربەدەستی ئاوا مامەڵەیان لەگەڵ دا کراوە، یان دەکوژرێن یاخود زیندانی دەکرێن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەمانیان ئەداتێ، بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو هاوەڵانی ڕاسپارد کە سوهەیلیان بینی ڕێز و ئیحترامی بگرن و بە چاوی سووک و کەم تەماشای نەکەن، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی خاوەن ڕێز و ئیحترام بوو.[٧]

داوای کرد کەس قسەی ناشرین و بە چاوی سووکەوە تەماشای نەکات کە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، هەروەها فەرمووی: بە درێژی تەمەنی سوهەیل پیاوێکی ئاقڵ و خاوەن گەورەیی و شەرەف بووە، نموونەی سوهەیل نابێت لە ئیسلام دوور بێت و فەرامۆش

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦] ـ ( فَذَهَبَ عَبْدُ اَللَّهْ بْنْ سُهَيْلْ إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ فَقَالَ : يَا رَسُولُ اَللَّهِ ، أَبِي تُؤَمِّنُهُ ! قَالَ : نَعَمْ ، هُوَ آمِنٌ بِأَمَانِ اَللَّهِ ، فَلْيُظْهِرُ).

[٧] ـ (مِنْ لَقِيَ سُهَيْلْ بْنْ عَمْرُو فَلَا يَشُدُّ اَلنَّظَرُ إِلَيْهِ ).



بکرێت، لە پێشتر دا ئەوەی کردی سوودی نەبوو، هیچ سوودێکی وەرنەگرت لە کارەکانی ڕابردووی. [٨]

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست بگەڕێتەوە بۆلای خوای خۆی و هیچ کەس لە ئاستیدا هیچ نەڵێت چونکە خاوەن ئەقڵ و شەرەفە، ئەم وەسف و پێناسەیە زیاتر ئەوەی بەرز کردەوە کە پێشتر سوهەیل دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوو، بەڵام پێغەمبەر بەو پەڕی ڕەحمەت و بەزەیی مامەڵە دەکات، دەیەوێت دڵی ڕازی بکات، عەبدوڵلای کوڕی ڕۆیشت و هەواڵی دایە کە پێغەمبەر ﷺ چی فەرمووە دەربارەی.

خێرا وتی: سوێند بە خوا بە مناڵی و گەورەیی ئەو پێغەمبەرە چاکە خواز بووە. [١٠]

سوهەیل بەرەو لای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و لەسەر دەستی موسڵمان بوو، لە دوای ئەوەی کە موسڵمان بوو، کەسێکی خوا ناس و نوێژکەر و ڕۆژووگرێکی زۆر بوو، سەروەت و سامانی زۆری بەخشی لە پێناوی خودا، پاشان لەو تەمەنەی دابوو بوو بە موجاهید و بوو بە ئەمیری بەشێک لە سوپای موسڵمانان لە جەنگی یەرموک دا، تەنها بە مامەڵەی جوانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سوهەیل دا توانی دڵی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، هۆزی بەنو عامری ڕازی کرد.

لای هەموویان ئاشکرایە کە سوهەیل گەورەی هۆزی بەنو عامر بوو، ئەو هۆزە هەموو موسڵمان بوون، ئینتیمای تەواوەتیان بۆ دەوڵەتی ئیسلامی هەبوو، هەر بە هۆکاری بەخشندەیی و دڵنەرمی و مامەڵەی باشی پێغەمبەری خوا ﷺ.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٨ ـ ( لَا يَشُدُّ أَحَدُكُمْ ٱلنَّظَرَ إِلَيْهِ ، فَلْيَخْرُجْ ، فَلِعُمْرِي إِنَّ سُهَيْلاً لَهُ عَقْلٌ وَشَرَفٌ ، وَمَا مَثَلَ سُهَيْلٌ جَهْلَ ٱلْإِسْلَامِ ، وَلَقَدْ رَأَى مَا كَانَ يُوضَعُ فِيهِ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لَهُ بِنَاءٌ.

١٠ـ (قَالَ: كَانَ وَٱللَّهِ بَارًا صَغِيراً وَبَاراً كَبِيراً).



# موسڵمانبوونی صەفوانی کوڕی ئومەییە

ماکوان: صەفوانی کوڕی ئومەییە، یەکێک بوو لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی ئیسلام، باوکی (ئومەییەی کوڕی خەڵەف) درێغی نەکرد لە کاری دوژمنکارانە دژی موسڵمانان، لە جەنگی بەدردا کوژرا، صەفوان لە باوکییەوە وەکو میرات و بۆماوەیی دژایەتی ئیسلامی دەکرد، جەنگی دژی پێغەمبەری خوا کرد بە هەموو هێز و توانای، لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید لە جەنگی ئوحود دا هەردووکیان لە پشتەوە هێرشیان کردە سەر موسڵمانان، بەشداربوو لە شەهید کردنی ٧٠ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەها بەشدار بوو لە جەنگی ئەحزاب، بەشدار بوو لەو مەفرەزەیەی کە پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ ویستیان پێغەمبەر ﷺ بکوژن، هەروەها عومەیری کوڕی وەهەبی نارد بۆ شاری مەدینە بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، عومەیر کە هات پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکرای کرد بە وەحی و موسڵمان بوو، پاشان ڕۆژان ڕۆیشت و فەتحی مەککە کرا، بەشدار بوو لە جەنگێک لە دژی موسڵمانان لە کاتی فەتحی مەککەدا پاشان ڕایکرد و هیچی پێنەکرا.

صەفوان لە دوای هەموو شکستەکانی بڕیاری خۆکوشتنی دا، کە خۆی بخاتە ناو دەریای سوور، بەرەو دەریای سوور ڕۆیشت بۆ خۆکوشتن، تەنها خزمەتکارێکی خۆی لەگەڵدابوو بە ناوی (یەسار)، یەسار دەڵێت؛ لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا هیچ جێگایەک نەیگرتەخۆ، بۆیە بڕیاری خۆکوژیدا، گەیشتە سەر کەناری دەریای سوور لەوێدا کۆمەڵێک پیاوی بینی، دوای کەوتبوون، یەکێک لەو پیاوانە نزیک بوویەوە، وایزانی بۆ کوشتنی هاتوون، بۆیە بە یەساری وت: ئەمانە چیان دەوێت لێمان؟

یەسار وتی: ئەوە عومەیری کوڕی وەهەبە.

پێشتر هەردووکیان هاوڕێ بوون، ئەوکاتەی ناردی بۆ کوشتنی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە، ئیتر عومەیر موسڵمان ببوو، وتی عومەیر چی دەوێت لە من، وایزانی هاتووە بۆ کوشتنی و پێغەمبەر ناردوویەتی بۆیە بە یەساری خزمەتکاری وت: سوێند بە خوا بۆ کوشتنم هاتووە، ئینجا کە عومەیر نزیک بوویەوە، صەفوان پێی وت: ئەرێ بەس نییە ئەوەی کە پێت



کردم، منت نارد بۆ کوشتنی محمد، هەموو قەرزەکانم بۆ دایەوە و منداڵەکانتم گرتە خۆم، ئێستا هاتوویت بۆ کوشتنم؟!

عومەیر کوڕی وەهەب بەو پەڕی سۆزەوە وتی: ئەی باوکی وەهەب مەبەستی صەفوان بوو، قوربانت بم بە فیدات بم، لای باشترین کەس و چاکەخوازترین کەسەوە هاتووم کە باشترینە بۆ خزمایەتی و کەسایەتی، ئەمانی داویت تۆ پارێزراویت.

کاتێک عومەیری کوڕی وەهەب هاتە ناو شاری مەککە ویستی سەردانی صەفوان بکات چونکە هاوڕێی دێرینی یەکتر بوون بە هیوای بانگەوازی بۆ ئیسلام، کە زانی عومەیر ڕۆشتوە بۆ خۆکوشتن بە پەلە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای داڵدەدانی صەفوانی کرد، وتی گەورە و سەرۆکی هۆزەکەم ڕۆشتوە خۆی بکوژێت و خۆی بخاتە ناو دەریا لە ترسی داڵدەنەدانی، جا دایک و باوکم بە قوربانت بێت داڵدەی بدە؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوا داڵدەم دا و پارێزراوە.

جا بگەڕێینەوە پێغەمبەری خوا ﷺ داڵدەی داویت.

صەفوان زۆر ترسا و باوەڕی نەکرد، وتی سوێند بە خوا ناگەڕێمەوە، تا نیشانەیەکم بۆ نەهێنی لەلایەن محمدەوە بۆ ئەوەی دڵنیابم.

بەپەلە عومەیر لە ناوچەی کەناری دەریای سوورەوە گەڕایەوە، کە نزیکەی ۸۰ کم دوورە لە شاری مەککەی پیرۆز، ئەو هەموو ڕێگا و ماندوبوونەی بڕی بۆ خاتری موسڵمانبوونی هاوڕێکەی، پاشان گەڕایەوە بۆلای ئەو هەموو ڕێگایەی بڕی، کە چووە خزمەت پێغەمبەر وتی: یارەسوڵەڵلا صەفوان دەیویست خۆی بکوژێت منیش هەواڵی داڵدەی جەنابتم پێ ڕاگەیاند، ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی تا لەلایەن پێغەمبەرەوە نیشانەیەکم بۆ نەهێنیت ناگەڕێمەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بگرە ئەو عەمامەی منی بۆ بەرە، پێغەمبەری خوا ﷺ عەمامەککەی خۆی بۆ نارد (خذ عمامتي إليه).

ئەم پێغەمبەرە چ نیعمەتێکە چ عەزەمەتێکە خوای گەورە بۆی ناردووین، ئایا لە مێژووی هەموو مرۆڤایەتیدا وێنەی ئەخلاق و ئاکاری ئەم کەسە دەست دەکەوێت؟ نا سوێند بەخوا



وێنەی نییە! هەرچی دەکات هەوڵ ئەدات خەڵکی موسڵمان بێت و دووربێت لە ئاگری دۆزەخ، ئەوە هەموو ئومێدی ئەو پێغەمبەرە بووە.

| | |
|---|---|
| محمد أشرف الأعراب والعجم | محمد خير من يمشي عەلى قدمِ |
| محمد باسط المعروف جامعةُ | محمد صاحب الإحسان والكرمِ |

عومەیر گەڕایەوە بۆ لای صەفوان کە گەیشتە لای و عەمامەککەی بینی، عومەیر وتی؛ ئەی باوکی وەهەب سوێند بەخوا، لای کەسێکی وەها هاتووم چاکە خوازترین مرۆڤە، خزمایەتی دەزانێت، باشترینە لە ناو خەڵکدا، بیر ڕووناک و حەکیمی خەڵکییە، سەربەرزی سەربەرزی تۆیە، عیزەتی عیزەتی تۆیە، موڵکەکەی موڵکی تۆیە، کوڕی یەک دایک و باوکن ناوی خوای لێبێنە و با بگەڕێینەوە.

صەفوان وتی: ئەترسم بمکوژن، زۆر ئەترسا.

عومەیر وتی: بانگی کردیت بڕۆیتە ناو ئیسلام، دوو مانگ کاتی پێداویت بۆ بیرکردنەوە.

ئەوەش ڕێز و کەرەمی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آله وسلم، ئەگەر ئێستا ڕاستەوخۆ موسڵمان بوویت ئەوا تەواو هیچ کێشەت نییە هەروەکو هەموو موسڵمانێک ماف و ئەرکت پارێزراوە و خۆ ئەگەر کاتیشت دەوێت دوو مانگ لە ئەمان دایت و پارێزراویت بە ئارەزووی خۆت بیربکەرەوە.

صەفوان دەستبەجێ لەگەڵ عومەیردا گەڕایەوە، چوونە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە ناو حەرەمدا بوو کاتی نوێژی عەسر بوو نوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، هەردووکیان چاوەڕوان بوون تا پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم نوێژەکەی تەواو کرد، لەو کاتەدا صەفوان چەند پرسیارێکی لە عومەیر کرد وتی: چەند نوێژ دەکەن لە ڕۆژێکدا؟!

عومەیر: ٥ نوێژ.

صەفوان: محمد نوێژیان پێ دەکات، واتا لەگەڵ پێغەمبەر دەیکەن؟!

عومەیر: بەڵێ.



کە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە نوێژ تەواو بوو صەفوان بە دەنگی بەرز هاواری کرد لە دوورەوە ئەی محمد، بۆ ئەوەی هەلی ڕاکردنی هەبێت، ئەی محمد عومەیری کوڕی وەهەب، بە عەمامەککەتەوە هاتووە، وای بۆ باسکردووم کە من بێمە لات و دوو مانگ مۆڵەتم هەیە بۆ بیرکردنەوە؟!

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: دەوەرە بۆ لام ئەی باوکی وەهەب (صەفوان).

صەفوان وتی: بەخوا نایەم هەتا بۆم ڕوون نەکەیتەوە، (ئەوەندە دەترسا).

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: با دوو مانگی زیادە بڕواتە سەر تا چوار مانگ کات و مۆڵەتت هەیە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مۆڵەتی دا بە صەفوان ٤ مانگ بۆ بیرکردنەوە، بەڵام ئەو کاتەی نەخایاند و بە مۆڵەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ سەرسام بوو، پاشان صەفوان موسڵمان بوو.



# موسڵمانبونی عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل

ماکوان: عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل سەرسەخترین دوژمنەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان و خودی ئیسلام بوو، لەگەڵ باوکیدا کە ناسراوە بە فیرعەونی ئومەتی پێغەمبەر ﷺ, دوژمنایەتییان وەکو ئاو خواردبووەوە ئەوەندە دژی پێغەمبەر ﷺ بوون، لە دوای کوشتنی باوکی زیاتر دوژمنایەتییەکەی خەست کردەوە، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی دەست بگرێت بە قەراخی کەعبەوە بیکوژن، لە وانەبوو کە لە فەتحی مەککە دا جەنگی دژی موسڵمانان کرد و خالید ڕاوەدووی نان.

لە دوای ئەو شکستە هەڵهات و لە شاری مەککە ڕایکرد، هەوڵی دا بگاتە شاری یەمەن، گەیشتە سەر کەناری دەریا بۆ ئەوەی زووتر بگاتە یەمەن نزیکی کەشتییەک بوویەوە، بە تەواوی بڕیاری دەرچوونی دا بۆ وڵاتی یەمەن ڕێگایەکی زۆری بەکارهێنا بۆ دوژمنایەتی موسڵمانان کۆتاییەکەی و ئەنجامەککەی ڕاکردن بوو، داوا کراوە لە دەوڵەتی ئیسلامی بە لە گەردەندانی و کوشتنی، پێغەمبەر ﷺ لەهەر جێگایەکدا بیگرێت دەیکوژێت.

خێزانی عیکریمە کچی مامی خۆی بوو، ناوی ئوم حەکیمی کچی حارث کوڕی هیشام بوو، خێزانی وەکو خەڵکی مەککە لە کێوی صەفادا بەیعەتی ئیسلام بوونی دایە پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ تا داوای لێخۆشبوون بۆ هاوسەرەکەی بکات، بگەڕێتەوە بۆشاری مەککە و موسڵمان بێت، چۆن بۆ صەفوانی کوڕی ئومەییەی ئاسان کرد ئاواش بۆ عیکریمە ئاسان بکات، ئوم حەکیم وتی؛ ئەی پێغەمبەر ﷺ عیکریمە لە ترسی تۆ ڕایکردووە بۆ یەمەن لەوە دەترسێت بکوژرێت، داڵدەی بدە و با پارێزراو بێت؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەئاسانی و سادەیی فەرمووی: ئەوە پارێزراوە و داڵدە دراوە (هو آمن).



ئیتر پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو تازە قسەم کردووە و نابێت و باسی خراپە و خوێنڕێژی نەکردووە، هەموو مێژووی دوورو درێژی عیکرمەی لە بیر کرد، بۆ ڕازیکردنی دڵی ئافرەتێکی ئیماندار.

خێزانی عیکرمە کەوتە ڕێ بۆ ئەوەی بگات بە عیکرمە، خوای گەورە کاری ئەو ئافرەتەی ئاسان کرد، خاوەنی کەشتییەکە سەری نەخستبوو چونکە کافر بوو، خاوەنی کەشتییەکە موسڵمان بوو، کە ویستبووی سەربکەوێت، خاوەن کەشتییەکە وتی: تۆ موسڵمانی؟ یان خۆت بناسێنە کام ئایینی، خاوەنی کەشتییەکە لە موسڵمان زیاتر سەرناخات.

بۆیە بە عیکرمەی وت خۆی ئازادکە!

عیکرمە: بەچی خۆم ئازاد بکەم؟!

خاوەنی کەشتی؛ بڵێ (لا إله إلا الله)

عیکرمە: جا خۆ من لە تاو ئەو ڕستەیە ڕامکردووە!

بە هۆکاری ئەم وتانەی لەگەڵ خاوەن کەشتییەکە دوا کەوت، خێزانی توانی بگاتە لای و پێی وت: ئامۆزا لە لای باشترین کەس و چاکترین خەڵکەوە هاتووم بۆ لات لە سیلەی ڕەحم و خزمایەتی دەزانێت، خۆت مەخە نارەحەتی و ناهەمواری لای پێغەمبەر ﷺ داڵدەم بۆ وەرگرتووی و پارێزراویت.

عیکرمە: بەسەرسوڕمانییەوە تۆ ئەو کارەت بۆ کردووم؟!

خێزانی وتی: بەڵێ.

تا ئەو ساتە وەختە عیکرمە دونیای لێ هاتبووە یەک و نەیدەزانی چی بکات، ئەیویست بڕوات بۆ یەمەن، خەڵکی یەمەن و ئەو وڵاتە گشتی موسڵمان بوبوون.

ئێستا هەموو خەڵکی یان دەبن بە هاوپەیمانی محمد یان دەچنە ناو دینەکەی.



هەر بۆیە عیکریمە هەموو ئەمانەی دەزانی بێ بیرکردنەوە بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ شاری مەککە و موسڵمان بێت.

عیکریمە گەڕایەوە و چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لە خزمەتی دا دانیشت و وتی: ئەی محمد خێزانم هەواڵی داومەتێ کە من پارێزراوم و داڵدە دراوم؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خێزانت ڕاستی کردووە تۆ پارێزراویت.

عیکریمە کە زانی پارێزراوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی خێزانی گرتووە، ڕاستەوخۆ وتی: داوای چی دەکەیت؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شایەتومان بهێنە و نوێژ بکە و زەکات بدە.

شایەتومان بە واتای (أشهد أن لا اله الا الله و ان محمدا رسول الله).

پاشان پرسیاری زۆری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ هەموو پرسیارەکانی وەڵام دایەوە لەسەر ئیسلام و کردەوەی چاک و باش.

عیکریمە وتی: ئەوەی داوات کردووە هەمووی حەق و ڕاستە ئەوە لە باشترین و جوانترین فەرمانە.

خوای پەروەردگار ڕێگای هیدایەتی بۆ ئاسان کرد و لەو کاتەدا هەستی تەواوی جوڵا و دڵی کرایەوە بۆ وەرگرتنی ڕاستی، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ داوای کردووە لە قۆناغێ مەککەدا و لە دوای هیجرەتی هەمووی ڕاست و دروست بووە.

عیکریمە وتی: سوێند بەخوا ئەوەی ئێستا داوام لێدەکەیت، پێشتریش ئەو داوایەت کردووە، سوێند بەخوا تۆ ڕاستگۆترین کەس و قسەکەری ناومان بوویت، چاکەخوازی ناومان بوویت، ڕاستە وخۆ دوای ئەو وتەیە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لا اله الاَّ الله وَأَشْهَد أَنَّ مُحَمدا عَبْدُالله وَرَسُوله).

لەو کاتەوە لە سەربازگەی کوفرەوە هات بۆ سەربازگەی ئیمان، بە هۆکاری جوان ڕەفتار و باش گوفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ، باشترین جۆر مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو



لاکاندا، ئەمەش هەموو هۆکاری ئەوەبوو خێزانی موسڵمان بوو، خۆشەویست بۆ هاوسەرەکەی گەڕاندییەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

هەر لەدوای شایەتومان عیکریمە وتی: فێری باشترین خێر و چاکەم بکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێ شاهیدی ئەدەم خوای پەروەردگار تاک و تەنهایە و شایەتی ئەدەم کە من موسڵمانم و موهاجیرم و موجاهیدم.[10]

لە دوای وتنی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر ﷺ فێری کرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ زانی کە ئەو موسڵمانە و هەرچی کرد بۆ ئەوەی دڵی زیاتر ڕابکێشێت بۆ ئایینی خوا و فەرمووی؛ عیکریمە داوام لێبکە، ئەوەی نەمبەخشیوە بە خەڵکی ئەی بەخشم بەتۆ.[11]

ئەم بەخشینەی پێغەمبەر ﷺ زۆر گەورە بوو، ئەوەی ئەمڕۆ نەم بەخشیوە بەکەس ئەیدەم بە عیکریمە، زۆر ئاسان بوو داوای پارە بکات، یان داوای ئیمارەت و کورسی شاری مەککە بکات یان هەر داوایەکی دنیایی بێت، کوڕی ئەبوجەهلە و باوکی سەرۆک هۆزی مەخزومە، خۆی لە جێگای باوکییەتی، خەڵکی شوێنی دەکەون بەڵام عیکریمە داوای هیچی دنیایی نەکرد.

بەڵکو ئەوەی داوای کرد زۆر سەیر بوو، لە کاتێکدا هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەدەکرا داوای کرد پێغەمبەر داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات لای خوای پەروەردگار.

عیکریمە وتی: داوات لێدەکەم دوعای لێخۆشبوونم بۆ بکەیت، لە هەرچی کاری دوژمنکارانە بوو کە دژتان وەستاومەتەوە، یان هەر ڕێگایەک کە لە دژی ئێوە بووە یان لە هەر جێگایەک کە ڕووبەڕووی جەنابت بوومەتەوە، یان هەر قسەیەک و وتەیەک دەرحەق بە جەنابتم کردووە، جا ئاگات لێ بووبێت یان لە پاشەملە کردبێتم ئاگات لێ نەبووبێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[10] ـ (قُلْ أَشْهَدُ أَنْ لا الهَ الاّ اللّه وَأَشْهَدُ إِنِّي مُسْلِم وَمُهَاجِر وَمُجَاهِد).

[11] ـ (لا تَسْأَلَنِي اليَوْم شَيْئا أعْطِيهِ أحَدا إلاَّ أعْطِيتُه لك).



پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار لە عیکریمە خۆشبە و لە هەموو کارێکی دوژمنکارانەی کە دژی ئێمە ئەنجامی داوە، یان هەر ڕێگایەک کە بۆ دژایەتیمان گرتوێتییە بەر ڕێگای خراپەکاری بوو بۆی بکە بە نوور و ڕۆشنایی، هەرچی بەرامبەر بەمن کردوێتی لە پەنهانی و ئاگاداریم خوایە لێیخۆشبە.[١٢]

ئینجا عیکریمە وتی: ڕازیت کردم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەموو ڕاستگۆ و ئازا و چاونەترس بوون، بە دوای ژیان و سەروەت و سامانەوە نەبوون، هەر وەکو هاوەڵان و حەواری پێغەمبەرانی تر، بۆ نموونە هاوەڵانی موسا داوای بینینی خوا و گۆشتی برژاویان دەکرد، داوای سیر و پیاز و پاقلە و خەیاریان دەکرد، دەیانووت تۆ و خواکەت بڕۆن بۆ جەنگ ئێمە لێرەدا دادەنیشین! هاوەڵانی موسا بەو شێوەیە بوون.

هاوەڵانی عیسا داوای لێخۆش بوونیان نەکرد داوای سفرە و خواردن و خواردنەوەیان لە خوای پەروەردگار دەکرد!

بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە سکی برسی و ڕووت و ڕەجاڵی و لە مەیدانی موسڵمان بوونیان، بە دوای لێخۆشبوونەوە بوون، بۆیە خوای گەورە بە خەیرە ئوممەت ناویان دەبات.

عیکریمە ڕاستگۆ بوو لەگەڵ ئیمانەکەی، لە پاش موسڵمانبوونی هەمیشە خزمەتی موسڵمانانی دەکرد، پارە و سەروەت و سامانی دەبەخشی بۆ دینی خوای پەروەردگار، خۆی دەڵێت: چەندم لە پێناوی ڕێگری لە دینی خوا بەخشی، ئەوەندەم لە پێناو خواوە بەخشیوە، چەندە لە دژی موسڵمانان و لە دژی ئایینی ئیسلام جەنگاوم، ئەوەندەش دژی خوانەناس و ڕۆم وەستاوم و جیهادم کرد.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٢] ـ (فقال رسول (صلى الله عليه وسلم): اللّهم اغفر له كل عداوة عادانيها، وكل مسيراً سار فيه الى موضع يريد في هذا المسير اطفاء نورك, فاغفر له مانال مني من عرض في وجهها أو وأنا غائب عنه).



هەموو ژیانی لە دوای موسوڵمانبوونی لە جیهاد دا بەخشی، بەشدار بوو لە دژی جەنگی مورتەدەکان و هەڵگەڕاوەکان، بەشدار بوو لە فەتحی شام دا، هەتاوەکو لە جەنگی یەرمووک دا شەهید بوو ڕەزامەندی خوای لێبێت.

تەنانەت پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەوەندە ڕێزی گرت کە داوای لە خەڵکی کرد لەبەرچاوی عیکریمە دا قسە بە باوکی نەڵێن، چونکە ئەوەی مردووە قسەی پێبڵێن زیندووەکان ئازار ئەدات.

بۆیە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت: ئەگەر خوای گەورە هیدایەتی کەسێک بدات، خێر و پاداشتەکەی لەهەرچی خۆشی و سەروەت و سامانی دنیا و نیعمەتەکانی باشترە، خێر و پاداشتەکەی ئەوەندە زۆر لە بە پانتایی تیشکی خۆر ئاماژەی بۆ کراوە.[١٣]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٣] ـ (وَاللَّهُ لِأَنْ يَهْدِي اَللَّهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِدًا خَيْرَ لَكَ مِنْ حُمْرِ اَلنَّعَمِ.. وَخَيْرُ لَكَ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ اَلشَّمْسُ). مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ



# موسڵمانبوونی فوضالەی كوڕی عومەیر

ماكوان: فوضالە یەكێك بوو لە دوژمنە هەرە خراپەكانی ڕەسولوڵڵا، بڕیاریدا كە پێغەمبەر بكوژێت و ئەگەر خۆشی لەناو بچێت، واتا كردەوەیەكی خۆكوژی ئەنجام بدات، لەگەڵ كەس قسەی نەكرد و چووە ماڵی خۆی و شمشێری تیژ كرد، ماوەی چەند ڕۆژێكی پێچوو لە ماڵ هاتە دەرەوە چووە ناو كەعبە و شمشێرەكەی لە ژێر جلەكانییەوە شاردبووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەوشەی كەعبەدا طەوافی دەكرد، فوضالەی كوڕی عومەیر لێی نزیك بوویەوە و شمشێری دەرهێنا بیكوژێت.

فوضالە پێشتر خۆی نیشان دابوو كە موسڵمان بووە، لە كاتی دەرهێنانی شمشێرەكەیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە تۆی ئەی فوضالە؟!

فوضالە: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ: لەگەڵ خۆتدا باسی چیت دەكرد فوضالە؟!

فوضالە: هیچم نەدەوت: تەنها زیكری خوام دەكرد.

پێغەمبەر ﷺ دەستی كرد بە پێكەنین و لێی نزیك بوویەوە و دەستی خستە سەر دڵی یاخود سینەی و فەرمووی: داوای لێخۆشبوون بكە لە خوا فوضالە!

فوضالە دەڵێت: سوێند بە خوا دەستی لەسەر سینەم لانەبردبوو دڵم پڕ بوو لە ئیمان و خۆشەویستی پێغەمبەر، پێشتر ئەوەی ڕقم لێی بوو محمد بوو، بەڵام لە دوای ئەوەی دەستی خستە سەر سینەم خۆشەویسترین كەس لەلام پێغەمبەر بوو ﷺ.

فوضالە كەسێكی دەوڵەمەند بوو، حەزی بە سەما و دانیشتنی ئافرەتان بوو، لە دوای ئەوەی كە ڕاستگۆ بوو لە دینداری و خواناسی وازی لە هەمووی هێنا و بە ئەندازەیەك یەكێك لەو ئافرەتە جوانانە كە زۆر لەگەڵیدا بوو، بانگی كرد وتی: فوضالە وەرە قسەت بۆ دەكەم و گۆرانیت بۆ دەڵێم!



فوضاله وتی: نابێت و خوای گەورە ڕێگات پێنادات و لە ئیسلامدا حەرام کراوە.

ڕاستەوخۆ گۆڕانکاری بەسەر داهات، ئیسلام کارگەی دروست کردنی پیاوی ئازا و جوامێرە، بە ئەندازەیەک گۆڕانکاری لە پیاو و ژندا دەکات، کە لە پێوەردا هەژمار ناکرێت.



## موسوڵمانبوونی هیندی خێزانی ئەبو سوفیان

ماکوان: هیندی کچی عوتبە، یەکێکە لەو کەسایەتییانەی کە پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکرێت، کەسایەتییەکی بەهێز پێش ئیسلام و دوای موسوڵمانبوونی هێزی کەسایەتی ئەم هاوەڵە ئافرەتە زیاتر بوو، کچی یەکێک لە سەرکردە ناودار و بەهێزەکانی قورەیش بوو، هاوسەرەکەی بەهەمان شێوە سەرۆکی مەککە بوو، کوڕەکەی حەنظەڵە یەکێک بوو لە قیاداتی سەربازی قورەیش، دژایەتییەکی زۆری ئیسلامی کرد ساڵانێکی دوور و درێژ، هەرچی کەسی بوو لە جەنگی موسڵمانادا تیاچووبوو لە باوک و برا و کوڕەکەی و مامی، یادگاری زۆر ناڕەحەتی هەیە لەگەڵ موسڵماناندا، هەروەها داواکراوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا کە بکوژرێت، چونکە زۆر داخ لە دڵ بوو بەرامبەر بە موسڵمانان و پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی ئوحود و خەندەق دا بەشدار بووە، لە هەموو سوپاکاندا هانی سەربازەکانی ئەدا تا ڕۆحی بەرگریان زیاتر بێت.

لە جەنگی ئوحود دا هەموو پیاوان ڕایانکرد، ئەو ڕای نەکرد و خۆڵی دەکرد بە چاوی موسڵماناندا، لە کۆتایی جەنگی ئوحود دا کارێکی زۆر قێزەونی ئەنجامدا ئەویش هەڵدڕینی سکی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب و خواردنی بەشێک لە جەرگی، تا توانای نەبوو تفی کردەوە، هەتا کۆتایی لە دژایەتی موسڵمانان بوو تا هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ فەتحی مەککە، هەر دەیویست هانی خەڵکی بدات بۆ جەنگ دژی موسڵمانان، تەنانەت داوای کرد لە خەڵک کە هاوسەرەکەی بکوژن، چونکە بە خیانەتکار ناوی برد، مێژووی زۆر ڕەشە، بەڵام لە کۆتاییدا هەڵگری هیدایەت و ڕێنمونی بوو.

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت لە کێوی صەفا بۆ بەیعەت وەرگرتنی خەڵکی شاری مەککە لە دوای پیاوان ئافرەتان هاتن بۆ بەیعەتدان بە پێغەمبەری خوا ﷺ، لە ناو ئەو ئافرەتانە هیندی کچی عوتبە هات و دەموچاوی خۆی هەڵبەستبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیناسییەوە، بەیعەتەکەی ئافرەتان لەسەر ئەوەبوو کە هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار نەدەن، دزی نەکەن، داوێن پیسی نەکەن،



منداڵەکانیان نەکوژن و لەبار نەبەن و زیندە بە چاڵیان نەکەن، بوهتان و قسە بۆ کەس هەڵنەبەستن و حورمەت و داوێنی خەڵکی بپارێزن، سەرپێچی لە کاری چاکە نەکەن.

ئینجا هاتە سەر هیند کە بەیعەت بدات، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بەیعەتم بدەرێ لەسەر ئەوەی کە هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەی.[١٤]

هیند وتی: سوێند بە خوا تۆ لەسەر ئێمە قورس دەکەیت، بۆ پیاوان زۆر نەبوو بەیعەتەکە بەس بۆ ئافرەتان ڕوونکردنەوەی زۆرە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نەیناسیەوە بەردەوام بوو، ئینجا فەرمووی: دزی مەککەن.

هیند وتی: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەبوسوفیان پیاوێکی دەست نوقاوە، بەشی خۆم و منداڵەکان پارەم ناداتێ، ئەتوانم لە پارەکەی هەڵگرم بە گوێرەی پێویست، بەبێ ئەوەی خۆی بیزانێ؟!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زانی هیندی کچی عوتبەیە، فەرمووی: لە پارەکەی بەرە ئەوەندەی کە خۆت و منداڵەکانت پێویستیانە بە چاکە[١٥] ئینجا پێغەمبەر زانی هیندە و فەرمووی تۆ هیندی کچی عوتبەی؟ (إنک لهند بنت عتبة؟)

ئینجا پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو مێژووی ڕەشی دوژمنکاری هیند و بیکردنەوەی لە شەهیدکردنی حەمزەی مامی. بەهەرحاڵ هیند وتی: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا من هیندم، خوای گەورە لە ڕابردوومان خۆش بێت، پێغەمبەری خوا لێی خۆشبوو چونکە موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وازی لێهێنا.

بەردەوام بوو پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی، زینا و داوێن پیسی مەککەن. (ولا تزنين).

هیند وتی: بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئافرەتی ئازاد تۆ بڵێیت داوێن پیسی بکات؟!

---

١٤ ـ (أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا).

١٥ ـ (خُذِي مِنْ مَالِهِ بِالْمَعْرُوفِ مَا يَكْفِيكَ وَيَكْفِي بَنِيكَ).



ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منداڵەکانتان مەکوژن. (ولا تقتلن أولادكن).

هیند وتی: منداڵەکانمان بە بچوکی گەورە کرد، ئێوە بە گەورەیی کوشتتان، بۆ لە ڕۆژی بەدردا منداڵتان بۆ هێشتینەوە هەمووتان کوشت، تۆ باوکی هەموویانت کوشت، ئێستاش ئامۆژگاریمان دەکەیت منداڵەکانمان نەکوژین؟!

لەهەر قسەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هیند کۆمێنتێکی هەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە پێکەنین و عومەری کوڕی خەطابیش لەگەڵیدا بوو هەردووکیان زۆر بەسادەیی وەریانگرت و بەڵام پێکەنین بە کۆمێنتەکانی هیند.

پاشان پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوو و فەرمووی: بوختان و قسە هەڵمەبەستن لەسەر داوێن و دەستی خەڵکی واتا خەڵکی تاوانبار مەککەن بە دزی و بە داوێن پیسی. [١٦]

هیند وتی: بەڕاستی سوێند بەخوا بوختان هەڵبەستن کارێکی قێزەونە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: گوێڕایەڵیم بکەن لە کرداری چاکە و سەرپێچی مەککەن.

هیند وتی: بۆیە هاتووین و لەگەڵتا دانیشتووین بۆ ئەوەی سەرپێچی چاکە کردن نەکەین.

بەم شێوەیە بەیعەتدانی ئافرەتانی شاری مەککەش کۆتایی هات، لە ناویاندا ئەو خانمە بەڕێزە لە دوایی خزمەتێکی زۆر گەورە دەکات بە موسڵمانان، خواناس و موجاهیدی سەردەمی خۆی بوو، پێشتر لەگەڵ سوپای کافرەکان دا دەردەچوو، بۆ جەنگی موسڵمانان لەمەودوا ڕێک پێچەوانەکەی ڕووی دا لەگەڵ سوپای موسڵماناندا دەردەچوو بۆ جۆش و خرۆشدانی جەنگ و هاندان و بەرزکردنەوەی ورەی موسڵمانان لە جەنگەکەدا.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٦] ـ (أَلَّا تُبَايِعُونِي عَلَى مَا بَايَعَ عَلَيْهِ اَلنِّسَاءُ ، وَلَا تَسْرِقُوا ، وَلَا تَزْنُوا ، وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ ، وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ ، وَلَا تَعْصُونِي فِي مَعْرُوفٍ ؟ » قُلْنَا : بَلَى يَا رَسُولَ اَللَّهِ ، فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « فَمِنْ أَصَابَ بَعْدَ ذَلِكَ شَيْئًا فَنَالَتْهُ عُقُوبَةٌ فَهُوَ كَفَّارَةٌ ، وَمِنْ لَمْ تَنَلْهُ عُقُوبَةٌ فَأَمْرَهُ إِلَى اَللَّهِ ، إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ).



لە زۆربەی جەنگەکانی دژی ڕۆم بەشدار بووە، لە جەنگی یەرمووک بەرامبەر ٢٠٠ هەزار سەرباز، هیند هۆکاری سەرکەوتنی موسڵمانان بوو بە هاندان و بەرز کردنەوەی ورەیان.



## ڕێز و حورمەتی ئافرەت لای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

ماکوان: هەرگیز پێغەمبەری خوا ڕووبەڕووی هیچ ئافرەتێک نەبۆتەوە بۆ تورەیی ئەگەر خوانەناس و کافریش بووبێت، ڕێزی زۆری لە ڕاوبۆچوونی ئافرەتان گرتووە بەتایبەت ڕاوێژکارەکانی لە هاوسەر و ئافرەتانی تر بەتایبەت ئوم سەلەمە.

پاشان قسەی ئافرەتی نەشکاندووە، بینیمان خێزانی عیکرمە داوای داڵدەی کرد، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕێزی گرت و هاوسەرەکەی هێنایەوە، هەروەها هیند کەسێکی داواکراو بوو، هەر ئەوەندەی وت خوای گەورە لە گوناهی ڕابردوومان خۆش بێت لەگەڵ کومێنتە ڕەق و تانەوییەکانیدا، بەڵام پێغەمبەر حورمەتی گرت و ئازادی و داڵدەی پێ بەخشی.

هەروەها لە کاتی جەنگی ئەو کۆمەڵەی کە خالیدی کوڕی وەلید ڕووبەڕوویان بوویەوە، دوو کەس لە جەنگەکەدا هەڵهاتن لە باشووری مەککەدا خۆیان کرد بە ماڵی خاتوو ئوم هانی کچی ئەبو تاڵیبی خوشکی عەلی، ئەم دوو کەسە لە هۆزی بەنو مەخزوم بوون، بۆچی ماڵی ئوم هانیان هەڵبژارد؟ لەبەر ئەوەی هاوسەرەکەی مەخزومی بوو ناوی (هوبەیرەی کوڕی ئەبی وەهەبی مەخزومی بوو) ئەو دوو کەسەش خزمی هاوسەرەکەی بوون.

چوونە ماڵەکەی و داوای داڵدەدانیان لەو ئافرەتە کرد، ئەمەش زۆر نەنگییە لە ناو عەرەبدا داوای داڵدەدان لە ئافرەت بکرێت، بەڵام ناچار بوون هیچ ڕێگا چارەی تریان نەمابوو، تەنها ئوم هانی نەبێت.

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب دەڕوات بۆ ماڵی خوشکەکەی دەبینێت دوو پیاوی موشریک لەوێن، ئیمامی عەلی هەوڵی کوشتنیان ئەدات و ئوم هانی دەڵێت من داڵدەم داون نەیانکوژیت، ئیمامی عەلی واز ناهێنێت و دەڵێت دەیانکوژم، تا دەرگا لەسەریان دادەخات و ئیمامی عەلی هەر واز ناهێنێت، پاشان ئوم هانی دەڵێت؛ با حوکمەککە ببەینە لای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەردووکیان دەڕۆن بۆ لای رسول الله.



ئوم هانی دەڵێت: یا رەسول ئەم برایەی دایکی و باوکیم دەڵێت ئەو دوو کەسە دەکوژم کە من داڵدەم داون.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: ئەوەی تۆ داڵدەت داوە ئێمەش داڵدەی ئەدەین، ئەوەی تۆ پاراستوتە ئێمەش دەیپارێزین[١٧].

کەس ناتوانێت بیانکوژێت (فَلا يقْتُلهما).

لێرەدا کێشەکە لە داڵدەدانەکەدا نییە، لێرەوە ئەوە دەردەکەوێت، کە قیمەتی ئافرەت بەرز رادەگرێت، نەیووت تۆ چیت تا داڵدەی دوژمنی ئێمە بدەیت.

لە کاتێکدا فەتحی شاری مەککە سەربازی بوو ئەم دوو کەسە جەنگاون لەگەڵ موسڵماناندا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، قیمەت و رێزی ئافرەتەکە ئەوەندە بەرز دەکاتەوە، کارەکەی داوەتە پاڵ خۆی، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم پاشان جێگا و مەکانەتی وای دایە ئافرەت کە لەهیچ جێگایەکی تردا هاوشێوەی نییە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

ـ (قَدْ أَجَّرْنَا مِنْ أَجْرَتْ يَا أُمْ هَانِئْ ) ، وَفِي رِوَايَةِ أَحْمَدْ : أَنَّهُمَا رَجُلَانِ مِنْ إِحْمَائِهَا ، فَقَالَ لَهَا اَلنَّبِيُّ - صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( قَدْ أَجَّرْنَا مِنْ أَجْرَتْ ، وَأَمْنَّا مِنْ أَمَّنَتْ فَلَا يقَتَلَنَهَمَا ) . وَقَدْ بُوبْ اَلْبُخَارِي عَلَى هَذَا فَقَالَ: " بَابُ أَمَانِ اَلنِّسَاءِ وَجِوَارِهُنَّ).[١٧]



## ڕووداوی ئافرەتێکی دز لە هۆزی مەخزوم

ماکوان: ئەم ڕووداوە زۆر گرنگە و پێویستی بە هەڵوەستە لەسەر کردنە، لە دوای فەتحی مەککە دا، ئافرەتێکی هۆزی مەخزوم دزی کرد، لەو ئافرەتانەش بوو کە موسڵمان بوو، ئافرەتێکی ئازادی ناوداری ئەو هۆزە بوو، هۆزی بەنو مەخزوم گەورە بوو, پەیوەندییان لەگەڵ هۆزی پێغەمبەردا ﷺ لەسەر بنەمای کێبڕکێ بوو، داخۆ کێ لە کێ باشترە، لە هەموو شتێکدا موونافەسە لە نێوانیان دا هەبوو، سەرۆکی ئەم هۆزە ئەبوجەهل بوو، ئەم هۆزە چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکرا لە هەرکات و ساتێکدا، هەڵگەڕانەوە ئەنجام بدەن، کاری باش بەدوای خۆیدا نەهێنێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچۆن بوو دەیویست دڵی هۆزەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، زۆرێک لە هۆزەکان دڵیان باش بوو لە بەرامبەر دەوڵەتی ئیسلامی، هۆزی بەنو ئومەییە، هۆزی بەنو عەبدولدار، هۆزی بەنو عامر، بەڵام پێغەمبەری خوا بڕیاریدا کە ئەو ئافرەتەی دزی کردووە، دەبێت بە گوێرەی یاسای ئیسلامی دەستی ببڕدرێت، ئەم بڕیارە پێغەمبەر جەختی لەسەر کردەوە.

لە هەمان کاتدا ڕەوشەکە ناجێگیرە، پێغەمبەری خوا ﷺ نازانێت کۆتاییەکەی بە کوێ دەگات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت وانەیەک فێری ئوممەتەکەی بکات مادام ئەم ئافرەتە لە ئەشرافی قورەیشە و پێویستی بە پارە خواردن نییە، هەر کارەکەی بۆ خراپەکاری کردووە، دەبێت (حەددی) لەسەر دابندرێت و فەرمانی دەستبڕینی لەسەر جێبەجێ بکرێت، حوکمی خوای گەورە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت.

جا بۆ هەر مرۆڤێک بێت، دەوڵەمەند و شەریف و سەید و گەورە، فەقیر و هەژار و لاواز و زەبوون وەکو یەکن، بۆ هیچیان ناگۆڕێت و یەک ناخرێت و لەمپەری ناخرێتە ڕێ، یاخود ئەگەر هەر دەرئەنجامێکی هەبێت، دەبێت دەوڵەتی ئیسلامی پیادەی حوکمی خوای گەورە جێبەجێ بکات.



لە ناو خەڵکیدا بڵاوبوویەوە کە ئەو ئافرەتە مەخزومییە، دەستی دەبڕێت خێرا بەنو مەخزوم کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بڕۆنە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ شەفاعەتی بۆ بکەن، ویستیان نێوەندگرێک بدۆزنەوە، بۆ ئەوەی کارەکەیان بۆ ئەنجام بدات، ئەوەی کە بڕیاریان لەسەردا، ئوسامەی کوڕی زەید بوو کە ناسرابوو بە خۆشەویستی کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئوسامەی زۆر خۆش دەویست، لەکاتی فەتحی مەککەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەدوای ئەسپەکەیەوە دای نابوو.

چوونە لای داوایان کرد کە هاوکاریان بکات و نەهێڵێت دەستی ئەو ئافرەتە ببڕێت چونکە ئافرەتێکی عەزیز و شەریفی ناو بەنو مەخزومە.

ئوسامە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و داوای لێخۆشبوون و شەفاعەتی بۆ کرد بۆ ئەوەی بڕینەکەی لەسەر لابەرێت.

کە قسەی تەواو کرد پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ توڕەبوونێک توڕەبوو کە دەموچاوی موبارەکی سوور هەڵگەڕا و فەرمووی ئوسامە شەفاعەت لەسەر یاسا و ڕێساکانی خوای گەورە دەکەیت؟! [18]

ئوسامە دەڵێت: هیچ قسەم پێنەما و نەمتوانی خۆم دەرباز بکەم, تەنها وتم؛ ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ببورە لێم خۆشبە، ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ببورە و لێم خۆشبە.

لە پاشاندا حەد لەسەر ئافرەتەکە دانرا و دەستی بڕا و کەس نەیتوانی واستە و شەفاعەت بۆ ئەو ئافرەتە بکات.

هەر لەو شەوەدا کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەستی ئافرەتەکەی بڕی و وتارێکی دا لە ناو هاوەڵاندا بۆ ئەوەی باش لەو وانەیە تێبگەن، بونیادی بنەڕەتی دەوڵەتی ئیسلامی بۆی

---

[18] - (فِي قَوْلِ اَلنَّبِيِّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اَللَّهِ ؟!).



دارشتن و ڕوونی کردەوە، دادپەروەری چییە و چۆن بەدەست دەهێنرێت چونکە بنەمای حوکمی ئیسلامی لەسەر بنەمای دادپەروەردییە بۆ خەڵکی.

لە وتارەکەیدا فەرمووی: پێش ئێوە خەڵکانێک بەسەرگەردانی و هەلاکەتدا چوون بە هۆکاری ئەوەی ئەگەر خاوەن دەسەڵات و شەرەف و گەورەکانیان دزیان بکردایە وازیان لێ دەهێنان، خۆ ئەگەر لاواز و بێ دەسەڵاتەکانیان دزیان بکردایە، ئەوا یاسا و ڕێسا بەسەریاندا دەسەپێندرا، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر فاتمەی کچم دزی بکات دەستی دەبڕم.

کەواتە هەموو دەبێت بزانن یاسای ئیسلامی بۆ هەمووانە، نەک بەس بۆ هەژاران. [١٩]

پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕوون و ئاشکرا باسی کرد، لە ناو دەوڵەتی ئیسلامی دا چینایەتی نییە،

﴿... تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ...﴾ ﴿... تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ...﴾ [البقرة].

واتە: ...جا ئەوانەی کە باسکران چەند سنوورێکی خوان و مەیانبەزێنن و نزیکیان مەکەون...

واتە: ...دڵنیابن ئەو شتانەی کە باسکران سنوورەکانی خوای پەروەردگارن، لێی مەترازێن و سنوورشکێنی مەکەن...

ڕازی کردنی دڵی خەڵکی دەکرێت بەکاری دنیا بێت، بەڵام ڕازیکردنی دڵی خەڵکی بە شکاندنی یاسای خوایی نابێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٩] ـ (ن عَائِشَة - رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا - أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهِمْ شَأْنُ ٱلْمَخْزُومِيَّةِ ٱلَّتِي سَرَقَتْ ، فَقَالُوا : مِنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولُ ٱللَّهِ - صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَقَالُوا : وَمِنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلَّا أُسَامَة بْنُ زَيْدٌ حُبٍّ رَسُولِ ٱللَّهِ - صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَكَلَّمَهُ أُسَامَة ، فَقَالَ: " أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ ٱللَّهِ ؟ "، ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبْ فَقَالَ: " إِنَّمَا هَلَكَ ٱلَّذِينَ مِنْ قِبَلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمْ ٱلشَّرِيف تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمْ ٱلضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ ، وَأَيْمٌ ٱللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتْ مُحَمَّدْ سُرِقَتْ لَقَطَعَتْ يَدُهَا " ).



لە دەوڵەتی ئیسلامیدا هەرکەس چووە بەردەم حەددی خوای گەورە، جا گەورە بێت یان ژن یان پیاو هەر جۆرێک لە مرۆڤ لە هەر پایە و پۆست و مەقامێک دا بێت، دەبێت حوکمی خوای بەسەردا پیادە بکرێت.

ئینجا لەو شەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی هۆزی بەنو مەخزوم باش لەوە تێبگەن، کە ئەم کارە پەیوەندی نییە بە هۆز و عەشیرەتەوە، چوو دڵی ئەوانی دایەوە بەوەی فەرمووی: ئەگەر کچی محمد پێغەمبەر ﷺ کە فاتمەی زەهرایە دزی بکات دەستی دەبڕێت، ئەمەش بە تەواوی ڕەوشەکەی ئارام و هێور کردەوە، واتا تایبەت نییە بە بەنو مەخزوم و هۆزێکی تایبەت، فەرمانەکە گشتییە پاشان لە دوای دەستبڕینی ئەو ئافرەتە هیچ دزییەکی تر ڕووی نەدا لە شاری مەککەدا، ئەو ئافرەتە مەخزومییە کەسێکی زۆر دیندار و خوا ناسی لێ دەرچوو، پاشان لە زۆرێک لە کتێبی فیقهی ئیسلامیدا, ئەو ئافرەتە زۆرێک لە ئەحکامی بۆ باسکردووین, چونکە هەمیشە دەچووە خزمەت پێغەمبەر و پرسیاری لێ دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی هەموو پرسیارەکانی داوەتەوە.



## تورەبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هۆزی خوزاعە

ماکوان: لە دوای فەتحی مەککە خوزاعە زۆر بوغرا بوبوون لە ناو شاری مەککە و دەوروپشتیدا چونکە پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەو هۆزە فەتحی مەککەی کرد، کە تەواو ستەمیان لێکرا بە دەستی بەنو بەکر، دەستی لە کوشتنی ئەوان پێ هەڵگرتن واتا بەنو بەکر، بەڵام ئەو جارە وایان دەزانی کە پێغەمبەر ﷺ نازیان دەکێشێ هەڵسان بە کوشتنی پیاوێک لە هۆزی هوزەیل، پێغەمبەری خوا ﷺ تورەبوو لە کارەکەیان چونکە تۆڵەیان لە کەسێک کردەوە کە لە سەردەمی جاهیلیدا کەسێکی لە خوزاعەی کوشتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ کاری پاشاگەردانی و مافیای قبوڵ ناکات، ئەگەر چی ئەو کەسەی کە کوژراوە موشریکە و پاشان خوزاعەش هاوپەیمانی پێغەمبەرە ﷺ ئەمە مانای وا نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ چاو لە کاری ناپوختە و نادادپەروەری بنوقێنێت و گوێی پێ نەدات.

دەیەوێت بە خوزاعە و قورەیش و هەموو دونیا بڵێت حوکمی خوا لەسەرووی هەمووتانەوەیە، کە ئەوکارەی بینی پێغەمبەر ﷺ زۆر تورەبوو، خوزاعە دەیەوێت تۆڵەی جاهیلی خۆی بە ئیسلام بکاتەوە، ئەمەش ئیسلام پێی ڕازی نییە، ئەو کەسەی کە ئێستا کوژراوە هیچ تاوانێکی نەکردووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ سنووری یاسای خوای بەسەر خوزاعەش دا پیادە کرد و لە وتارەکەیدا فەرمووی:

ئەی خەڵکینە لەو ڕۆژەی خوای گەورە ئەم گەردوونەی دروست کردووە لە شاری مەککەدا هەموو کارێکی ناپەسەندی حەرام کردووە، بێجگە لە بەندایەتی تێیدا حەرامە تا ڕۆژی قیامەت، بۆ کەسی ئیماندار نییە لەو جێگایەدا خوێن بڕێژێت ئەگەر بڕوای بە خوا و ڕۆژی قیامەت هەبێت، نابێت دار و چیلکەی تێدا بشکێنیت، بۆ هیچ کەس نییە پێش من و دوای منیش حەڵاڵ نەبووە بۆ من و هیچ کەسێکی تر حەڵاڵ نابێت، نابێت لە خەڵکی مەککە تورە بیت، ئەبێت وەکو پێشتر حورمەت و گەورەیی بۆ شاری مەککە بگەڕێتەوە، ئەوەی ئامادەیە و ئاگاداری ئەم وتانەی منە، بیگەیەنێتە ئەوانەی کە لێرە نەبوون.



کاتێک خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی حەڵال کرد، چەند ماوەیەک، بەڵام مانای وانییە بۆ ئێوەی هۆزی خوزاعە حەڵال کردبێت، دەست هەڵبگرن لە کوشتن، ئەگەر وا نەکەن ئەوا من هاوپەیمانتانم، دییە (خوێنبایی)ی ئەو کەسە ئەدەم کە کوژراوە، لە مەولا هەرکەس هەرکەسێک بکوژێت، وەکو بکوژ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

بەم شێوەیە سنووری دانا بۆ شاری مەککە لە دزی و پیاوکوژی و سەرەڕۆیی، پاشان حورمەت گرتنی ناو شاری مەککە و پاراستنی حورمەتی کەعبە.

هەرچۆن بوو پێغەمبەری خوا ﷺ شاری مەککەی ڕێکخستەوە لە هەموو بوارەکاندا و لە ڕووی بازرگانی و ئابووری و دانانی هێزی سەربازی، پاشان بیری لەوە کردەوە کە والی بۆ شاری مەککە دابنێت و لەگەڵ والییەکە قاضی دابنێت کە چاو کراوە و شارەزابێت لە دینی خوای گەورە.



# یەکەم والی بۆ شاری مەککە عەتتابی کوڕی ئوسەید

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەفتاری وابوو هەر جێگایەکی فەتح دەکرد، ئیسلامی دەبردە ئەو جێگایە و پاشان کە تەشریفی دەبردەوە بۆ شاری مەدینە، لە هاوەڵانی کەسێکی بەسەر ئەو جێگایەوە دادەنا.

پێشتر ئەبو سوفیان والی مەککە بوو یاخود سەرۆکی بوو، پێش چەند ساڵێک نزیکەی ٦ ساڵ واتا دوای کوژرانی ئەبو جەهل، ئەبو سوفیان چووە جێگای، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دڵنیا نەبوو لە ئیمان و ئیسلامی ئەبو سوفیان، نەک بەو مانایەی موونافیق یان دووڕووبێت، حاشا؛ ئەبو سوفیان نوێ بوو، نەدەکرا ئیمارەتی مەککەی بداتەوە دەست، چونکە مەککە گەورەترین شاری عەرەب بوو، ناتوانێت بیدات بە کەسێک لە دینەکەی و خواناسییەکەی دڵنیا نەبێت هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئیماراتەکە بداتە هەر کەسێک ئەبو سوفیان پێی خۆش نابێت، دەشێت بیر لە هەڵگەڕانەوە بکات دژی موسڵمانان، پێغەمبەری خوا ﷺ نایەوێت لە دوای دەرچوونی لە شاری مەککەدا کێشە درووست ببێت، خەڵکی شاری مەککە هەموو چەند ڕۆژێکە موسڵمان بوون.

هەربۆیە بیری کردەوە بیدات بە گەنجێک کە تەمەنی ٢٠ ساڵ بوو، ناوی (عەتتابی کوڕی ئوسەید ) بوو، ئەم گەنجە لە هۆزی بەنو ئومەییە بوو، هەمان هۆزی ئەبو سوفیان، ئەگەر ئیمارەتەکە بدات بەو گەنجە زیاتر دڵی ئەو هۆزە بەلای پێغەمبەری دا ﷺ ڕادەکێشرێت، هەروەها ئەبو سوفیانیش قسەی نامێنیت و بەم پێیە ئەبوسوفیانیش هەنجەتی حوکم کردنی لە مەککەدا نامێنێت.

ئەم ئەمیرە لاوە، تەمەنی زیاتر لە ئیسلامدا سەرف کردووە، یادگاری ڕەشی زۆری نەگرتووە بە بیروباوڕ و شیرک، دڵی بە موشریک ناسووتێت، پاشان نوێیە و دوژمنایەتی موسڵمانانی نەکردووە پێشتر تا قوڵ بووبێتەوە لە دژایەتی و کاری دوژمن کارانە، بەڕاستی ئیسلامەتی کرد ئەم هاوەڵە گەنجە و نوێژ و ڕۆژووی زۆری هەبوو، هەمیشە دەستی لە بەخشین و خێر و چاکەدا بوو، یەکێک بوو لە هاوەڵە نزیکەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەها بە



حیکمەت و هێمنی و لەسەرخۆیی توانی ئەمن و ئاسایشی شاری مەککە دابین بکات، هیچ جۆرە کردارێکی نەخوازراو لە ماوەی فەرمانڕەوایی عەتتابدا ڕووی نەدا و شار ئاسایشی تێدا بەرقەرار بوو، هەروەها لە دوای دانانی والی مەککە پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی کوڕی جەبەلی ئەنساری لەگەڵ دانا بۆ هاوکاری و تاخەڵکی فێری دینداری و خواناسی بکات، چونکە عەتتاب نوێ بوو زانیاری زۆری لەسەر ئیسلام نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەریایەکی لە دەریاکانی ئیسلامی بۆ بەجێهێشت کە شارەزاترین کەسی هاوەڵان بوو لە حەرام و حەڵاڵدا، خەڵکی شاری مەککە زۆری لە داهێنەر و خاوەن فکری تێدابوو، پێویستیان بە کەسێکی زۆر شارەزا هەیە ئەو کەسەش موعازی کوڕی جەبەلە کە یەکێکە لە زانایانی ئەم ئیسلامە.

هەر ڕاجیاییەکیان بۆ دروست بوو بگەڕێنەوە بۆ لای موعاز، بەم شێوەیە ڕەوشەکە لە شاری مەککەدا بە تەواوەتی جێگیر بوو، بە فەضڵی خوای گەورە خەڵکی زۆر هاتنە ناو ئەم ئیسلامە، ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵکی یادەوەری زیاتری بۆ خواناسی و ئیسلام دروست دەبوو.



## هەڵوێستی ئەنسار لە دوای فەتحی شاری مەککە

ماکوان: خەڵکی ئەنسار کە بینییان شاری مەککە فەتح کراوە خەڵکەکەی هەموو هاتونەتە ناو ئیسلام پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر دڵخۆش بووە، خەڵکی ئەنسار بینییان کە شاری مەککە هێمن و ئارامە و هەموو سەرکردە و دوژمنکارەکانی موسڵمان بوون لە عیکریمە و ئەبو سوفیان و سوهەیل...هتد.

بەم شێوەیە ڕەوشی شاری مەککەیان بە چاوی خۆیان بینی کە جێگیر و ئارامە هەموو قیاداتی گەورەی ئەو شارە ملکەچن بۆ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەنسارییەکان بیریان لەوە کردەوە کە ئەمانە هەموو کەس و کاری پێغەمبەرن صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، هەموو وایاندەزانی گەڕانەوەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ شاری مەدینە هەرگیز ڕوونادات، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەسەر کێوی سەفا وەستا و دەستی کرد بە پاڕانەوە و خەڵکی ئەنسار هەموو لە خوار کێوەکەوە ئامینیان بۆ نزاکانی پێغەمبەر دەکرد.

خەڵکی ئەنساری بە چپە و بێدەنگییەوە بە یەکتریان وت، ئەم -پیاوە- مەبەستیان پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بوو، دیارە ئێرەی پێخۆشە و حەزی بە شارەکەی خۆیەتی لە ناو عەشیرەتەکەیدا بێت.

چونکە پێغەمەریان دەبینی چەندە خۆشحاڵە و چۆن ئاوێتە بووە لەگەڵ ڕەوشەکەدا هەر لەم چپە چپەی نێو خۆیان دابوون، لە پڕ پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ وەحی بۆهات، هەر کاتێک پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ وەحی بۆ بهاتایە هاوەڵان بۆ ڕێزی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ چاویان بەرز نەدەکردەوە تا پێغەمبەری صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ وەحییەکەی پێڕادەگەیەنرا.

ماوەیەک لەسەر کێوی سەفا وەحی بەردەوام بوو، پاشان کۆتایی هات و ئینجا پێغەمبەری خوا فەرمووی:

ئەی خەڵکی ئەنسار..



هەموو وتیان: لە خزمەتین ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ: وتتان ئەو پیاوە حەز و ئارەزووی ئەوەیە لە شارەکەی خۆی بمێنێتەوە.

هەموویان وتیان : زۆر ڕاستە وامان وت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: نەخێر من بەندەی خوا و پێغەمبەرم هیجرەتم لە پێناوی خوا کردووە بۆ لای ئێوە، لەگەڵتاندا دەژیم و لەگەڵتاندا دەمرم.

کەواتە بە درێژایی تەمەنم لەگەڵتاندا دەژیم، مانای وانییە هەست و سۆزم تێکەڵ بووە لەگەڵ موسوڵمانبوونی شاری مەککەدا و خۆشحاڵم بە فەتح و بە موسڵمانبوونی عەشیرەت و کەس و کارەکەم، ئەمانە هەموو ڕاستە! بەڵام مانای وا نییە کە واز لە ئێوە بهێنم و نەگەڕێمەوە شاری مەدینە.

چونکە ئەنسار لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا وتیان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەرچی لە نێوانمان دایە لەگەڵ خەڵکی شاری مەککەدا لەبەر تۆ دەیپچڕێنین و بەیعەتت ئەدەینێ لەسەر جەنگکردن لەگەڵ هەموو دوژمنێکتدا، بەڵام ئەگەر سەرکەوتیت بە جێمان دەهێڵیت؟!

ئەو کاتە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە وەڵامی ئەنساردا فەرمووی : (ژیانم لەگەڵ ژیانتاندایە و مردنم لەگەڵ مردنتاندایە و من لە ئێوەم و ئێوەش لە منن). [٢٠]

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە شاری مەدینە دا پێش ١٠ ساڵ لەمەوبەر ئەو قسەیەی کردبوو وا دیسان بۆ دڵنیایی بۆی دووبارە کردنەوە.

ئینجا ئەنسار لەوە دڵنیابوون پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خاوەن وەفا و پەیمانە، لەگەڵیاندا دەژی و دەمرێت و هیجرەتی بۆ لای ئەوان کردووە، دیار بوو زۆر ئیحراج بوون وتیان:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٠] ـ ( مَعَاذالله, المَحْيا مَحْيَاكُمْ, وَالْمَمَات مَمَاتكُمْ، انَا مِنْكُم وَأنْتُم مِنِّي).



ئەوەی کە وتمان سوێند بەخوا تەنها لەبەر خۆشەویستی بوو بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، هەڵبەت بە گریانەوە ئەم قسەیان کرد، زۆر شەرمەندەی لای پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوون.[21]

واتا ئەوەی ئەنسار وتی لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەریان دەویست لەگەڵیاندا بگەڕێتەوە بۆ شاری مەدینە، هەموو بەگریانەوە داوایان کرد.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بە دڵنیاییەوە خوا و پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بڕواتان پێدەکەین و ڕاستگۆن، خاوەنی عوزریشن.[22]

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ تەواوی عوزری بۆ ئەنساری هێنایەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان ڕاستگۆ بوون لە خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر، قیمەت و بەهای گەورەی ئەنساری زۆر بەرزە لە تەرازوو و پێوەری ئیسلامدا، ئەنسار ئەوەی کردی چاوەڕوانی پاداشتی دنیایی نەبوو، ئەوان هەر خاوەنی بەخشین بوون، لە ژیانیاندا بە دوای وەرگرتنەوە نەبوون، لە کاتی هیجرەتدا ئەنسار سەروەتی خۆیان بەخشی بە کۆچەرەکان و ژیانیان بەخشی بە ئیسلام و لە خزمەت پێغەمبەردا بوون تا کۆتایی ژیانی، بۆیە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: نیشانەی ئیمان خۆشەویستی ئەنسارە، نیشانەی دووڕوویي ڕق لێبوونەوە لە ئەنسارە.

چونکە بەخشین پێش فەتح پاداشتێکی هەبوو دوای فەتح پاداشتی کەمتری هەیە، هیجرەت دوای فەتحی مەککە نەما، بە بەڵگەی ئەوەی (موشاجعی کوڕی مەسعود) هاتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و براکەی بەناوی (موخالید کوڕی مەسعود)

موخالد وتی: هاتووم تا بەیعەتم بدەیتێ بۆ هیجرەت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[21] ـ (وَيَقُولُونَ: وَاَللَّهُ مَا قُلْنَا اَلَّذِي قُلْنَا إِلَّا ضَنًّا بِاَللَّهِ وَرَسُولِهِ): اَلرَّاوِي: أَبُو هُرَيْرَة

[22] ـ (وَإِنَّ اَللَّهَ وَرَسُولَهُ يَصَدِّقَانِكُمْ وِيعَذِرَانِكُمْ).



پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی : هیجرەت لەگەڵ ئەهلی هیجرەت ڕۆیشت و کۆتایی هات.[٢٣]

ئینجا موشاجع وتی: لەسەر چی بەیعەت بدات؟!

موخالد: بەیعەتم بداتێ لەسەر ئیسلام و ئیمان و جیهاد.[٢٤]

کەواتە ئەوانەی لەسەرەتاوە پێش فەتحی مەککە هیجرەتیان کرد ئەوانە خاوەن پێگەیەکی زۆر گەورەن لە ئیسلامدا.

خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ [الحديد]

واتە: بێگومان چوونیەك نین ئەوانەتان کە پێش رزگاریی مەککە: یاخود پێش سەرکەوتن، مال و سامانی بەخشیوە و جەنگاوە، چونکە ئەوانە پلەوپایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی کەدوای ڕزگاری مەککە و بەدەستهێنانی سەرکەوتن مال و سامانیان بەخشیوە و جەنگاون.

پاشان سەروەت و سامانی داگیرکراوی موسڵمانان کە زۆر زۆر بوو بەفشاری موشریکی قورەیش هەموو گەڕایەوە بۆ موسڵمانان.

وا شاری مەککە و کەعبەی پیرۆز لە ژێر دەستی موسڵماناندایە، هێزێکی بێشوماری مرۆیی و ئابووری هاتۆتە سەر هێزی موسڵمانان، عەرەب بەشێوەیەکی گشتی ترسی لە موسڵمانان هەبوو، چونکە بە تەواوەتی خاوەن هێزی سەربازی بەهێز و توانا و ئابووری باش بوون.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٣] ـ (مَضَتِ الهِجْرَةُ لأَهْلِهَا).

[٢٤] ـ (أُبَايِعُهُ عَلَى الْإِيمَانِ وَالجِهاد،).



عەرەب لە ئێستادا زۆر گرنگی ئەدات بە ئیسلام، چونکە ڕۆژێک لە ڕۆژان بە خەیاڵیان دا نەهاتبوو موسڵمانان قوڕەیش و هێزەکەی لەناو دەبەن، هەموو بت و خواکانیان دەشکێنن، هەرچی کاهین و پیاوە ئایینییەکانیانە موسڵمان دەبن، بڕوا پێکردنی ئەمە بۆ عەرەب شتێکی زۆر قورس بوو.

بۆیە بەشێکی تری عەرەب ڕەوشەکەیان پێ قبوڵ نەدەکرا، ئیرەیی زۆریان بە موسڵمانان دەبرد، ئەم ئیرەییەش لە ئەنجامی ئەوە بوو کە ئەوان موشریک بوون، وا شاری مەککە پاک کراوەتەوە لە بت و پەیکەرەکانی قوڕەیش کە ناسراون بە هوبەل و لات و عوزا...هتد.

بۆیە هەندێک لە هۆزەکانی عەرەب کەوتنە کۆکردنەوەی هێز دژی موسڵمانان، ئەو هۆزەی کە زۆر گەورە بوو بریتیی بوو لە هۆزی (هەوازن).

ئەم هۆزە چاویان بەرایی نەدەهات بە فەتحی مەککە و سەرکەوتنی موسڵمانان، بۆیە کەوتنە پیلانگێڕان دژی موسڵمانان.

ئەوان تا ئەو ساتەوەختە کافر و موشریک بوون، لە دەرەوەی شاری مەککەدا شاری وەکو طائیف مابوو کە موشریک و خوانەناس بوون، زۆرێک ڕایان کردبوو بۆ ئەو شارە و هەندێکی تر مابوونەوە لەناو هۆزی (هەوازن) تیرەکانی ئەوان بۆ جەنگ خۆیان ئامادە دەکرد.



## نەخۆشی دەمارگیری هۆزگەرایی لە ناو عەرەب دا

ماکوان: عەرەب بەگشتی دەمارگیر و پشتگیری هۆز و عەشیرەتەکەیان بوون، لە ناو ئەو هۆزانەی زۆر وابەستەی هۆزگەرایی بوون، هۆزی (هەوازن) بوو.

عەرەب ڕۆحی عەشیرەتگەرایی کوێری کردبوون، لەبەردەم هۆز و تیرە و عەشیرەتەکەیاندا، حەق و ڕاستیان وەلا دەنا و کوێر دەبوون لە ئاست دادپەروەری دا، ئەم نەخۆشییە ترسناکەی ناو عەرەب ئیسلام لەسەرەتا هات دژی وەستایەوە، لەسەرەتای هاتنی پەیامەککەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جەنگی لەگەڵدا کردن.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمە باسی بکەم هۆزی (هەوازنە) کە زۆر دەمارگیر بوون بەڵام بۆ ناسینیان دەتانگەڕێنمەوە بۆ بنەڕەتیان و مێژووی ئەو هۆزە، بۆ ئەوەی بزانن چەند پەیوەندی بە قوڕەیشەوە هەیە.

عەرەب بە گشتی دەبن بە دوو تیرەی سەرەکی، یاخود لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتوون کە ناسراون بە عەدنانییەکان و قەحطانییەکان، عەدنانیەکان دەبن بە دوو بەش لەوانە (ربيعة، مضر).

هۆزی مضر دەبن بە دوو بەشی تر کە بریتین لە (ئیلیاس و عیلان) قوڕەیش لە بەشی ئیلیاس دێت، هەوازن لە بەشی عیلان دێت بەڵام بەشی تری زۆری لێ دەبێتەوە، ئەوە بە پوختی بوو.

لە جیاتی ئەوەی کە بەرەبابێکن دەبوو زیاتر سیلەی ڕەحم و خۆشەویستی و یەکگرتوویی دروست ببێت، بەڵام ڕێک پێچەوانەکەی ڕووی دا، لە ناو عەرەب بەگشتی هەموو خەریکی ململانێ و کوشتن و لە ناوبردنی یەکتر بوون.

نموونەی بەنو هاشم هۆزی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەمیشە لە ململانێ دابوون لەگەڵ هۆزی ئەبو جەهل کە ناسراون بە بەنو مەخزوم.



لە کاتێکدا هەردوولایان لە (قوصەیە) وە هاتبوون، مەخزوم و هاشم هەردووکیان برابوون لەگەڵ ئەو نزیکییەدا هەمیشە لە ململانێ و کێبڕکێ دابوون.

جاری وا هەبووە بە مونافەسەی یەکتر نەوەستاون کەوتوونەتە یەکترکوشتن و هێزی سەربازیان بۆ یەکتر بەکارهێناوە، نموونەی ئەوس و خەزرەج، کە هەردوولایان کوڕی (حارس کوڕی سەعلەبە) بوون لە بەشی قەحطان بەڵام نەخۆشی و دەردی هۆزگەرایی وای کرد بە درێژایی ساڵانێکی تووڵانی یەکتر بکوژن.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە قوڕەیش بوو، لە هاتنی وەحی دا خەڵکانێکی تر بڕوایان پێهێنا کە زۆر دوور بوون لە قوڕەیش، ئەبو جەهل کە زۆر نزیک بوو لە پێغەمبەر ﷺ بە هۆکاری دەرد و نەخۆشی هۆزگەریی نەهاتە ناو ئیسلام.

کاتێک دەگەڕێینەوە بۆ مێژووی نەسەب و بنەچەکان بۆمان دەردەکەوێت زۆربەی ململانێکان زۆرێک لە قەحطانییەکان بەم دوایانە موسڵمان بوون، لەوانە بوون کە زۆر دوژمنکار بوون بەرامبەر بە موسڵمانان، نموونەی (قوضاعە، طبیئی، مذحج، بەجیلە، بەنو لەحیان) کە زۆر بە خراپی دژایەتی موسڵمانانیان کرد، لە کاتێکدا هەموو ئەمانە لە ئەوس و خەزرەج نزیک بوون و یەک بەرەباب بوون، بەڵام ئەوس و خەزرەج زوو موسڵمان بوون.

هەروەها بە پێچەوانەی قوڕەیش، هۆزی ڕەبیعە کە بنەڕەتی لە (موضەر) نییە ئەوان زوو موسڵمان بوون، کێشەی نێوان موضەر و ڕەبیعە زۆر دوژمنکارانە بوو, هۆزەکانی ڕەبیعە هەندێکیان لە سەرەتادا موسڵمان بوون، بەڵام زۆر زوو هەڵگەڕانەوە لەوانە (بەنو بەکری کوڕی وائیل) (بەنو تەغلوب) (بەنو قەیس) (بەنو حەنیفە) بەگشتی زۆر درێژی نەکەمەوە، عەرەب بریتیی بوون (إلیاس و عیلان) عیلانییەکان هەموو بە قەیسی عیلانی ناسراون، چونکە کوڕی گەورەی عیلان بوو، قوڕەیش لە ئیلیاس بوون، ئەمانە هەمیشە لە کوشتن و بڕیندا بوون و دژی یەکتربوون.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمە بریتییە لە سێ هۆزی سەرەکی لە بەشی عیلان ئەوەش (غەطەفان و بەنو سولەیم و هەوازن).



هەموو دەزانن کە غەطەفان بە درێژایی ٦ ساڵی تەواو دژایەتی سەرسەختی دەوڵەتی پێغەمبەری خوایان دەکرد، هەروەها بەنو سولەیم هیچی کەمتر نەبوو لە غەطەفان بەڵام لە کۆتاییدا هەردوولایان موسڵمان بوون، پێدەچێت ئیسلامەککەیان تا ڕادەیەک ناچاری بووبێت، چونکە زۆر هێرشیان کراوەتە سەر لە ساڵی ٦-٧ کۆچی دا، هەستیان کرد کە چیتر توانای ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی موسڵمانانیان نییە، موسڵمانان جار لە دوای جار هێرشیان دەبردە سەریان و ئەوانیش لە کۆتاییدا سەلامەتییان هەڵبژارد، لە ژێر ئاڵای دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین، چەندجار نوێنەر و وەفدیان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شاری مەدینە لە دوای سەرکەوتنی جەنگی موئتە، هەموو بەیعەتی موسڵمانبوونی خۆیان دابە پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام ئیسلام لە دڵیاندا جێگر نەبوو بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ باش ئەوەی دەزانی بۆیە دەیویست زیاتر دڵیان ڕابکێشێت بۆ خزمەت و ئینتما بۆ دەوڵەتی ئیسلامی ئەمەش لە ڕۆژانی داهاتوودا بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

کەواتە دوو بەشی سەرەکی لە عیلان موسڵمان بوون، ئەگەر ناچارییە ئەوا تەواوی شکستی خۆیان ڕاگەیاندوە لە بەردەم هێزی موسڵمان و دەوڵەتەکەیاندا.



## هەوازن ئاڵای شیرک و هۆزگەرایی هەڵدەکات

ماکوان: ئەوەی ماوەتەوە هەوازنە کە موسڵمان نەبووە لە بەشی عیلان، وا ئەو ئاڵای عیلانی هەڵکرد بۆ دژایەتی موسڵمانان، پێیان وابوو ئەو سەرکەوتنانەی پێغەمبەر خەتەر و فشاری هەیە بۆسەر هەوازن، چونکە شوێنی نیشتەجێی هەوازن زۆر نزیکە لە شاری مەککە و لە دوای فەتح ئەوان کەوتنە سەر خۆیان، دەستیان کرد بە هێز کۆکردنەوە، دوای چەند هەفتەیەک بۆ جەنگکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەککەدا نیشتەجێ بوون، زانیان لە دوای فەتحی شاری مەککە، سەرەی فەتحی ئەوانە بۆیە هەرلەدوای ٢ بۆ ٣ هەفتە لە فەتحی مەککەدا ئەوان سوپایان ئامادەکرد.

جێگای خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەم لەناو هۆزی هەوازندا سێ تیرەی لێ جیا دەبووەوە ئەوانیش بریتیی بوون لە (بەنو نەصر، بەنو سەعد، سەقیف) بێجگە لەمانەش تیرەی تریان هەبوو، بەڵام سەرەکیترین ئەم سێ تیرەیە بوون لە هۆزی هەوازن، (بەنو سەعد) ئەو تیرەیە بوون کە پێغەمبەریان بە منداڵی برد و (حەلیمەی سەعدی) شیری دایە پێغەمبەری خوا ﷺی بە خێو کرد، (سەقیف) زۆرترین و بەهێزترین هەوازن بوون کە شاریان بۆخۆیان دروست کردبوو دوای شاری مەککە، دووەم شار بوون لە ناوچەی نیوەدوورگەی عەرەبیدا کە ناسرابوو بە (طائیف): ئەوانیش لە باشووری ڕۆژهەڵاتی مەککەدا بوون، زۆر لە دێر زەمانەوە لەو جێگایەدا نیشتەجێ بوون، کە ناسراوە بە شاری طائیف.

کاتێک کافرەکان باسی دوو سەرکردەی گەورەیان کرد لە طائیف و مەککەدا کە دوو شاری گەورە بوون خوای گەورە ناوی بردوون لە قورئاندا:

﴿وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ۝﴾ [الزخرف]

واتە: هەروەها بیانوویان گرت وتیان: ئەوە بۆ ئەم قورئانە دانەبەزێنرا بۆ سەر پیاوێکی گەورە لە پیاوە گەورەکانی دوو شارەکە؟! (مەبەستیان مەککە و طائف بووە).



جا ئەو دوو جێگایە طائیف و مەککەیە، هەردوو شارەکە گرنگ بوو، چونکە گەورەترین بتی عەرەب لە ناوچەی سەقیف دابوو بەناوی بتی (عوزا).

سەقیف لە ڕووی ئابووری هیچی کەمتر نەبوو لە قورەیش، بتی عوزە موناففەسەی هەموو بتەکانی تری دەکرد، ئەوەی کە فەزڵی قورەیشی زیاد کردبوو بەسەریاندا تەنها کەعبە بوو.

دەنا لە هەموو ڕووەکانەوە هاوشانی قورەیش بوو لە ڕووی سەربازی و ئابووری پێگەی ئایینی، تەنانەت خاکی طائف لە ڕووی باخ و بێستانەوە زۆر باشتر بوو لە خاکی مەککەی پیرۆز، ئەمەش وای کرد کە هەمیشە لە ڕووی ململانێوە سەقیف و قورەیش لە کێبڕکێ دابن هەمیشە، کاتێک پێغەمبەر صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ چوو بۆ طائیف بۆ هاوکاری و داڵدەنەدانی وەکو قورەیش تەماشایان دەکرد، تەنانەت خەڵکیان زۆر کەم لێ موسڵمان بوو، ئیسلام بوونیان زۆر دواکەوت.

لە ساڵی ٩ کۆچی موسڵمان بوو، ئەوانەی کە موسڵمان بوون لە شاری طائیف بە پەنجەی دەست دەژمێردرێت، بەڵام لە دوو هۆزەکەی تر، هیچ کەس موسڵمان نەبوو، هەتا وەکو ساڵی ٩-٨ کۆچی.

حاڵی عەرەب هەمیشە لە پارچە پارچە بوون دابوو، ئەگەر چی سەقیف و بەنو نەصر و بەنو سەعد هەوازن نین، بەڵام هەمیشە لەیەک دووربوون، بگرە ململانێ و جەنگ لە نێوان خۆیاندا هەبوو، وەکو پیشە هەمیشە عەرەب هەریەکە لە ناوچەی خۆیدا بۆخۆی دەژیا، شاعیرەکانیان دەیانووت ئەگەر جەنگیان کرد لەگەڵ هۆزەکانی دراوسێ جەنگ دەکەین خۆ ئەگەر ئەوانیش نەبوون لەگەڵ براکەی خۆمان جەنگ دەکەین.

(وأحْياناً عەلى بَكر أخينا إذا ما لم نجد الاّ أخانا)

ئەوە حاڵی ژیانی جاهیلی عەرەب بوو بەگشتی، هەوازنیش لەوان بەدەر نەبوو، بەڵکو بە جیاواز هەر تیرەیەو لە ناوچەی خۆی دەژیا، هیچ کات کیانێکی سەربازی و ئابووری و سیاسی یەکگرتوویان نەبوو، هەمیشە پارچە پارچە بوون هەتا وەکو ئیسلام هات.



# مالیکی کوڕی عەوفی نەصری

کۆکردنەوەی هەوازن لە ژێر یەک ئاڵادا

ماکوان: لە ماوەی ڕابردوودا بەتایبەت لە کاتی فەتحی مەککەدا، هەوازن کەسایەتییەک تیایدا سەری هەڵدا توانی تا ڕادەیەک ڕەوشەکە گۆڕانکاری پێ بکات، تەنانەت لەناو هەموو هەوازاندا توانی گۆڕانکاری بکات ئەگەر چی کەسایەتییەکی زۆر بەتوانا بوو، بەڵام هەموو تواناکانی بۆ کاری خراپە و نەرێنی بەکارهێنا، ئەو کەسەش ناوی (مالیکی کوڕی عەوفی نەصری)ە، لە تیرەی نەصرە لە هۆزی گەورەی هەوازن.

نموونەی ئەم کەسایەتییە لە ڕابردوو و ئێستادا زۆر بەدی دەکرێت.

ئەم کەسە لاوێکی بەهێز بوو تەمەنی بە تەواوەتی نەگەیشتبووە ٣٠ ساڵ، بەڵام توانایەکی بەهێزی سەرکردایەتی کردنی هەبوو، خاوەنی چەندین توانای جیاواز بوو، لە بواری سەربازی و پلان داناندا و لە بواری جەنگ و هونەری جەنگ کردندا، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا وتاربێژێکی زمان پاراو و بەهێز و توانای جوانی ڕێزکردنی وشە و ڕستەی هەبوو، زۆر زوو خەڵکی دەهاتە سەر بیروڕای، کاریگەری باشی دادەنا لەسەر خەڵکی.

هەروەها توانای کۆکردنەوەی خەڵکی هەبوو، توانی هەموو هۆزی هەوازن کۆ بکاتەوە، بەڵام بەداخەوە بەکاریان دەهێنێت بۆ حەرام و شەڕ و خراپەکاری.

مالیک کوڕی عەوف دەستی کرد بە کۆکردنەوەی هەموو تیرە و بەشەکانی ناو هەوازن، تا هەموویان کۆبکاتەوە لەژێر یەک ئاڵادا و لەسەر قسەی یەک کەس، ئەمەش لەناو هەوازان دا یەکەم جارە ڕوویدات، هەموو تیرەی بەنو سەعد و سەقیف و بەنو نەصری کۆکردەوە، بەڵام بەسەرکردایەتی مالیکی کوڕی عەوف، ئەم ڕووداوە لە مێژووی عەرەبدا زۆر زۆر شاز و ناوازە و بوونی نەبووە، بێجگە لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوەی توانی کۆی بکاتەوە ژمارەیەکی یەکجار زۆر بوو لە بریتیی بوو لە ٢٥ هەزار سەرباز کە لە مێژووی عەرەبدا و



ناوچەکەدا یەکەم جارە ئەوەندە ژمارەیە کۆببێتەوە بۆ جەنگ، سوپایەکی بێشومار بوو، بەڵام لەسەر چ بنەمایەک ئەو هەموو خەڵکەی کۆکردەوە؟

بێگومان لەسەربنەمای هۆزگەرایی و هەوازنی، دژی محمدی قورەیشی، ئەوە مەنطق و لۆژیکی سوپای هەوازنی بوو، پرەنسیپی سەرەتا و کۆتایی هەوازن بوو.

لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز هۆزی قورەیشی کۆنەکردەوە بۆ بەگژا چوونەوەی هۆزێکی تر، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاست بوو هەمیشە قورەیش دژی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، هۆز و عەشیرەتەکانی تر هاوکار و یارمەتیدەری پێغەمبەر ﷺ بوون، بەڵکو بە درێژایی ٢٠ساڵ جەنگی لەگەڵ هۆز و کەسوکارەکەی خۆیدا بوو، سوپاکەشی بۆ فەتحی مەککە زۆرینەی بریتیی بوو لە (ئەوس و خەزرەج، غیفار و ئەسلەم، بەنو تەمیم و ئەزد و موزینە و جوهیە و غطفان و بەنو سولەیم ...هتد)

لە کاتێکدا غەطەفان و بەنو سولەیم زۆر نزیکترن لە هەوازن تاکو قورەیش، ئەمانە بە گشتی پێکهاتەی سوپای پێغەمبەر ﷺ بوون.

بەڵام تاکە هەوڵ و مەبدئی بڕواپێکردنی هۆزی هەوازن لە لایەن مالیکەوە، تەنها و تەنها هەوازنچێتی بوو.

بەوە کوێری کردن کە هەوازن لەسەروو هەموو عەرەبەوەیە، هۆز و عەشیرەت لەسەروو هەموو شتێکەوەیە، لە پێش هەموو شتێکەوەیە، هەروەکو ئەوانەی ئێستا کە باسی نەتەوەگەرایی دەکەن، پێیان وایە نەتەوە لەسەر و حەق و دادپەروەری و ئیمان و تەنانەت خواشەوەیە، پەنا بەخوای گەورە.

بەڕژەوەندی نەتەوە و نیشتیمان پێش هەموو شتێکە، کە نەتەوەپەرستی هاتە ئاراوە، خوا و ئایین و ئیسلام و شەریعەت لەبیر دەکرێت.

ئەمەش لە تەرازوو و پێوەری خوای پەروەردگاردا هیچ ئەرزش و نرخی نییە.

ئەمەش مانای وانییە کە خەڵکی هۆز و کەس و کار و نیشتیمانی خۆی خۆش نەوێت و لە بیری بکات، ئیسلام داوای شتی وا ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە، خۆشەویستی نیشتیمان و وڵات



ئەرکێکی زۆر پیرۆز و گرنگە، بەڵام بەو مەرجەی لەسەر بنەمای دین و خواناسی و حەق و دادپەروەری نەبێت، واتا نیشتیمان و خاک و وڵات خۆشەویستی فتریە (خۆڕسك)ی خوای گەورە بەخشیویەتی، بەڵام لەبەر ئەوەی من کوردم نابێت، بۆ خاتری کوردایەتی ببمە زەردەشتی یان نەتەوەپەرستی نازی و هەرچی خەڵکی ترە بە چاوی کەم تەماشا بکەم، ناکرێت لەبەر دەمارگیری نەتەوە و خاک، دادپەروەری و حەق لەبیر بکەم، نابێت لەبەر خۆشەویستی نیشتیمان، خۆشەویستی پێغەمبەر و خوا لەیاد بکەم هەر کەس بەرگری لە خاک و وڵاتی خۆی نەکات، سەر شۆڕییە و نەنگیە، بەڵام نەک لە پێناو سەرکردەی دز و جەردە و سەروەت و سامانی خۆی، بەناوی نیشتیمان پەروەرییەوە بۆ گیرفانی خۆیان تێرکردنی ورگ و پاش و پێشیان بە ناوی نیشتیمانپەروەری و نەتەوەوە کوڕی خەڵکی لەناو بەرن و خۆشیان خاوەن باڵەخانە و پارە و سەروەت و سامان بن و خەڵکی وڵات و نیشتیمان برسی و بێکار بن.

خۆشەویستی نیشتیمان و خاک و وڵات و سامان، خوای گەورە بۆی باس کردوین لە قورئان دا، بەومەرجەی هەموو ئەمانە کاری باش بڵاو بکەنەوە بەسەر خواناسی و ئیسلامەتی دا، خوای گەورە لە سورەتی التوبةدا دەفەرمووێت:

﴿قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝﴾ [التوبة]

واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: ئەگەر باو و باپیرانتان و براکانتان و هاوسەرانتان و عەشرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێک کە بەدەستان هێناوە، یاخود بازرگانییەک دەترسن کە شکان و بێ بازاڕی ڕووی تێبکات و خانووبەرە و کۆشک و تەلارێک کە حەز دەکەن لێتان تێک نەچێت و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویستر و نازدارتر بێت لە خوا و پێغەمبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لەپێناو ڕێبازی ئەو زاتەدا، دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا خوای گەورە دێت بە فەرمانەکانیەوە و (تۆڵەتان لێ دەسێنێت)، خوای پەروەردگاریش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی یاخی و لە سنوور دەرچوو نادات.

موسڵمانان خاک و نیشتیمانی خۆیان خۆش دەوێت، بە دەستپاکی و ڕاستگۆیی بەرگری لێ دەکات، چونکە ناهێڵێت خاکەکەی بکەوێتە ژێر دەستی خوانەناس و بێدینەکان و بەرگری لە برا و خوشکەکانی دەکات و دادپەروەری بەرقەرار دەکات.



خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْۚ وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا ١٣٥﴾ [النساء]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە ڕاگری دادوەری بن و شایەتیی بۆ خوا بدەن، با شایەتیەکەشتان زیانی بۆ خۆتان و دایک و باوکتان یان خزمانیش هەبێت، ئەگەر کەسانێک لەوانە دەوڵەمەندبێت یان هەژار خوا بەرژەوەندی ئەوان چاکتر دەزانێت لە ئێوە (واتە بەتەماعی دەوڵەمەندی لە دادپەروەری لامەدەن و بەهۆی نەداریی و بەزەیی بێ جێ لە حەق لامەدەن) نەکەن شوێن ئارەزووی نەفس بکەون لە دادپەروەری لابدەن، جا ئەگەر ئێوە پێچ لێ بدەن (زمان بگۆڕن) و شایەتی ناحەق بدەن، یان پشت هەڵکەن، ئەوە چاک بزانن خوا ئاگادارە بە کارو کردەوەتان.

ڕەوشەکە لای مالیکی کوڕی عەوفی نەصر و نەتەوە پەرستەکان، دەیانزانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕاستە و حەقە بەڵام نەتەوە و هۆزگەرایی کوێری کردن، مالیک خۆی عەرەبزان بوو دەیزانی قورئان حەقە، بەڵام هۆز و گەلەکەی بۆ بەرژەوەندی خۆی ڕێگای پێنەئەدا دان بە حەق و ڕاستی دا بنێت، بەو پەڕی ڕاشکاوانە لە قەیرانێکی ڕەوشتی و ئاکار و دابونەریت دا بوون، بیروباوەڕی جاهیلی بە تەواوەتی زاڵ بوو بەسەریاندا، هەرکەس بانگەوازی بۆ مەبدەئو پرنسیپی مالیکی کوڕی عوف کرد ئەوە بانگەشەی بۆ جاهیلی دەکات.

ئەمەش فەرموودەی کەلامی پێغەمبەری خوایە دەفەرموویت:

هەرکەس جەنگ بکات لە ژێر ئاڵای دەمارگیری و هۆزگەرایی و عەشیرەتەکەی بە کوێرانە یاخود بانگەواز بۆ پەڕگیری و دەمارگیری هۆزگەرایی بکات، یان ئەو بیرۆکەیە سەربخات، ئەگەر مرد یان کوژرا ئەوا بە جاهیلی مردووە. [٢٥]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٥] ـ (مَنْ قُتِلَ تَحْتَ رَايَةٍ عِمِّيَّةٍ، يَدْعُو الى عَصَبِيَّةٍ، أَوْ يَنْصُرُ عَصَبِيَّةً، فَقِتْلَتُهُ جَاهِلِيَّةٌ). رواه مسلم، أبوماجة، النسائي، أحمَد



کەواتە هۆکار بزانێت، یاخود ئامانجی تەنها هۆز و نەتەوە و گەل بێت، یان لە پێناوی دا بە کوێرانە تورەبێت، کە مرد بە مردووی جاهیلەکان هەژمار دەکرێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: هەرکەس بانگەواز بۆ هۆزگەرایی و نەتەوەچێتی بکات لە ئێمە نییە، هەرکەس لە پێناویدا جەنگ و کوشتار بکات بۆ نەتەوە و هۆز و عەشیرەت گەرایی، هەر کەس لەو پێناوەدا مرد لە ئێمە نییە.[٣٦]

ئەمە خاڵی نەرێنی مالیکی کوڕی عەوف بوو کە بانگەوازی بۆ جاهیلی دەکرد واتا هۆزگەرایی بە ناوی سەرخستنی هەوازن بەسەر قورەیشدا، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ڕوون و ئاشکرا ئەو کارە بە جاهیلی و کاری دوور لە ئیسلامەتی دەزانێت.

خاڵی دووەمی نەرێنی ئەم سەرکردەیە بریتیی بوو لە بەکارهێنانی ڕەوانبێژی و جوان ڕێکخستنی وشە بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی (هەوازن)، کێشەی ئەم جۆرە کەسانە وایە کە واقع دەشێوێنن لەبەر چاوی خەڵکی و بە وشە باق و بریق خەڵکی گومڕا و سەرلێشێواو دەکەن، ئەم جۆرە خەڵکانە زۆر ترسناکن بۆ کۆمەڵگە.

بۆ نموونە دەیووت:

هەرگیز محمد جەنگی نەکردووە ئەم جارە نەبێت کە لەگەڵ ئێمەدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە بە واتای ئەوەی، هەموو جەنگەکانی ڕابردوو هیچ قورسایی و نرخێکی ئەوتۆی نەبووە، چونکە ڕووبەڕووی هۆزی ترسنۆک بۆتەوە، بۆیە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، ئەوانەی پێشوو ڕووبەڕوویان بۆتەوە هیچیان جەنگیان نەزانیوە، هێزەکانی ڕابردوو هیچیان پلانی سەربازیان نەبووە، بەڵام ئێمە ئەهلی جەنگ و یەک جەنگاوەرین، با ڕووبەڕوومان ببنەوە بزانە چۆن بەسەریاندا سەردەکەوین.

ئەمەش وتارێکی زۆر سەرەتایی و سادەیە بۆ گەلی هەوازن، بەڵام چونکە هەموو خەڵکی جاهیل و ئاگاداری ڕووداوەکان نەبوون بەم هۆکارە توانی یارییان پێبکات نەیاندەزانی چی لە چواردەوریان ڕوو ئەدات، گەلێکی دابڕاو بوون، نەخوێندەوار بوون، خەڵکی خاوەن فیکری

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٦] ـ (لَيْسَ مِنَّا مِنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ، أَوْ مِنْ قَاتِلِ مِنْ أَجْلِ عَصَبِيَّةٍ، أَوْ مِنْ مَاتَ مِنْ أَجْلِ عَصَبِيَّةٍ).



زۆریان نەبوو، ئیتر گەلێک بەم شێوەیە بێت، نە دەبیستێت نە دەبینێت، ئیتر زۆر ئاسانە هەڵخەڵەتاندنی ئەو جۆرە گەل و خەڵکانە.

بەڵام ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوانەی کە ڕووبەڕوویان بوویەوە بێ هێز و بێ توانابوون قورەیش بێ توانابوو لە ماوەی چەند ڕۆژی ڕابردوو دا سەرکەوتن بەسەریان دا؟

پێشتر لە بەدر و ئەحزاب دا سەرکەوتن بەسەر قورەیش و هۆزەکانی تردا ئایا ئەوان توانای جەنگیان نەبوو؟!

خەڵکی غەتەفان کە لەناو خاکی خۆیان ڕایانکرد و پێشتر چەند بەناوبانگ بوون لە جەنگ و ڕێگریاندا، یەهوود پشتی پێدەبەستن وا هەموو موسڵمان بوون ئایا غەتەفان نەیدەزانی جەنگ بکات؟!

یاخود یەهوودی بەنو قینوقاع و بەنونەضیر و بەنو قورەیزە و خەیبەر و فەدەک و وادیلقورا توانای جەنگیان نەبوو؟!

ڕۆم و هاوپەیمانەکانیان لە عەرەب و نەسارا، خاوەن هێز و ژمارەی لەبن نەهاتوو بوون، چەک و کەرەستەی جەنگیان نوێ بوو، خاوەنی مێژووی سەربازی و جەنگ و پلانی بەهێز بوون، ئایا ئەوان توانایان نەبوو؟!

بەڕاستی هەر گەلێک ئاگاداری هەواڵی دنیا نەبوو زۆر بە ئاسانی چاوبەستی لێ دەکرێت، گاڵتەی پێدەکرێت، زوو ئەدۆڕێت، زوو زەلیل ئەبێت، بەڵێ بە تەواوی مالیکی کوڕی عەوف هەڵیخەڵەتاندن بە قسە هەنگوینییەکانی، بەڵام هەموو ناوەرۆکی ژەهر بوو.

هەر گەلێک ئەوە حاڵی بوو دەبێت باجی گێلییەکەی بدات، لە هەندێک وڵاتی ئێستادا و بەتایبەت لە وڵاتی ئێمەدا مالیکی کوڕی عەوف زۆرن، ئەو میللەتە نازانێت بۆچی شوێنیان کەوتوون، ئەوان پارووی چەور دەگلێنن و گەلیش تەماشای دەمیان دەکات.

خاڵی سێیەمی نەرێنی مالیکی کوڕی عەوف، لەگەڵ ئەوەی قسەی ژەهراوی بەتامی هەنگوین بۆ هەوازن دەکرد، گەلەکەی هەڵخەڵەتاند، بەڵام خۆی هیچ نرخ و بەهایەکی بۆ هۆزی هەوازن دانەدەنا، بە ڕووکەش خۆی وا نیشان ئەدا کە کار بۆگەل ئەکات، بەڵام لە ڕاستیدا



گەل وەکو پووش وابوو لەلایدا، هیچ ڕێگرێک نەبوو تەنها لەبەر بەرژەوەندی خۆی هەموو خەڵکەکەی لەناو بچن، گوێی بە سەروەت و سامانی خەڵکی نەئەدا، تەنها لەبەر خۆی و سەروەتەکانی خۆی.

جا با بزانین ئەم سەرکردەیە چی بە هۆز و نەتەوەکەی خۆی دەکات؟!

فەرمانی کرد بە هەموو هەوازن، کە ماڵ و منداڵ و مەڕ و ماڵاتیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ جەنگ بهێنن، بە ئافرەت و منداڵ و پیر و جوان و تەنانەت پارە و پولیشیان بهێنن بۆ جەنگ، هەموو لە پشتی سوپاوە دابنێن بۆ ئەوەی هانی سوپاکەی بدات بۆ جەنگ، وەکو ئەوەی بڵێن ئەگەر ڕاتانکرد لە مەیدانی جەنگدا ئەوا هەموو ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانتان بۆ موسڵمانانە، ئەو هیچ چاوەڕوانییەکی بۆ شکست نەبوو، ئەمەش ئەگەری هەیە سوپا شکست بهێنێت، بەڵام لای مالیکی کوڕی عەوف گرنگ نییە ژن و منداڵ و سەروەت و سامانیان تیابچێت بۆ بەدەستهێنانی سەروەت و دەسەڵاتی تاکە کەسی.

خاڵی چوارەمی نەرێنی مالیکی کوڕی عەوف: ئەو سەرکردەی یەکەم و کۆتاییە کەس بۆی نەبوو لە قسەیدا هیچ بڵێت بە زمانی ئێستا (دیکتاتۆر) بوو، گوێی بۆ هیچ کەس نەدەگرت، ئەگەر چی خەڵکی خاوەنی زانست و زانیاری بوونایە لە بواری تایبەتی خۆیاندا.

هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێت لە باسی فیرعەون بۆ گەلەکەی:

﴿يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴿٢٩﴾﴾ [غافر].

واتە: هەروەها وتی: ئەی قەوم و هۆزم ئەمڕۆ ئێوە دەسەڵاتتان هەیە بەسەر ئەم ناوچەیەدا و بەئارەزووی خۆتان فەرمانڕەوایی تیادا دەکەن، جا بیر بکەنەوە و تێفکرن کێ دەتوانێت فریامان بکەوێت، کێ دەتوانێت ڕزگارمان بکات، لە تۆڵە و سزای خوا ئەگەر یەخەی پێگرتین؟ فیرعەون قسەکەی پێ بڕی وتی: من تەنها هەر ئەو ڕاو بۆچوونە بەچاک دەزانم و لام پەسەندەکە پێم ڕاگەیاندن، من تەنها ڕێبازی چاک و دروستم نیشانداون!



زۆرێک لەکەسە بە تواناکانی بواری سەربازی هەوازن، داوایان کرد کە واز لەبیرۆکەی بردنی ژن وماڵ و منداڵ مەڕ و ماڵات بهێنێت و بۆچی سەروەت و سامان بخاتە ناو خاک و مەیدانی جەنگ.

مالیکی کوڕی عەوف جەختی لەسەر کردەوە، کە زۆر بە عەجیبی و سەرسەختی فەرمانی پێ کردن کە دەبێت هەموو سەروەت و سامان و کەس و کاریان بهێنن!

تەنانەت لە نێوان مالیکی کوڕی عەوف و سەرکردەیەکی بە ساڵاچووی سەربازی بەناوی (دورەیدی کوڕی صمە) کە تەمەنی زیاتر لە ۱۰۰ ساڵ بوو، زۆری لا سەیر بوو کە هەموو موڵکی هەوازن دەباتە ناو خاکی جەنگ، پرسی لە مالیک بۆ وادەکەیت؟!

مالیک؛ بۆیە وادەکەم، ئەمەوێت هەریەک لە جەنگاوەرەکان، بجەنگن لەبەر ماڵ و منداڵیان و سەروەت و سامانیان.

دورەید: زۆر توڕەبوو! لە وەڵامیدا بەو شێوەیە وتی:

ئەی شوانی مارمێلکە، سوێند بەخوا تۆ هیچ لەبواری جەنگ و سەربازیی نازانیت، واتە بۆ شوانیش دەست نادەیت، چ جای ئەوەی قیادەی سەربازی بکەیت، ئینجا بیرو بۆچوونی خۆی پێ وت، وتی: ئەبێت بۆ شکست خواردوو مەئوایەک هەبێت، خۆتۆ بۆ سەرکەوتن پێویستت بە جەنگاوەر و پیاوانی هەوازن بە خۆیان و شمشێر و قەڵغان و ڕمەکانیانە، خۆ ئەگەر دۆڕایت تۆ هەموو ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامان ئەدەی بە موسڵمانان، پاشان دورەید بەردەوام بوو لە قسەکانی، کەسێکی خاوەن ئەزموون و بە توانا بوو، وتی تۆ لەگەڵ کەسێک جەنگ دەکەیت، پیاوێکی زۆر بەڕێزە، پاشان هەموو عەرەب سەری بۆ دانەواندووە و عەجەم لێی دەترسێت، یەهوودی لەناو بردووە، دورەید توانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەکو خۆی بخوێنێتەوە، بە جوانی بێ زیاد و کەم واقیعەکە بۆ مالیک بگوازێتەوە.

بەڵام مالیک هەر گوێشی پێنەدا و وەکو شوورا وەری نەگرت، بێجگە لە بۆچوونی خۆی بۆچوونی کەسی تری پێ گرنگ نەبوو.

بەڵام دورەید وازی لێنەهێنا و پرسی: ئەی چیت کرد لەگەڵ هۆزی (کەعب و کیلاب)!؟



پرسیارەکەی لە دوو تیرەی تری ناو هەوازن بوو، کە شارەزای باشیان هەیە لە بواری سەربازیدا، چونکە ئەوان خاوەنی سەربازی بەهێزن و چەکی باشن، دەیەوێت بزانێت ئەوان لەبارەی ئەم کارەساتەی مالیک چی دەڵێن؟!

مالیک وتی: ئەوان ئامادە نەبوون بێن بۆ جەنگ.

دورەید وتی: زیاتر بۆم دەرکەوت کە تۆ توانای ئەم جەنگەت نییە، بۆیە ئەگەر ڕای تۆیان پێ باش بووبێت ئەوان دەهاتن، جارێکی تر ئامۆژگاری مالیکی کرد، بەڵام بەتەواوەتی ڕای دورەیدی ڕەت کردەوە، ڕای خۆی سەپاند و وایزانی بە گوێگرتنی دورەید لە شان و شەوکەت و کەرامەتی دێتە خوار، وەکو هەموو دیکتاتۆرەکان ڕای خۆی پێ پەسەند بوو بەردەوام بوو لە کارکردن بۆ جەنگ بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت.

خاڵی کۆتایی لە سلبیاتی مالیکی کوڕی عەوف، هەمیشە یاری بە سۆز و عاتیفەی هۆزی هەوازن دەکرد، شانۆگەرییەکی ئەنجام دا بۆ سەرخستنی قسەی خۆی و بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی تەواو بخاتە سەر ئەو گەلە دابڕاوە، کاتێک هۆزەکە زانیان قسەی دورەید ڕاستە بۆ ئەوەی ماڵ و منداڵ و ئافرەت نەبات و هەموو مەیلی ئەوەیان هەیە بەس تەنها پیاوان بڕۆن بۆ جەنگ، چونکە خۆی شانۆکارێکی بەتوانابوو لە نواندندا درامایەکی تری دروست کرد، بەوەی کە تەواو ئیتر سەرۆکایەتی ناکات و هەڕەشەی لێکردن بە وازهێنان لە پلە و پۆستەکەی چیتر ئەو مەنصەبەی قبوڵ نییە و خۆی دەکوژێت!

مالیک وتی: ئەی هۆزی هەوازن ئەگەر بێتو ڕای خۆتانم نەدەنێ ئەوا بەم شمشێرەی خۆم دەکوژم و لە سکمەوە تا پشتم دەری دەپەڕێنم.

ئیتر گەل هەڵخەڵەتێندرایەوە، بڕوایان بە قسەکانی کرد، وتیان ئەمە گەورە و پیاوچاکمانە و زەعیمی سەرەتا و کۆتاییمانە و خۆشەویستی هەزارەهایە و باوکی ڕۆحی گەلە، ژیان بێ ئەو نابێت، چۆن گەل دەتوانێت بێ ئەو بژی، هەندێک لە ماستاوچی و خەڵکەکانی دەوروبەری بە فێڵ خستە ناو خەڵکەکە تا بڕوایان بۆ دروست بێتەوە، دەست بکەن بە ناڕەزایی و خۆپیشاندان دژی ئەوەی کە کورسییەکەی جێ بهێڵێت.



گەلی نەخۆش لە ترسی ئەوەی مالیک پۆستەکەی جێ بهێڵێت هەموو ڕازی بوون کە مالیکی کوڕی عەوف سەرکردەیان بێت.

ئینجا دورەید زانی ناوەندەکەی بەهێز بوو بۆ کۆتا جار ئامۆژگاری گەلی هەوازنی کرد و وتی: ئەی هۆزی هەوازن، ئەم پیاوە دەستبەرداری عەورەتتان دەبێت مەبەستی ژن و منداڵ بوو، هەرکات شکستی خوارد و لەگەڵ پیاوەکانی بەجێتان دەهێڵێت ڕادەکات بۆ ناو قەڵاکانی سەفیق لە شاری طائیف، جا بەقسەم بکەن و وازی لێ بهێنن و بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی خۆتان.

پیاوێکی وەکو دورەید تێگەیشنێکی زۆر قووڵی هەبوو، دەیزانی هاوشێوەی ئەم سەرکردانە بەشیان ڕاکردن و هەڵهاتن و خۆحەشاردانە، لە کاتی قەیراندا وڵات جێدەهێڵن و خۆیان لە قەڵا و حەشارگەکاندا دەشارنەوە خێرا خۆیان دەگەیەننە وڵاتی دراوسێ و هاوڕێ و سەرکردە و زەعیمەکانی تری وەکو خۆیان.

ئەمەش لە مێژوودا نموونەی زۆر و بێ شومارە کە محمد کوڕی ئەحمەد کە لەوڵاتی ئەندەلوسدا دەرپەڕێندرا، نموونەی جەلالەدینی کوڕی خەواریزم شاە، مەلیک فاروق و شاهی ئێران و سەرۆک کۆماری تونس و...هتد.



# جەنگی حونەین و ئەوطاس

ماکوان: ئەوەی مالیک ویستی ڕوویدا، هەموو پیاوانی هەوازن شوێن مالیکی کوڕی عەوف نەسری کەوتن و بە سوپاکەیەوە دەرچوون بە دەشتی ئەوطاس لە نزیک ناوچە و دۆڵی حونەین.

ئینجا دەستی کرد بە ڕێکخستنی سوپاکەی و کەمینی لە جێگاکاندا دانا و هەروەها چاوی هەواڵگی و زانیاری بڵاو کردەوە، بەناو پێدەشتەکانی حونەین کە موسڵمانان پێیدا تێپەڕدەبن.

خۆی لە ڕاستیدا توانای سەربازی هەبوو زۆریش بە توانا بوو لە ڕووی مەیدانییەوە، هێز و توانای باشی هەبوو بۆ ڕێکخستنی ڕیزی سوپاکەی بە شێوەیەکی زۆر سەربازی پارسەنگ، هەرچی وڵاغەکان بوو لە پێش سوپاکەی دایناوو پیادەڕەوەکانی لە دوایەوە دانا، پاشان هەرچی ئافرەت بوو خستیە سەر وشتر لە دواوە داینان، واتا لە دوای سوپای پیادەڕەوی پیاوان، بۆ ئەوەی موسڵمانان بە زۆریان بزانن، ئەمەش کاریگەری خۆی هەیە لەسەر دڵ و دەروون، پاشان هەموو مەڕ و ماڵاتی لە پشتەوە دانا توانی ڕیزێکی جوان بە سوپاکەی نمایش بکات و زۆر و زەبەند دەریان بخات لە کاتێکدا سوپاکەی بریتیی بوون لە ٢٥ هەزار سەرباز!

تەنانەت موسڵمانان خۆیان دانیان بەوە دانا کە سوپای هەوازن لە ناوچەی حونەین بە هێزترین و باشترین جۆری سوپا و سەرباز بوون.

لەگەڵ ئەوەی باسی نەرێنی مالیکی کوڕی عەوفم بۆ کردن، بەڵام توانایەکی باشی سەربازی هەبوو، لەهەمان کاتدا توانای وتاربێژ و زوو بڕواپێکردنی خەڵکی هەبوو جا لە ڕووی عاطفی و سۆزەوە بووبێت، یاخود ئەقڵ لە دانانی پلانی سەربازیدا زۆر بەهێز بوو، لە ناو عەرەبدا لە ناسراوە بەتواناکانیان بوو.

مالیکی کوڕی عەوف خۆی بە تەواوەتی قایم کرد و سوپای ڕێکخست و جێگای هەڵبژارد، سوپای بڵاو کردەوە بە ناوچەی ئەوطاس حونەین دا، چاوی زۆری لە ناوچەکەدا بڵاو کردەوە، کەمینی زۆری بۆ موسڵمانان دانا و چاوەڕوانی سوپای موسڵمانانی دەکرد، هەواڵگری ئیسلامی و چاوەکانی پێغەمبەر هەواڵیان گەیاندە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.



## خۆ ئامادەکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ غەزای حونەین

ماکوان: بەپەلە هەواڵی ئەو سوپایە گەیاندرایە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش خۆی و سوپای ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای هەوازن.

ئەوکاتە پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککە دابوو، خێرا ناردی بەشوێن هاوەڵی بەڕێزی و بە توانا لە بواری چاودێری سەربازی بە ناوی (عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمی) تا بەجوانی هەواڵ و جێگا و توانای(ئیمکانیەتی) سوپای دوژمنی بۆ بهێنێتەوە.

هەواڵ بە دڵنیاییەوە گەڕایەوە بە پێغەمبەریان ڕاگەیاند کە هەوازن بە ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانەوە هاتوون بۆ جەنگ کردن.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەواڵەکەی بۆ پشتڕاست بوویەوە، دەستی کرد بە پێکەنین و فەرمووی: ئەوانە سبەینێ هەموو دەستکەوت و غەنیمەتی موسڵمانانن بە ویستی خوای پەروەردگار.[٢٧]

پێغەمبەر ﷺ یەقینی هەبوو بە سەرکەوتن، ئینجا دەستی کرد بە کۆکردنەوەی هێز و تواناکان بۆ ئەو سوپا زۆر و بێشومارەی هەوازن، هێز و توانای پێغەمبەری خوا ﷺ کۆی کردەوە لەوپەڕی ئاستی بەرزیدا بوو، بریتیی بوو لە:

یەکەم: بڕیاری دا دەرچێتە دەرەوەی شاری مەککە و لە نێوان مەککە و هەوازن دا جێگایەک هەڵبژێرن، ئەم کارەش ئەوپەڕی حیکمەت و توانای پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەخات، شاری مەککەی هەڵنەبژارد بۆ ڕووبەڕووبوونەوە، چونکە پێدەچێت مالیک نزیک بێتەوە لە شاری مەککە و سەرکردەکانی مەککە دەست تێکەڵ بکەن لەگەڵیدا دژی موسڵمانان، خەڵکی مەککە هەموو چەند ڕۆژێکە موسڵمان بوون، ئەوکات کارەسات ڕوودەدات لە ناوەوە و

٢٧ ـ (فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ : تِلْكَ غَنِيمَةُ اَلْمُسْلِمِينَ غَدًا إِنْ شَاءَ اَللَّهُ).



دەرەوەی شاری مەککە بۆ موسڵمانان، بۆیە دەرچووە دەرەوە بۆ جێگایەکی ئاشکرا لە دووری شاری مەککە.

دووەم: بڕیاریدا هەر ١٠ هەزار موجاهیدەکە لەگەڵ خۆی بەرێت بۆ جەنگ، چونکە هێزی هەوازن یەکجار زۆر بوون, ئەو ١٠ هەزار سەربازەی فەتحی شاری مەککەیان کرد، خاوەن مەعنەویاتی بەرزن!

سێیەم: لە خەڵکی شاری مەککەدا ٢ هەزار سەربازی لەگەڵ خۆی برد، کە پڕە لە موسڵمانە نوێ و ئازاد کراوەکان، ئەوانەی لە دوای لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوون، ئەمەش دیدێکی قووڵی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو کە هەر لایەق بە پێغەمبەرایەتییەتی، ئەگەر ئەو دوو هەزار سەربازە لە ناو شاردا جێ بهێڵێت ئەگەری زۆری هەڵگەڕانەوەیان دەبێت، ئەگەر موسڵمانان تووشی شکست بن لەگەڵ هەوازان دا، دەشێت ئەوانیش لە پشتەوە خەنجەری خۆیان بوەشێنن، ئەو کات مەککە جیادەکەنەوە لە دەوڵەتی ئیسلامی.

هەروەها بردنی ٢ هەزار سەربازی مەککەی پیرۆز واتای ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە خۆیانی نزیک دەکاتەوە، بە دیوێکی تردا واتای متمانە پێکردنیانە لەلایەن پێغەمبەری خواوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، لە هەمانکاتدا جێگیرکردنیانە لە ئیسلامدا و پاشان دەستکەوتی زۆریان لەو جەنگەدا دەستدەکەوێت، ئەگەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەشی بکات بەسەریاندا ئەوا بەدڵنیاییەوە زیاتر بۆ ئیسلام ڕادەکێشرێن.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبنە هێزی زیاتر بۆ موسڵمانان، زیاتر چاوترسێنی هەوازن دەکەن و گومانیش لەوە دانییە کە قورەیش لە ناو عەرەبدا بەگشتی خاوەنی خۆشەویستی و مەکانەتی تایبەتی خۆیانن، جا بەم هۆکارانە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سوپاکەی لە ١٠ هەزار سەربازەوە کردە ١٢ هەزار سەرباز و بەرەو ناوچەی حونەین بەڕێکەوتن.

چوارەم: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ تەنها بەو چەکانەی بە سوپاکەی بوو وازی نەهێنا، بەڵکو کەوتە کڕین و بەکرێ گرتنی چەک لە بازرگانەکانی چەک لە شاری مەککەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا چەکەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو نوێ بوون، بەو پێیەی ئەبو سوفیان لەکاتی بینینی سوپا و چەکەکانیان سەرسام بوو پێیان، هەروەها بەو چەکانەی کە



بە دوو هەزار سەربازە نوێکانی دابوو وازی نەهێنا و کەوتە کڕینی چەک لە بازاردا و بۆ ئەوەی سوپاکەی هیچ پێداویستییەکی چەکی نەبێت، دوو بازرگانی سەرەکی لە شاری مەککەدا ئەو کارەیان دەکرد، صەفوانی کوڕی ئومەییە و نەوفەلی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەڵیب، هەردووکیان موشریک بوون، ئیمانیان نەهێنابوو, پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ داوای چەکی لێکردن بە کرێ و بەئیجار و بەضەمان، واتا گرنتی دان هەرچەکێک بفەوتێت لە بەرامبەر دا نرخەکەی ئەدەن، تەنانەت صەفوان پرسی لە پێغەمبەر: ئایا بە زۆر و داگیرکردن چەکمان لێ دەستێنیت، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: نەخێر؛ بەڵکو بە کرێ و ئیجار و زەمانەت. (بل عارية مضمونة).

بە واتای ئەوەی نایەت کە هەمیشە سەرکردەی سەرکەوتوو، داگیرکەر و شتومەک و کەرەستەی شکستخواردوو بەرێت، ئەگەر چی سەفوان لە سەرکردە شکست و دۆڕاوەکانە، بەڵام وانەی فێری ئەوان کرد، پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کەسێکی دنیایی نییە، هەر وەکو چۆن قوڕەیش پێشتر سەروەت و سامانی موسڵمانانی داگیر کرد، بەڵام پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فێری کردن کە ڕەوشت بەرزی پێغەمبەرایەتی ڕەحمەتی زۆر جیاوازترە لەکافری قوڕەیش، پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دادپەروەرە.

بەم پێیە سوپای ئیسلامی بە هێزترین چەک و توانای خۆی کۆکردەوە بۆ یەکەم جارە لە مێژووی موسڵماناندا، ئەو سوپا بەهێزە کۆ بکرێتەوە.

لێرەدا جێگای خۆیەتی بیرتان بخەمەوە، لەم غەزایەدا پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ داوای چەکی لە موشریک کرد لە دوو بازرگان و دەوڵەمەندی چەک فرۆش هەردووکیان موشریک بوون، تەنانەت خۆشیانی برد بۆ جەنگ بۆ ئەوەی چەکی خۆیان خۆیان هەڵیبگرن.

بەڵام لە جەنگی بەدر و هەندێک لە مەفرەزە و سریەکاندا، ڕازی نەبوو بەهیچ جۆرێک هاوکاری لە موشریک وەربگرێت! خۆی فەرمووی هاوکاری موشریکم ناوێت!؟[٢٨]

لە وەڵامدا دەڵێم: کاتەکان جیاواز بوون، چونکە لە جەنگی بەدردا ئەگەر هاوکاری لە کافر و موشریک و یەهوود وەربگرتایە، هەموو دەمان وت، یاخود دەوترا بە هاوکاری ئەوان

---

[٢٨] - (إنَّا لا نَستعينُ بِمُشرِكٍ).



سەرکەوت، یان ئەوان هۆکار بوون، بە هۆکاری کەمی ژمارەی موسڵمانان هەروەها دەوڵەتەکەیان جێگای خۆی قایم و باش دانەکوتابوو.

بەڵام لێرەدا کەس ناتوانێت بڵێت بە هۆکاری موشریک سەرکەوتن لە کاتێک سوپای موسڵمانان ١٢ هەزار موجاهیدە.

جا لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ زۆر بەلای ئاسایی بوو کە هاوکاری لە موشریک و کافرەکان وەربگرێت.

ئەو دوو کافرەی کە چەکەکانیان پێ هەڵگیرا، هیچ غەنیمەتێک نابەن لە جەنگدا بەڵکو تەنها کرێی هەڵگرتنی چەک و چەکەکانیان پێ دەدرێت.

خاڵی پێنجەم: لە شەواندا بەردەوام پاسەوان هەبوو لە سوپاکەدا، بۆ ئەوەی هیچ شتێکی نەخوازراو ڕوونەدات، سەرۆکی پاسەوانی سوپاکە هاوەڵی بەڕێز (ئەنەسی کوڕی ئەبی حەرسەد) بوو.

خاڵی کۆتایی: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر گرنگیدا بە باری دەروونی سوپاکەی، زۆر مژدەی سەرکەوتنی پێدان و فەرمووی: هەموو سوپای هەوازن دەبێتە دەستکەوت و غەنیمەت بۆ موسڵمانان.

موسڵمانان کە بەرەو حونەین ڕۆیشتن باری دەروونیان زۆر بەرز بوو، چونکە پێشتر سەرکەوتنی زۆریان تۆمار کردبوو، هەروەها شاری مەککە فەتح کرابوو کە گەورەترین ناوچەی عەرەبی بوو، بەهەرحاڵ موسڵمانان هەموو پێداویستی ماددی و چەک و هێزیان کۆکردەوە، هەموو هۆکارەکانی سەرکەوتنیان گرتەبەر، سوپاکە بەم شێوەیە بوو لە کاتی دەرچوونی بۆ دۆڵی حونەین.



## گەیشتنی سوپای موسڵمانان لە دۆڵی حونەین بە هەوازن

ماکوان: لە ٦ی شەواڵی ساڵی ٨ کۆچی، هەوازن لە ناوچەی ئەوطاس و حونەین سەربازگەی خست، سوپای موسڵمانان ڕۆژی ١٠ مانگی شەواڵ گەیشتنە حونەین، لە ٦ شەوال دا دەرچوون.

سوپای موسڵمانان زۆر بە شێوەیەکی جوان و پڕ هەیبەت دەڕۆیشتن، موسڵمانە نوێیەکان، تووشی نەخۆشی لەخۆڕازی بوون بوبوون، ئەم نەخۆشییە زۆر ترسناکە، بەداخەوە زۆر زوو بڵاو دەبێتەوە، خێرا لەناو سوپاکەدا بەگشتی بڵاو بوویەوە، کە ئەمڕۆ هەرگیز شکست ناخۆن، چونکە هێزیان زۆرە و زۆر و زەبەندن سەربازەکانیان ١٢ هەزار سەربازە، ئەم نەخۆشییە وەکو چۆن پووش و پەڵاش گڕی تێ بەردەبێت ئاوا بەناو هەموو سوپاکەدا هەموو موعجیب و سەرسام بوون بەخۆیان.

بڕوایان وابوو کە ئەمڕۆ بەتەواوەتی بە هۆکاری هێز و چەک و ژمارەیان بەسەر هەوازن دا سەردەکەون، ئەمە تەنها قسەیەکی سەر زارەکی نەبوو، بەڵکو لە دڵەوە سەرچاوەی گرتبوو.

کە ئەم جۆرە قسانە لە دەمی هاوەڵان دەرچوو، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لای سەخت و گران بوو، زۆر خەمی خوارد و غەمبار بوو، بە ڕوخساریەوە خەم و خەفەت دیار بوو، زانی شتێکی نەخوازراو و سەخت و خەتەرناک ڕوونەدات، دەیزانی کێشەیەکی گەورە بە هۆکاری ئەو نەخۆشییە بەسەر سوپاکەدا دێت!

بەڵام لە کاتێکدا ڕستەکەیان تەواوە زۆر و ئازان لە پێکهاتە(تەرکیب) و مەعنادا هیچ کێشەی نییە، تەنانەت خودی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: سەرکەوتن بەسەر ١٢ هەزار سەربازدا نایە لەبەر کەمی، واتا سوپا بە هۆکاری کەمی شکست ناهێنێت ئەگەر گەیشت بە ١٢ هەزار. [٢٩]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٩] ـ (قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): وَلَنْ يَغْلِبَ اِثْنَا عَشَرَ أَلْفًا مِنْ قِلَّةٍ) أبُو داود، الدارمي، الحاكم، الترمذي.



هەرگیز بە هۆکاری ژمارەی سوپا ناشکێن، بەڵام هۆکاری تر زۆرە بۆ شکستی ئەو سوپایە، ڕاستە لە ڕووی ماددییەوە شکست دەشێت بخوات یاخود لە ڕووی دڵ و دەروون و مەعنەویاتەوە، واتا لە ڕووی پلانی سەربازی یاخود جۆری چەک یان لێنەزانینی قیادە، هەر هۆکارێکی تری ماددی هۆکاری شکستە، بەڵام لێرەدا سوپا هەموو ئەمانەی تێدا بەرجەستە بووە، سوپاکە لەوپەڕی ئاستی بەرز دایە.

ئەوەی کە ترسانەکە سوپاکە تووشی نەخۆشی سەرسام بوون بە خۆیان بوون، خوایان لە بیرکرد کە سوپای موسڵمانان بە هۆکاری خواناسی سەردەکەوێت نەک بە هۆکاری ماددی، هەموو پشت و پەنایان بە هۆکاری خۆیان بەست بەڵام خوای گەورەیان لەبیر کرد، وایان زانی خۆیان سەرکەوتن بەدەست دەهێنن و لە بیریان چوو خوای پەروەردگار سەریان دەخات.

بە دڵنیایەوە ئەگەر لە هاوەڵان بپرسی ڕاستە وخۆ سەرکەوتن لەلای کێیە؟ لای خۆتانە یان لای پەروەردگار؟

وەڵامەککەیان ڕاستەوخۆ و بێ دوودڵی دەڵێن خوای پەروەردگار.

بەڵام هەست و شعووری ناخ و نهێنی دڵ و دەروونیان سەرسام بوون بوو بە خۆیان کە فەتحی مەککەیان کردبوو بە چەند سەعاتێک، تووشی غرووری نەفسی بوبوون، ئەو هەست و شعوورە زۆر جار شەیتان بۆی زیاد دەکات و ئیمان لەبیر خاوەنەکەی دەباتەوە، بەڵام دەبێت ئەوە بزانیت متمانە بەخۆبوون، زۆر جیاوازە لەگەڵ سەرسام بوون بەخۆت، دوو هەستی جیاواز و شعووری جیاوازن.

متمانە بەخۆبوون هەستێکی زۆر چاکە و شەرعەن داواکراوە، بەڵام سەرسام بوون بەخۆت لە خۆڕازی بوون زەمکراوە.

سوپا پێویستی بەوە هەیە بۆ سەرکەوتن متمانەی بەخۆی هەبێت، بەڵام نەگاتە ئەو ئاستەی تەوەکولی بە هێز و نەفسی خۆی هەبێت، کەواتە جیاوازی نێوان متمانەبەخۆبوون و سەرسام بوون و لە خۆڕازی بوون نێوانیان یەک تاڵە مووە، خوای گەورە خاوەنەکەی موەفەق دەکات ئەویش بە خواناسی و زیکر و دوعا و پاڕانەوە و گەردەنکەچی لە بیرنەکردنی خوای پەروەردگار، هەرکەس خوای لەبیرکرد، خۆی لەبیر دەچێتەوە خوای پەروەردگاریش لەبیر دەکات، بەواتای



ئەوەی زەلیلی دەکات و زاڵم بەسەریا زاڵ دەبێت، یان کۆتایی بەرەو ئاگری دۆزەخە، خوا پەنامان بدات.

واتە سوپاکە دیار بوو کە متمانە نەبوو، بەڵکو سەرسام بوون بەخۆیان زۆر زیاد لە پێویست بوو، لە سنوور دەرچوون، نەفسیان زۆر زیاد بوو بەسەریاندا، هەر لەبەر ئەوەش بوو پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی خەم و خەمباری بوو، هەر ئەو ڕستەیەی بۆ دووبارە کردنەوە بۆ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن کە تووشی چ نەخۆشییەک بوون لە دڵ و دەروونددا، بەڵام بەداخەوە تەوەکولیان بە ژمارەکەیان بوو، خوای گەورە باسی نەخۆشییەکەیان دەکات و دەفەرمووێت:

﴿... وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ ...﴾ [التوبة]

واتە: ...لە ڕۆژی حونەینیش کاتێک کە زۆریی ژمارەی خۆتان سەرسامی کردبوون...

ڕۆژی ئامادە بوونتان لە ناوچەی حونەین زۆر سەرسام بوون بە ژمارە و زۆریتان.

ئەم نەخۆشییە تەنها دوو هەزار سەربازە نوێکەی نەگرتەوە، بەڵکو هەموو سوپاکە وەکو ڤایرۆسی کوشندەی (کۆرۆنا) تەشەنەی کرد تێیاندا، تا گەیشتە ناو هاوەڵی سەرەتاییش.

کارێکی زۆر ترسناکە خۆشەویستی دونیا و حەسەد و ئیرەیی، خۆ بەزل زانی و سەرسام بوون بە خۆت، هەموو ئەمانە نەخۆشی کوشندەن ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێت بڵاو دەبێتەوە وەکو پەتا (وباء) و وەبائوو ڤایرۆسی تاعون و کۆرۆنا و...هتد.

لەم جێگایەدا بە شێوەی پێویست و بە گوێرەی پێویست، فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ڕووی نەدا، ئەوەی ڕوویدا بەسەردا تێپەڕی، سوپا هەموو بەشدار بوو تێیدا، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خاوەنی ئیمانی کامل نەبوون، هەندێک لە سوپاکە لە خۆشی ئەوانەی کە کەم بوون زۆرینەیان گرتەوە، خوای گەورە لە باسی مونافیقەکاندا دەفەرمووێت:





﴿لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [التوبة]

واتە: ئەوانە ئەگەر دەرچوونایە و لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆ ئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لە سستی نەبێت (لە ئاشووب و گێرە شێوێنی زیاتریان لە دەست نەدەهات) و دەستیان دەکرد بە چرپ و چاپ لەناوتاندا و دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی کەلێنێک، بەئاواتی ئاشووب هەڵگیرساندن لە نێوانتاندا، کەسانێکیش هەن لەنێو ئێوەدا، گوێیان بۆ دەگرن، خوایش چاک ئاگادارە بە کاروکردەوەی ستەمکاران.

ڕاستە ئەوانە مونافیق نەبوون، بەڵام لە ئیسلامدا نوێ بوون، لە سەردەمی جاهیلییەوە نزیک بوون، هەندێکیان دوودڵبوون لە ئیسلامەتی و هەندێکی تریان بەناچاری هاتبوون هەندێکیتر لە ترساندا موسڵمان بوبوون.

بۆیە بە گوێرەی پێویست پەروەردە نەکرابوون، بە ئەزموونی ئیمان و خواناسی و دادپەروەر نەبوو بوون، هەربۆیە گوێبیستی ئەوانیتر بوون، خوای گەورە لە حەقیاندا دەفەرمووێت (وفیکم سماعون لهم).

موسڵمانان بەم گیان و ڕۆحەوە بەرەو حونەین ڕۆیشتن دڵنیابوون لە سەرکەوتن نەک لەبەر ئەوەی وا هەستیان دەکرد کە خوای گەورە سەریان دەخات، بەڵکو شانازییان بە ژمارەیانەوە دەکرد.

ئەمەش وای لێکردن کە زۆر بێ منەتانە ڕێگای سەربازی خۆیان نەگرت و چەند کەمتەرخەمییان کرد لە ڕووی ستراتیژی سەربازی، هەواڵگری ئیسلامی بە گوێرەی پێویست هەڵنەستا بە کاری خۆی زۆر کەمتەرخەم بوو، چونکە لەخۆڕازی بوون، کەمینەکانی مالیکی کوڕی نەصریان بۆ ئاشکرا نەبوو لە دۆڵی حونەین دا، پاشان چوونە ناوچەیەک بێ لێکۆڵینەوە و تەماشاکردنی مەیدانی و پلانی باشیان دانەڕشت بۆ جێگاکە.

ئینجا زۆر تەمەڵ بوون لە ڕێگا بڕیندا بە ماوەیەکی یەکجار زۆر ڕێگایەکی کورتیان بڕی، لە ڕۆژێکدا سوپا دەبوو ٥٠ کم ببڕیایە، وەکو هاتنیان لە شاری مەدینەوە بۆ مەککە کە ٥٠٠ کم بە ١٠ ڕۆژ ئەو ڕێگایەیان بڕی، بەڵام حونەین ٢٠ کم بوو بە ٤ ڕۆژ بڕیان، ئەمەش مانای تەمەڵی و



لە خۆرِازی بوونیان بوو لە ٦ شەواڵ دەرچوون لە ١٠ مانگ گەیشتنە حونەین، کە پێویست بوو ئەو رِێگایە بە نیو رِۆژ ببرِن، هۆکارەکەی دەگەرِێتەوە بۆ ئەوەی وتمان زۆر دڵنیابوون بە سەرکەوتن.

بەڵام مالیکی کورِی عەوف پێش ئەوان گەیشت و جێ پێی خۆی قایم کرد لە ناوچەکە دا، ئەگەر تەماشا بکەین موسڵمانان بۆیە سەرکەوتن لە جەنگی بەدر پێش دوژمنیان گەیشتنە ناوچەی بەدر.

هەڵەیەکی تری زۆر گەورە، کە هۆکاری تەنها و تەنها دەگەرِێتەوە بۆ سەرسام بوون بە ژمارە و هێزیان، زۆر لە دەشتی حونەین دا مانەوە کە هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو هەموو سەرکردە سەربازییە لەو سوپایەدا بوو، نموونەی خالیدی کورِی وەلید و عەلی کورِی ئەبو تاڵیب و زوبێری کورِی عەووام و طەڵحەی کورِی عوبێدوڵڵا و ئەبو عوبێدەی کورِی جەراح و حوبالی کورِی مونزیر و سەعدی کورِی ئەبی وەقاص...هتد

هەروەها سوپاکە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکردایەتی دەکرد چۆن کەوتنە ئەو هەڵە گەورەیەوە، چۆن ئەمە رِوویدا؟!

لەلای من تەنها و تەنها یەک تەفسیر هەڵدەگرێت، ئەویش خوای گەورە دەیەوێت سەرنجیان رِابکێشێت بۆ ئەو هەڵە گەورەیە کە دڵ و دەروونیان تووشی ببوو، هەربۆیە پەردە بەسەر چاو و گوێیان دا هاتبوو.

لە کۆتاییدا فەرمانی خوای پەروەردگارە، چونکە خوای گەورە دەیتوانی بە پێغەمبەرەکەی بڵێت بە وەحی، بە وتارێک ئاگاداریان بکاتەوە، بەو کارەساتەی تێی کەوتوون، خۆ ئەگەر بە وتار ئاگاداریان بکاتەوە، ئەوا لەوانەبوو بۆ ماوەیەکی کاتی چارەسەر بن، بەڵام نەخۆشییەکە سەری هەڵ ئەدایەوە بەرەو کارەساتی گەورە تر و نەهامەت تری دەبردن.

پێویستە ئەو موصیبەتە موسڵمانان بهەژێنێت، دید رِوونیان بداتێ و وێنەی هەڵەکەی خۆیان لەبەر چاودا رِۆشن بێت، ئەگەر موصیبەت رِوویدا موسڵمانان کەوتنە ناوی، هێزێکی پەروەردەیی ١٠٠٠ جار لە وتار و قسە و ئامۆژگاری کاریگەری زیاتر و زیاتر دەخاتە سەر



خاوەنەکەی، ئەوەی لە مەیداندا بەسەریان دادێت زۆر جیاوازترە لەوەی کە بە وتە و قسە بۆت دەگێڕنەوە.

خوای پەروەردگار دەیویست و ئیرادەی وابوو کە موسڵمانان چێژی ئەو موصیبەتە بکەن کە بەهۆکاری سەرسام بوون بە خۆ تووشیان بووە.

ئەمەش پەروەردە و سەر لە نوێ زیندو کردنەوەی ئیمان و خواناسییە هەموو ئەم باسانە خوای گەورە لە قورئاندا بۆی باسکردووین بۆ ئەوەی هەرگیزا و هەرگیز لەبیرمان نەچێتەوە، تا ڕۆژی قیامەت، وانەیەکە فێرمان دەکات لە جەنگی حونەین، هۆکاری سەرکەوتن و شکست چی بوو.



# وانەکانی ڕۆژی جەنگی حونەین

ماکوان: هەر بە گەیشتنی سوپای موسڵمانان بۆ دۆڵی حونەین لە یەکەم چرکەساتی دا کارەسات ڕووی دا، لە هەموو لاوە تیر وەکو باران بەسەریاندا لێزمەی دەکرد، ڕمەکانیان لە هەموو جێگاوە سەری دەرهێنا ئەسپەکانی هەوازن هەموو ڕووە و موسڵمانان هاتن، هەمو مەفرەزە و بەشی سوپاکان لێرە و لەوێ بۆ موسڵمانان دەرپەڕین، لە هەموو لاکانەوە چواردەوری موسڵمانانیان گرت، موسڵمانان هەرچی هێز و توانایان هەبوو لە دەستیان دا هیچ عەزم و ورەیان نەما بە تەواوەتی مەعنەویاتیان ڕووخا.

٤ ڕۆژ بوو لە دڵ و دەروونیاندا سەرسامی خۆیان و سەرکردەکانیان و هێز و بازوو و چەکیان تەنگی پێ هەڵچنیبوون، بەڵام لە چرکەساتدا تووشی ڕووخان و شکست بوون، ئەو هەموو ئازا و چاونەترسی لە جەنگەکاندا وەکو شێر هەڵمەتیان دەبرد، هەموویان یەک بڕیاریان دا کە لە خاک و مەیدانی جیهاد دا هەڵبێن!

هەڵهاتنەکەشیان زۆر بێسەروبەری و عەشوائی بوو، بۆ ئەوە نەبوو جارێکی تر خۆیان کۆبکەنەوە بۆ جەنگ، بۆ ئەوە بوو، کە ناتوانن بەرگری بکەن، هیچ توانا و هەوڵێک نەماوە لایان، لە تاو ڕاکردن هیچی تریان بۆ نەدەکرا.

تووشی کارەساتێک بوون زۆر لە ئوحود موصیبەت تر و ترسناک و قورستر بوو لەسەریان، لە ئوحود دا هەندێک لە هاوەڵان سەرپێچیان کرد، بەڵام هەندێکیتر مانەوە لە مەیدانەکەدا جیهادیان کرد و هەندێکیش تا کۆتایی شەهید بوونیان لە بەرگریدا بوون، بەڵام لە ١٢ هەزار سەربازەوە، تەنها ١٠ بۆ ١٢ کەس ڕایان نەکرد.

پێوەر بە ئوحود ئەم کارەساتە زۆر گەورە یە ١٢ هەزار کەس ١٢ کەس ڕانەکات واتا لە ١٠٠٠ کەس ١ کەس ڕانەکات، بە هەموو پێوەرێک جەنگی حونەین ترسناک و موصیبەت بوو.

موسڵمانان ئەو بیابانە (سەحرایە) یان لێ تەسک ببوەوە نەیاندەزانی چۆن ڕابکەن، بە زمانیحاڵ هەموو دەیانوت نەفسی نەفسی.



خوای گەوەر ئەو ڕەوشەمان بۆ باسدەكات و دەفەرمووێت:

﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾ [التوبة]

واتە: سوێند بێت بێگومان خوای گەورە لە زۆر شوێن سەری خستن (بەسەر بێباوەڕاندا)، لە ڕۆژی حونەینیش كاتێك كە زۆریی ژمارەی خۆتان سەرسامی كردبوون، جا (بینیتان) ئەو زۆریە هیچ فریاتان نەكەوت و بێ نیازی نەكردن، زەویش چەندە فراوانە لێتان هاتەوە یەك و تەنگبوەوە، لەوەودوا هەموو پشتان هەڵكرد و ڕاتانكرد.

موصیبەت ئەوەیە كە خوای پەروەردگار سابت و جێگری لە دڵ و دەروونندا دووربخاتەوە و ترس بخاتە ناو دڵان، جا تاك بێت یان كۆمەڵ یاخود سوپا خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ [إبراهيم].

واتە: خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەكات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دنیادا، لەسەرەمەرگ و لە قیامەتیشدا، (باوەڕی دامەزراو فریایان دەكەوێت) و گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بەئیمانەوە دەمرن، لەولاشەوە هەر ئەو خوایە ستەمكاران گومڕا دەكات و ئەوەی پەروەردگار بیەوێت هەر ئەوە پێش دێت و دەكرێت.

هەموو خەڵكی پێویستی بە سابت و جێگیربوونی ئیمان و سابت لە هەموو كارێكدا تەنانەت پێغەمبەرانیش پێویستیان بە سابتە.

﴿وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَـٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا﴾ [الإسراء]

واتە: خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پایەدارو دامەزراو نەكردایە، ئەوە بەڕاستی نزیك بوویت (بەمەزەندەی خۆت، بۆ بەرژەوەندیی بانگەوازەكەت) كەمێك بە لایاندا مەیل بكەیت و بەدڵی ئەوان بكەیت!



خوای پەروەردگار سەبات نابەخشێت ئەگەر مرۆڤ پەیوەندییەکی ڕاستی بە خواوە نەبێت، دەبێت نییەتەکەی بۆ خوای پەروەردگار بێت، دڵودەروونی دامەزراو بێت، خاوەن کرداری چاک و جوان بێت، وێستگەی حونەین زۆر ترسناک و خەتەرناک بوو.

بە دڵنیایەوە داهاتوو بۆ خواناس و موسڵمانانە.

﴿... وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ [الأعراف]

واتە: ...سەرئەنجامیش هەر بۆ پارێزکارانە.

سوهەیل زۆر سەرسام بوو بە قسەکانی و وتی: سوێند بە خوا تۆ ئەی عیکرمە زۆر نوێی لەم دینە و خەڵکەکەی کەچی ئاوا بیردەکەیتەوە؟[٣٠]

بە واتای ئەوەی تۆ زۆر نوێیت لەم ئیسلامەدا پێشتر خەریکی پەرستنی بت و هوبەل بوویت چۆن ئەم یەقینەت بۆ دروست بووە؟!

عیکرمە زۆر بە ڕاشکاوانە وتی: یا باوکی یەزید، ئێمە ئیتر لەسەر باطڵ و هیچ بووین، عەقڵمان ڕۆیشتبوو، بەردمان دەپەرست، کە هیچ جۆرە قازانج و زیانێکی نەبوو بۆمان.

لەو حاڵەتانەوە هەڵوێستی مرۆڤ دەردەکەوێت و زۆرینە خۆیان ڕانەگرت و ڕایانکردن لە واقعی جەنگ و ڕەوشەکە، ئەم ڕووداوە ناخۆش و موصیبەتانە لە ئوحود دا ڕوویدا هەر هەمان شێوەیە کە لە حونەین ڕوویداوە، بەڵام بە شێوەی پێچەوانە، لە ئوحود دا بە شێوەیەکیتر بوو سەرەتا سەرکەوتن و لە کۆتاییدا تووشی موصیبەت بوون، بەڵام لە حونەین لەسەرەتادا شکست و پاشان سەرکەوتن، ئەی سەرکەوتن چۆن هات لە دوای ئەو قەیرانەی کە ڕوویدا؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٠] ـ (وَاللَّهُ إِنَّ عَهْدَكَ بِخِلَافَةٍ لِحَدِيثٍ).



# گەڕانەوە بۆ سەرکەوتن دەرچوون لە قەیران

ماکوان: لە قەیرانی ئاوا گەورەدا زۆرێک خۆی لە بەرپرسیارێتی ئەدزییەوە، جا جیهاد بێت یاخود هەر کارێکی تر بێت، ئەی چارەسەر چییە و چۆن دەربازیان بێت لەم قەیرانە؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەنگە لەم کارانەدا و فێرمان دەکات، چونکە بەڕاستی بەجێی هێشتووین لەسەر سپیایی بێ لەکە و پەڵە ڕۆژ و شەوی وەکو یەک ڕووناکە، خەڵکی خواناس و ئیماندار تێیدا هەڵناخلیسکێت، هەمیشە مەنهەج و وانەکانی ڕوون و ئاشکرایە و فێرمان دەکات چۆن لەم جۆرە کێشانە دەرباز بین.

پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم کار کردنی خۆی وەکو سەرکردە لە خاکی جیهاد دا مایەوە، پێغەمبەران بۆیان نییە لە جەنگدا ڕابکەن، بە هۆکاری ئەوەی پێغەمبەرە، پاشان ئەگەر سەرکردە ڕایکرد بە دڵنیاییەوە سەرباز خۆی ناگرێت، ئەگەر سەرکردە خۆی لە بەرپرسیارێتی شاردەوە، هیچ کەس ناتوانێت بەرپرسیارێتی هەڵبگرێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە بە سابت و جێگیری لە خاکی حونەین دا، نەک هەر ڕاینەکرد، بەڵکو بە ئەسپەکەیەوە ڕووە و کافرانی هەوازن دەڕۆیشت، هەموو ڕایاندەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ هێرشی دەبرد بە سواری ئەسپەکەی بەرەو دوژمن غاری ئەدا بە پێچەوانەی سوپاکەی.

عەباس لەو کەسانە بوو کە لە خاکی جیهاد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ مایەوە، دەڵێت بە پەلە ڕامکرد بە دوای وڵاغەکەی پێغەمبەر ﷺ دا ڕێشمەککەی بگرم و بە تەنها زۆر نزیک نەبێتەوە لە ناو سوپای دوژمن، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو سوپای هەوازن و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد (من پێغەمبەرم درۆناکەم، هەروەها من کوڕی



عەبدولموتەڵیبم، کۆببنەوە لە دەورم ئەی خەڵکینە، من پێغەمبەری خوام من کوڕی عەبدوڵڵام.[31]

بەڕاست لەسەر ئەم زەویەدا هاوشێوەی پێغەمبەری ئێمە هەیە؟

ئەستەمە هاوشێوەی، هەرچی لە مێژوو و پیاوانی سەرکردە و توانامەندەکان هیچیان ناگەنە ڕۆژێکی ژیانی، تەماشای ئەو هەڵوێستە بکەن، هەموو سوپا لە دوژمن ڕادەکات کەچی بەتەنها هێرش دەبات، خۆی گیانفیدا دەکات لە پێش سەربازەکانی، ئەمە وانەیەکی یەکجار قوڵ و گەورەیە، هەروەها پەروەردەیەکی زۆر پێویستە بۆ سەرکردە، بۆچی ئاڵا ئەداتە دەست بە هێزترین کەس و ئازاترین کەسی سوپاکە، بە هۆکاری ئەوەی ئاڵاکە سەربازەکان لە دەوری دا جەنگ دەکەن لۆگۆ و ڕەمزیانە ئەگەر ئاڵایەک ئەوەندە گرنگ بێت داخۆ سەرکردە کە سەرپەرشتی جەنگ و سوپا دەکات چەند کاریگەری هەبێت.

ئەگەر هەرکام لەمانە ڕایکرد ئەوا سوپا کۆتایی دێت، یاخود کەسێکی ئازا کوژرا لە سوپاکەدا کاریگەری زۆر بەجێدەهێڵێت لەسەر دڵ و دەروونی سوپا و مەعنەویاتیان، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ نیشانی دان کە پێغەمبەرەکەتان توانیویەتی خۆی ڕابگرێت بەتەنها ئەی ئێوە بۆ ڕادەکەن چی ڕوویداوە لاتان.

هەڵوێستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووبەڕووبوونەوەدا هەموویانی شەرمەزار کرد، هەڵوێستی یەک مرۆڤی سەرکردە دەشێت هەزاران خەڵکی ڕێکبخاتەوە، هەڵوێستی پێغەمبەر نامە و پەیامە هەروەها وانەیەکی لە بیرەکراوە بۆ هەموو بەرپرسێکی موسڵمان، کە هاوشێوەی ئەو پێشەنگە هەنگاو هەڵبنێنەوە لە کار و کردەوەیان دا، سەباتی سەرکردە واتە سەباتی سەرباز، بەرخودان و تەضحیە واتا بەرخودانی گەل.

ڕاوەستانی گەل لەگەڵ قائید دا، ئەمە هەنگاوی یەکەمی بوو کەنای بۆ دەرچوون لەو قەیرانە، کە سەرکردە دەبێت پێشەنگ بێت، ئەوەی پێویستە سەرەتا خۆی ئەنجامی بدات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[31] ـ (أَنَا اَلنَّبِيُّ لَا كَذِب، أَنَا اِبْنُ عَبْدِ اَلْمُطَّلِبْ، هَلُمُّوا إِلَيَّ، أَنَا رَسُولُ اَللَّهِ، أَنَا مُحَمَّدْ بْنُ عَبْدِ اَللَّهْ). أَيْنَ أَيُّهَا اَلنَّاسُ ؟ هَلُمُّوا إِلَيَّ، أَنَا رَسُولُ اَللَّهِ، أَنَا مُحَمَّدْ بْنُ عَبْدِ اَللَّه).



هەنگاوی دووەم: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ویستی ئەوانە لە خۆی کۆبکاتەوە کە جێگای متمانەن، چونکە سەرکردە بەبێ سەرباز ناتوانێت هیچ کارێک ئەنجام بدات، ئەم کارە زۆر گرنگ و سەخت بوو لەو کاتەدا، هیچ سەرکردەیەک بە تەنها ناتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت ئەگەر ئوممەتەکەی لەگەڵیدا نەبێت، ئیتر بە گوێرەی توانای خەڵکی و دابەشکردنی کارەکانیان بۆ ئەرکی کۆمەڵسازی، بە گوێرەی پەروەردەکردنیان و مێژوویان لە کاری ئەم ئیسلامەدا، هەر بۆیە بەم پلەبەندییە مرۆڤی سەرکردە ئەتوانێت متمانە بە خەڵکەکە بکات، هەندێک هەر متمانەی پێ ناکرێت، سەرکردەی زیرەک و بە توانا زوو هەست بە توانای چواردەوری دەکات، دەزانێت کاری سەخت و دژوار تەنها بە کۆمەڵێک لە پیاوان پیادە دەکرێت، هەموو خەڵکی وەکو دڵسۆزانێک نین کە هەرچی کاری سەخت بوو بیخەنە سەر شانی خۆیان، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بە گوێرەی توانای سەربازەکان کاریان پێدەبەخشێت، ئەم جۆرە کارەی پێغەمبەریش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕێژەی (نسبەتی) سەرکەوتن تێیدا زۆر گەورەیە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵسا بە چەند پلانێک، ناتوانێت خێرا بانگی ١٢ هەزار سەرباز بکات بۆ چواردەوری، ئەگەر چی ڕایانکرد، بەڵام چونکە پەروەردەی دەستی پێغەمبەرن هەندێکیان باش لە ئیسلام تێگەیشتوون خێرا دەگەڕێنەوە بۆ مەیدانی جیهاد، ئەوانە کێن، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هاواری کرد لەو کۆمەڵەی کە خاوەنی بەیعەتی ڕەزوان بوون لە غەزوەی خەیبەر هەموو بەشدار بوون، خوای گەورە لە هەمووان ڕازی بوو، بەهەشتی پێبەخشیون، ئەستەمە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بانگیان بکات، نەگەڕێنەوە بەدەم بانگی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، خوای گەورە لە حەقیان وا دەفەرمووێت:

﴿۞ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾﴾ [الفتح]

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی خوا ڕازیی بووە لەو باوەڕدارانەی کاتێک پەیمانیان لە گەڵدا بەستیت لەژێر درەختەکەدا خوا خۆیشی ئاگادار بوو بەوەی لەدڵەکانیاندا هەیە (لەنیاز پاکی و دڵسۆزی) هەر بۆیە ئارامی و هێمنی و ئاسودەیی دابەزاندەسەریان و پاداشتی بەمژدەی سەرکەوتنێکی نزیک دانەوە.



ئەوان کاتی خۆی بەیعەتیان دا ڕانەکەن و هەڵنەیەن، بۆ مردن خۆیان ئامادە کرد، بەڵام ئەوان ١٤٠٠ کەسن یان سەربازن بۆیە پێغەمبەری خوا ئەوانی هەڵبژارد چونکە هەرکەسێکیان بە ١٠٠٠ سەربازە خۆی هاوار و بانگی کردن، هەروەها فەرمانی کرد بە عەباسی مامی کە بانگ بکات بەیعەتیان داوە لەسەر ئەوەی ڕانەکەن.

لەو کاتەوە عەباس دەنگی بەرز کردەوە و هاواری کرد، ئەی هاوەڵانی دار (درەخت)ئەی هاوەڵانی بەیعەتی حودەیبییە، الله، الله، ڕاکەن بۆ لای پێغەمبەرەکەتان ئەی هاوەڵانی ئازا و بەجەرگ ئەی هاوەڵانی بەیعەتی ژێر داری حودەیبییە.

پاشان فەرمانی کرد هاوار بکات بۆ هاوەڵانی ئەنسار، ئینجا عەباس هاواری کرد ئەی ئەنسارانی خودا، ئەنسارەکانی خوا لە ناو ئەهلی حودەیبییە ئەنساری هەڵبژارد تایبەتی کردن، ئینجا لە ناو ئەوانیش پێغەمبەری تایبەت کرد بە بەنو خەزرەج، ئینجا زۆرتر تایبەتی کرد بە نەوەی حارثی خەزرەجی...هتد.

عەباسی مامی پێغەمبەر دەڵێت: کە گوێیان لە دەنگی بوو، هەروەک گۆلکی برسی چۆن لە دایکی واتا (مانگا) ون دەبێت و برسییە بۆ خواردنی شیر لە گوانی دایکی و ئەیدۆزێتەوە، بە پەلە ڕادەکات بۆ لای دایکی، بەو شێوەیە هەموو گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا، هەموو لە چواردەوری کۆبوونەوە هاواریان دەکرد (لبیک، لبیک، یا رسول الله لبیک، لبیک) واتا هاتین و گەڕاینەوە بۆلات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، مژدەبێت هەموو لەگەڵتین.

لە ماوەیەکی کەمدا لە هەموو لاکان موسڵمانان کۆبوونەوە، ئەگەر چی قەیران بوو بەڵام زۆر بە زوویی لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوە، هەندێکیان ئەوەندە بە خێرایی هەڵهاتن ئەسپەکانیان بۆ نەدەوەستاوە، خۆیان فڕێ ئەدا بە پێ گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەری خوا.

بەڵی ئەوانە تووشی قەیران بوون، بەڵام بە دەنگی خۆشەویستمان هەموو گەڕانەوە بۆ ڕێگای ڕاست و پیاوانێک بوون لەسەر شانیان بونیادی ئەم ئوممەتەیان کرد پێش چەند خولەکێک تەنها ١٠ بۆ ١٢ کەسی لەگەڵ دابوو وا ئێستا سەدانی لە دەور کۆبوونەتەوە، فەرمووی ئێستا دەبێت جۆش و خرۆش بدەیت بە جەنگ، ئێستا شەڕەکە گەرم بوو (الأن حمي الوطيس)



سەرەتا هەموو ١٠ بۆ ١٢ كەس بوون: لەوانەی كە لەدەوری پێغەمبەر ﷺ مانەوە بریتیبوون لە (ئیمامی: ئەبوبەكری سددیق، عومەری كوڕی خەطاب، عەلی كوڕی ئەبی تاڵیب، عەباسی مامی ، فەزڵی كوڕی عەباس، ئەبو سوفیانی ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ، كە ئەویش لە پێش فەتح موسڵمان بوو، هەروەها ڕەبیعی برای واتە كوڕانی حارثی مامی پێغەمبەر ﷺ، ئەیمەنی كوڕی عویید، ناسراو بە كوڕەكەی ئوم ئەمین، ئوسامەی كوڕی زەید).

سەرەتا ئەمانە بوون لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕایان نەكرد، پاشان سەد كەسێك كۆبوونەوە لە دەوری پێغەمبەر، ئینجا هەر یەك لەوانە بانگی هاوەڵەكانی دەكردەوە پێغەمبەری خوا ﷺ چنگێك خۆڵی هەڵدا بەسەر هەوازن و فەرمووی خوایە كوێریان بكە، (حم، لا یبصرون) سەرنەكەون بەسەرمان دا، یاخود دەیفەرموو خوایە چاویان نەمان بینێت، (شاهت الوجه).

خۆڵ چووە ناو چاوی هەموو سوپای هەوازن، ئەوەندە بای خۆڵاوی هەڵی كرد چاو و لوتیان پڕ بوو لە خۆڵ.

دوای ئەو موعجیزەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵكەكە وردە وردە كۆبوونەوە، بوونەوە بە چەند هەزار كەسێك، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی كرد بە جەنگ و هاوەڵان بە ژمارەیەكی كەم شەپۆلی ناو هەوازنیان كەندڕ كرد وردە وردە شریخە و هاواری الله اكبر جۆش و خرۆشی سەندەوە، هاوەڵان هەموو وەك باران گەڕانەوە، سەرەتا جۆگەلە بوون پاشان بوونە چەم و پاشان ڕووبار و بوونەوە هێزێكی گەورەی دەریایی، ئەوانەی كە جەنگیان دەكرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا هەموو دەزانن سەركەوتن لەلای خوای پەروەردگارەوەیە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاواری كرد، شكستیان خوارد سوێند بە خوای كەعبە، شكستیان خوارد سوێند بە خوای محمد (انهزموا ورب محمد، انهزموا ورب الكعبة).

پاشان دەستی بەرز كردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: بە گەردن كەچی و داواكاری چەند جارە، خوایە سەركەوتن بنێرە، خوای پەروەردگار سەركەوتن بنێرە، خوای پەروەردگار داوات لێ دەكەم ئەوەی وەعدت پێداوین بماندەرێ خوای پەروەردگار، بۆیان نەبێت سەركەون بەسەرماندا، خوایە



سەرکەوتن بنێرە، خوایە سەرکەوتن بنێرە، چەند جار دووبارەی کردەوە پێغەمبەری خوا ﷺ.[٣٢]

بەم ژمارە کەمەوە پێغەمبەری خوا ﷺ توانی بە خواناسی و گەردن کەچی و دڵ پڕ لە ئیمان خۆیان کۆبکەنەوە، چاو نەترسانە دەست بکەنەوە بە جەنگ خۆڕاگر بوون، بەردەوام بوون لە شەهیدی و لە پێناوی خوا دەست کراوە بە جیهاد کە ئەمەش ڕووی دا سەرکەوتنی خوای پەروەردگار نزیکە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٢] ـ (اللّهم نَزل نَصرُكَ، اللّهم نَزل نَصرُكَ, اللّهمّ اني أشهِدُكَ ما وعدتَني, اللّهم لاينْبَغي أنْ يَظهَروا عَلَيْنا,)



## سەرکەوتن لای پەروەدگارەوە دێت

**ماکوان: سوپاکەی دەوری پێغەمبەر ﷺ بەتەواوەتی هەستیان بەوەکرد کە سەرکەوتن خوای پەروەردگار دەیبەخشێت، هێزی مرۆڤ هیچ نییە، سەرەتا ١٢ هەزار بوون، هەموو ڕایانکرد، وا ئێستا بە کەمەوە دەجەنگن وا تەنگیان بە دوژمنەکان هەڵچنیوە.**

**هەموو لەو ئایەتە تێگەیشتنەوە کە خوای گەورە لە جەنگی بەدر بۆی دابەزاندن**

﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ۝﴾ [الأنفال]

**واتە: ئەم یارمەتیەش جگەلە مژدەیەکی خوایی شتێکی تر نەبوو، تا دڵەکانیشتان ئارام بگرێت و دڵنیابن بەو یارمەتیە، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لە لایەن خواوە نەبێت نیە، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی باڵادەست و دانایە.**

**ئەم ئایەتە لە چرکە ساتێکدا، یاخود لە خێراترین چرکەساتدا لە ڕووی تێگەیشتن و تیۆرییەوە، لە کردار و واقیعدا بینیمان تەنها بە گۆڕینی نیەت، گۆڕینی نیەت وەکو خێرایی تیشک وایە، بەم شێوەیە ڕەوشی موسڵمانان گۆڕا، ئەگەڕێنەوە سەر هەمان بنەڕەتی وەحی سەرکەوتن لە جێگایەکەوە دێت کەس بە خەیاڵیدا نەهاتووە، هەر بۆیەش هەموو دان بەوە دائەنێن سەرکەوتن لای خوای پەرورەدگارەوەیە.**

**هۆکاری سەرکەوتنی حونەین، هەروەکو هۆکاری سەرکەوتنی بەدر و ئەحزاب و خەیبەر و مەککەیە، ئەی چی ڕووی دا؟!**

**خوای پەروەردگار سەربازی خۆی نارد، سەکینە و سەباتی دا بە ئیمانداران دەستیان کرد بە جەنگ**



﴿ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ...﴾ [التوبة]

واتە: پاشان خوای گەورە ئارامی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی و سەر ئیمانداران...

هەرچی دڵەڕاوکێ بوو لە دڵیاندا نەما و خوای گەورە ئازایەتی و سەباتی پێ بەخشین، چەندە خۆڕاگری و ئازایەتی دایە موسڵمانان، ئەوەندە ترس و لەرزی خستە دڵی ٢٥ هەزار سەربازی هەوازان، ئینجا موسڵمانان هەر نەگەیشتن بە کافرەکان ڕایانکرد، ئینجا خوای پەروەردگار فریشتەی نارد

﴿ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ [التوبة]

واتە: پاشان خوای گەورە ئارامی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی و سەر ئیمانداران و سەربازانێکی دابەزان کە نەتاندیووە، سزای ئەوانەشیدا کە بێ باوەڕان بوون، ئەوەش سزای و پاداشتی بێ باوەڕانە.

ئینجا هاوکێشەکە پێچەوانە بوویەوە، لە ناکاو سوپای موشریکی هەوازن دەستی کرد بە ڕاکردن لە بەردەم سوپای موسڵماناندا، ئەمە چۆن ڕووی دا؟!

چۆن ٢٥ هەزار سەرباز لە جێگای قایم و ستراتیژی دا جێگیر بوبوون مەتەریز و سەنگەریان بە هێز بوو باری دەروونیان زۆر بەرز بوو؟!

چۆن ئەمانە ڕوویدا؟!

وەڵامەککەی هۆکاری ماددی نییە، بەڵکو ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿... وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ ...﴾ [الأنفال]

واتە: ...ئەگینا سەرکەوتن تەنها لە لایەن خواوە نەبێت نییە...



سوپای موشریکی هەوازن هەموو ڕایان کرد، تەنانەت هاوەڵان لایان سەیر بوو دەیان وت: خۆ ئەوەندەی دەرهێنانی شیر لە گوانی مەڕێك خۆیان نەگرت. (فَمَا ثَبَتُوا لَنا حَلْبَ شَاةٍ)

واتا ماوەی هەڵهاتنیان زۆر کورت بوو، هەموو دەستیان کرد بە ڕاکردن هەرچی ماڵ و منداڵ و پارەیە لە دوای خۆیان جێیان هێشت، ئەوەندە خێرا ڕایان کرد منداڵ و ژن و تەنانەت خۆشیان سواری وشترەکانیان نەبوون نەک لەبەر هێز و توانای موسڵمانان، هاوەڵانیش خۆیان سەرسام بوون، بەڵام ئەمە ئەنجامی گەڕانەوەی موسڵمانان بۆلای خودا و تۆبە و پەشیمان بوونەوەیانە لە سەرسام بوون بە خۆیان، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿... وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ۝﴾ [التوبة]

واتە: ...سزای ئەوانەشیدا کە لە بێ باوەڕان بوون، ئەوەش سزای و پاداشتی بێ باوەڕانە.

یەکێک لەو عەزابانە ئەوەبوو بڕیاری ڕاکردنیان دا، ئەگەر چی زۆر و زەبەند بوون بە ژمارە و بە چەک لە موسڵمانان بە هێزتر بوون، عەزابی گەورەتر ئەوە بوو ئەوەی لە ماوەی ژیانیان دا بە دەستیان هێنابوو کۆیان کردبووەوە لە سامان و سەروەت و مەڕ و ماڵاتیان هەموویان لە دەست دا.

لە هەمووی بەئازارتر و گەورەتر منداڵ و ژن و ئافرەتەکانیان جێهێشت، لە ئەمانەش گەورە تر، وایان دەزانی هەموو شتێک دوژمنیانە هەموو شتێکی چواردەوریان ڕاویان دەنێت لە بەرد لە خۆڵ لە وڵاغ ئەوەش ئەو نهێنییەیە کە لە حونەین دا ڕوویدا.

خوای گەورە وای لێکردن کەوا هەندێکیان شمشێرەکەی دەستی خۆیان فڕێ ئەدا هەموو شتێک جەنگی لەگەڵ دەکردن شاخ و خاک و بەرد و ئەسپەکانیان...هتد، خۆیان باسی ئەو حاڵەتە و ڕەوشە دەکەن یەکێک لە وانە بەناوی (عەمری کوڕی سوفیانی سەقەفی) خۆی لەو موشریکانە بوو کە ڕایکرد لە جەنگی حونەین، بەڵام سوپاس بۆخوا دوایی موسڵمان بوو، دەڵێت شکستمان خوارد، هەرچی شتێک هەیە بە دوامانەوە بوو بۆ کوشتنمان لە بەرد و دار و درەخت



ببوونە سوارچاک لێمان، ئێمەش هیچمان بۆ نەدەکرا تا ڕامان کرد و خۆمان کرد بە شاری تائیف دا.[٣٣]

وایان لێهاتبوو هەستیان دەکرد خاک شەق دەبێت و هەڵیان دەلوشێت، ئەمە چ عەزابێکە خوای گەورە تووشی کردن.

پاشان کافرەکانی هەوازن بە سێ لادا ڕایان کرد، کۆمەڵێک ڕایان کرد بۆ ئەوطاس کە نزیک بوو لە حونەین، هەندێکیتریان بۆ ناوچەی (نەخلە)، پاشان زۆربەی سوپاکە ڕایکرد بۆ شاری طائیف، هەموو بەم شێوەیە بە سەرشۆڕی ڕایان کرد.

لە پێش هەموویانەوە سەرکردەکەیان مالیکی کوڕی عەوفی نەصری هەڵهات، کە پێشتر هانی دان بۆ ئەو سیناریۆ و کارەساتە سەربازییە، موسڵمانان کەوتنە شوێنیان ڕاویان دەنان بە هەموو لایەک دا.

سرییەک ڕۆیشت بۆ ناوچەی ئەوطاس بۆ ڕاوەدوونانیان، هەروەها سوپای سەرەکی بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ بەرەو نەخلە و طائیف کەوتنە ڕێ، تا گەمارۆی هەوازن و سەقیف بدات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە ڕاگرتنی هەموو غەنیمەتەکان، نابێت دابەش بکرێت تا لە طائیف دەگەڕێتەوە، هەموو ژن و منداڵ و حەیوان و ئاژەڵەکان پێغەمبەری خوا ﷺ لە دۆڵێک دابنان و بە ناوی دۆڵی ( الجعرانة) بە تەنیشت دۆڵی حونەینەوە بوو.

ئەم دەستکەوت و غەنیمەتانە گەورترین دەستکەوت بووە، لە مێژووی هەموو عەرەب دا.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٣] ـ (عُمَرْ بَنَوْا سُوفْيَانْ يَقُولُ: فَانْهَزَمْنَا فَمَّا خُيِّلَ إِلَيْنَا إِلَّا أَنَّ كُلَّ حَجَّارْ وَشَجَرَ فَارِسُ يَطْلُبُنَا، فَأَعْصَرْتْ حَتَّى دَخَلَتْ اَلطَّائِفُ).



مالیکی کوڕی عەوف گەورە و بچووکی لە هەوازن لەگەڵ خۆیدا هێنا، وا هەموو کەوتە دەست موسڵمانان، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە مەککە فەرمووی: کە هەموو ئەمانە دەبنە غەنیمەتی موسڵمانان.[٣٤]

لەو جەنگە دا ٦ هەزار ئافرەت بە سەبی گیرا، ژمارەیەکی زۆر زۆرە.

٢٤ هەزار سەر وشتر گیرا، ٤٠ هەزار سەر مەڕ گیرا، ٤٠٠ هەزار ئۆقیە زیو گیرا واتا ١٥٠ کیلۆ زیو کەوتە دەست موسڵمانان.

سەرکەوتنێکی گەورە و گرنگ بوو، کەس بە خەیاڵیدا نەدەهات، جەنگی حونەین بە هەموو پێوەرێک جەنگێکی زۆر سەرسوورهێنەر بوو، شەهیدانی موسڵمانان یاخود شەهیدانی حونەین ٥ کەس بوون، لە نێوان سوپایەکی ٢٥ هەزار و ١٢ هەزاری دا تەنها ٥ کەس لە موسڵمانان شەهید بوون لەو ژمارەیە دا کە سوپاکان پێک هاتبوو، دەبوو بە سەدان و هەزاران خەڵکی بکوژرایە، بەڵام ئەمانە هیچی ڕووی نەدا تەنها ٥ کەس لە موسڵمانان شەهید بوون، ئەم جەنگە دوو بەش بوو، بەشی یەکەم موسڵمانان هەموو ڕایان کرد، کە گەڕانەوە موشریکەکان هەموو ڕایان کرد، هۆکاری ڕاکردنی هەردوولا بوو کە کوشتار کەم بوو لەو جەنگە دا.

لە چرکەساتدا ڕەوشەکە گۆڕا لە ڕاکردنی موسڵمانان و شکستیان، بوو بە سەرکەوتن و ڕاوەدوونانی دوژمن، جیاوازییەکە بەداخەوە لە ڕووی ماددییەوە نابیندرێت چونکە گۆڕانکاریەکە بە دڵ کرا بۆیە سەرکەوتن، لە بیرکردنەوەی خوار و خێچ بۆ بیرکردنەوەی تەندروست و خواناسی، ئەم چەمکە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامە لە ناو موسڵماناندا خوای گەورە سەرت دەخات و سەرخستنی خوا پیادەکردنی مەنهەجەکەیەتی، ئیتر سەرکەوتن دەنێرێت.

---

[٣٤] ـ (تِلْكَ غَنِيمَةُ ٱلْمُسْلِمِينَ غَدًا إِنْ شَاءَ ٱللَّهُ).



﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [الأنفال]

واتە: ...ئەگینا سەرکەوتن تەنها لە لایەن خواوە نەبێت نییە، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی باڵادەست و دانایە.

هەموو لایەک دەبێت باش لەوە تێبگەن کە حونەین لە ژیانیشمان دا دووبارە دەبێتەوە، بۆ نموونە، چەند کەس باوەڕ و پشتی بە دکتۆرێکی زیرەک و بە توانا بەستووە، بەڵام خوای دکتۆرەکەی لە یاد کردووە، لە کاتێک زیرەکی و لێهاتوویی دکتۆرەکە لەبیر دەباتەوە دەست بۆ لای خوای پەروەردگار بەرز دەکاتەوە بزانێت شیفا لای خوای پەروەردگارە.

ئەمە مانای وانییە بڵێین گرنگی مەدەن بە دکتۆر و پزیشک و چارەسەر، نەخێر بەڵکو دەبێت هەموو هۆکاری تەندروستی بگرنە بەر، بەڵام تەوەکول بە خوا لەبیر نەکرێت کە شیفا تەنها و تەنها لای خۆیەتی.

هەرگیز هەوڵمەدەن و خۆتان زەلیل مەککەن بۆ ماڵی دونیا لای مرۆڤەکان داوا لە خوای ڕازق و دەوڵەمەند بکەن، دەست بۆ لای زاتی بەرزی بەرز بکەن کە خاوەنی مەلەکوتی زەوی و ئاسمانە.

زۆرێک هەوڵ ئەدات بگاتە لای بەرپرسێک بۆ واسطەیەک یاخود کارێک، داوای لە خودای پەروەردگار بکە دەرگای ڕەحمەتت لێ بکاتەوە کە خاوەنی هەموو دەرگاکانە.

زۆرن ئەوانەی کە لە مرۆڤەکان داوا دەکەن، بیریان چووە داوا لە حەننان و مەننان بکەن، دڵخۆش و ئارامن لەوەی لە دەستیان دایە، بەڵام دڵخۆش و ئارام نین بەوەی کە لەدەست زاتی خوای پەروەدگار دایە، دەبێت هەموو ئەوە بزانین، کە شکست دەخۆین ڕادەکەین ، دەترسین دەگرین، هەموو هەوڵی هۆکار ئەدەین، بەڵام خوای هۆکاریش لەبیر دەکەین.



# سوپای پێغەمبەر بەرەو طائیف

ماکوان: ڕۆژی حونەین جەنگێکی سەخت تێیدا ڕوویندا کە جێگای باس کردن بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەری زۆری لەسەر ناوچەکە و هۆزەکان بەگشتی درووست کرد، بەتایبەت لەسەر هەوازن و سەقیف، ئەوەندە کاریگەرییەکانی زۆرن لەسەریان کەوا لە ژمارە نایەت، بەهێزترین کاریگەری ئەوە بوو فێری کردن کە سەرکەوتن و شکست چییە و چۆن دێت؟ ئەوە فێر بوون لە موسڵمانان هەرچی هێز و چەک و ژمارە کۆبکاتەوە، بەڵام ئەگەر پەیوەندی توند و تۆڵ نەبێت لە ڕووی ئیمانییەوە بە خوای پەروەردگار هیچ نرخی نییە هێز و توانایان، ئەمەش ئەو وانەیەیە کە لە هەزارەها ئەکادیمی زانکۆ بە هێزەکانی جیهان دەست ناکەوێت.

موسوڵمان گەڕانەوە بۆلای خوا توانیان سەربکەون، سوپای هەوازن ڕایکرد بەرەو طائیف و ئەوطاس و نەخلە، ئەو سرییەیەی کە ڕووەو ئەوطاس ڕۆیشت جەنگ تێیدا ڕوویدا، دورەید سەرکردایەتی جەنگی کرد، موسڵمانان دورەیدیان کوشت و هەندێک لە سوپای هەوازن لەوێ مابوون ئەوانیش ڕایان کرد بۆ طائیف، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووە و نەخلە ڕۆشت، تا شوێن سوپای هەڵهاتووی هەوازن بکەون پاشان بڕیاریان دا دوای کۆتایی هاتنی نەخلە بەرەو شاری طائیف بکەونە ڕێ.

هەوەرها سەرکردەی قەومی و باوکی ڕۆحی هەوازن هەڵهات بۆ طائیف، پێغەمبەری خوا ﷺ گەمارۆی شاری طائیفی دا، بۆ ئەوەی جەنگێکی یەکلاکەرەوە بێت لەگەڵ هەوازن، شکستی هەوازنی بەهەند وەرگرت، پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی مەعنەویاتیان بەرز نەبێتەوە بەردەوام جەنگیان لەگەڵ بکات، یان خۆ بەدەستەوە دان یان موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیەنن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە غەنیمەت دابەش ناکرێت، هەتا وەکو سوپا لە طائیف نەگەڕێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێگەی طائیف دا دنیایەک یادگاری کەوتەوە بەرچاو، پێش ١١ ساڵ لەمەوبەر پێغەمبەر ﷺ بەرەو طائیف ڕۆشت بەهەمان ڕێگادا، بە



شێوازی پێشنیارێکی جیاوازتر، ئەوکاتە کە بەرەو طائیف ڕۆیشت لەو پەڕی خەمباری و ناڕەحەتی دا بوو، بە پێ بەرەو طائیف دەڕۆیشت، کەسی لەگەڵدا نەبوو بێجگە لەو کوڕە منداڵکارەی کە ئەو دەمە تەبەنو کردبوو بە ناوی (زەیدی کوڕی حارس)، مەککەییەکان دەریاندەکرد و دژی وەستابوونەوە، خاتوو خەدیجەی خێزانی وەفاتی کردبوو، مامی بە هەمان شێوە لەو ساڵەدا هەموو لایان چۆڵ کرد، لە شاری مەککە ئەوانەی لەگەڵی بوون زۆر کەم بوون لە ئیمانداران هەمووی ١٠٠ کەس دەبوون.

ڕەوشەکە لەو پەڕی کارەسات و مەرگەساتدا بوو، کە چووە طائیف پێش ١١ ساڵ لەمەوبەر هیچ لە ئازارەکانی کەم نەبوو، بەڵکو خەڵکی تائیف زۆر بە ناشرینی پێشوازیان لێکرد و ئەوەندەی تر ئازار و ئەشکەنجەیان دا، بەتەواوەتی بانگەوازی ئیسلامییان ڕەت کردەوە و پێغەمبەری خوایان ﷺ دەرکرد، بەڵکو لەگەڵ زەیددا بەردبارانیان کردن، قسەی ناشرین و جنێویان پێدا، لەو هەموو ناڕەحەتی و ئازارەدا، فریشتەی شاخ هاتە خزمەتی و ئامادەیی دەربڕی شاری طائیف وێران بکات، هۆکاری هاتنی فریشتەکەش لە دوای ئەو دوعا و پاڕانەوە بوو کە کردی بۆ خوای گەورە گەردەنکەچی زیاتری نیشان دا، پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو، بەوەی کە ئەو دوو شارە وێران بێت، بەڵکو فەرمووی ئومێدم هەیە بە خوای پەروەردگار لەناو  ئەم دوو شارەدا خەڵکانێک لە نەوە و پشتیان دەربچێت خواناسی بکەن و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بەدەن.

لە دوای ئەوەی قاچی موبارەکی خوێنی لێ دەچۆڕا و سەر و ملی موبارەکی بەرد باران کرابوو، چووە ناو باخی عوتبە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە) تا خۆیان لەوێ حەشار بدەن، لە بەردی خەڵکی شاری طائیفە و عەبدەکانیان، لەو ناڕەحەتییەدا کوڕێک لە تەمەنی لاوێتی بە ناوی (عەداس) کە ترێی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان بەرەو شاری مەککە گەڕاوە لە ڕێگا لە (قەرن ثعالب) لەوێدا تووشی هەندێک لە جوولەکەکان بوو، بە هەرحاڵ هەموو ئەم ناڕەحەتییانە، بەڵام وا ئێستا بە شێوەیەکی تر دەڕوات بۆ شاری طائیف، ڕۆژان ڕۆژی تر دەهێنێت بە دوای خۆیدا، هەموو ڕۆژەکان وەکو یەک نین گۆڕانکاری ڕوودەدات، خوای گەورە دەفەرموێت:



﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾﴾ [آل عمران]

واتە: ئەگەر زام و سەختی و ناخۆشییەک (لە جەنگی ئوحودا)دا تووشی ئێوە هاتووە، ئەو خەڵکەش (لەجەنگی بەدردا) تووشی هەمان زام و سەختی و ناخۆشی هاتن، ئێمە ئەو ڕۆژگارانە دەستاو دەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا (تا لە جیهانی واقعیشدا) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە خوا دەریان بخات و هەندێکتان بکات بە شایەت و بە پلەی شەهیدی بگەن، بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت.

وا دوای ١١ ساڵ بەرەو شاری طائیف دەڕوات، ڕەوشی جیاوازترە لە جاران لە شاری مەککەوە سوپای ڕێکخستووە، چواردەوری بە پاسەوان و سوپا گیراوە و خۆی سەرکردایەتی جەنگ دەکات، بەعیزەت و سەربەرزی پڕشکۆوە هەنگاو هەڵدێنێتەوە، ئاڵای (لا اله الله محمد رسول الله) بەرز و شەکاوەیە، ١٢ هەزار کەسی لەگەڵ دایە، هەموو خاک لە ژێر پێیان زەلزەلەیەتی، جیاوازییەکەی کە ڕووی داوە نێوانیان ١١ ساڵە، لە ڕابردوودا کە گەڕانەوە لە شاری طائیف بەیەقینەوە بە زەیدی فەرموو:

ئەی زەید خوای پەروەردگار دەرگای خێر و دەرچوونمان بۆ دەکاتەوە، بە دڵنیاییەوە دینەکەی خۆی سەردەخات، پێغەمبەرەکەشی بەسەر کافراندا زاڵ دەکات.[٣٥]

وا دەرگای ڕەحمەت کراوەتەوە زۆر لەوە زیاتر کە هەموو لایەک چاوەڕوانی دەکرد، وا دینەکەی ڕۆژ بە ڕۆژ چرکەسات بە چرکەسات لەبرەودایە.

وا ئێستا دەرگای ڕەحمەتی خوا کراوەتەوە و هەموو ئەم یادگارییانەی کە باسمان کرد لە ژیانی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ دایە بە خێر و شادی ڕۆیشت و عیزەت و سەربەرزی پێغەمبەرەکەی دەرکەت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٥] ـ (يَا زَيْدْ ، إِنَّ ٱللَّهَ جَاعِلٌ لِمَا تَرَى فَرَجًا وَمُخْرِجًا, وَانْ ٱللَّهِ نَاصِرْ دِينِهِ وَمُظْهِرْ نَبِيِّهِ).



## سوپای پێغەمبەر ﷺ گەیشتە شاری طائیف

ماکوان: سوپای ئیسلامی گەیشتە شاری طائیف و موسڵمانان وا هەستیان دەکرد کە جەنگێکی زۆر گەورە ڕوودەدات لە نێوان ژمارەیەکی زۆری خەڵکدا، بەڵام خەڵکی شار بە تەواوەتی ڕەتیان کردەوە جەنگ بکەن، بەڵکو لە ناو قەڵای شاردا خۆیان حەشاردا و نەهاتنە خوارەوە بۆ جەنگ، بەڵکو ناو قەڵاکانیان هەڵبژارد تاوەکو پارێزگاری لە خۆیان بکەن و لەوێ بمێننەوە، لە کاتێکدا ژمارەی سەربازانی هەوازن و سەقیف چەندجار ئەوەندەی موسڵمانان دەبوون، بڕیاری مانەوەی خەڵکی سەقیف و هەوازن لە قەڵای شاردا، جەنگ بۆ موسڵمانان زۆر سەخت دەبێت، چونکە قەڵاکان زۆر قایم و بەهێزن، بۆ موسڵمانان زۆر ئەستەم بوو چوونیان بۆ ناو شارەکە چونکە دیواری قەڵای ئەو شارە زۆر بەهێز بوو.

دەیانتوانی جەنگ بکەن و بێنە دەرەوەی قەڵاکە، بەڵام خوای پەروەردگار ترسی خستە دڵیان و توانای ڕووبەڕووبوونەوەیان نەبوو، چونکە حونەین باشی ترساندبوون، هەڵەی جەنگی دووەمیان بە خۆیان نەدا، لەکاتێکدا هەموو ژن و منداڵیان گیراوە بێجگە لە سەروەت و سامانیان، بەڕاستی بۆیان سەرشۆڕی و ملهوڕی بوو کە بەم شێوەیە مانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا گەمارۆیان بدات و جەنگیان لەگەڵدا بکات تا دێنە دەرەوە، بەڵام خەڵکی شاری طائیف موسڵمانانیان تیر باران کرد و زۆر زیان بە سوپای موسڵمانان گەیشت، نزیکەی ١٢ کەسیان لێ شەهید بوون دیواری قەڵاکانیان زۆر بەرز بوو ئەوان دەیانتوانی بە ئاسانی تیر و ڕمەکانیان بۆ موسڵمانان بهاوێژن، بەڵام تیری موسڵمانان نەدەگەیشتە ئەوان، هیچ کاریگەری نەبوو فشاریان بۆ موسڵمانان هێنا، کێشەیان بۆ دروست بوو، حوبابی کوڕی مونزیر، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای لێکرد، کە سەربازەکان دوور بخەنەوە بە هۆکاری ئەوەی تیر و ڕمی ئەوان دەگات بە ئێمە و تیری ئێمە ناگات بە قەڵاکە؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا سوپاکەی هێنایە دواوە، بەڵام هەر گەمارۆی شاری طائیفی دا.



پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەوە کردەوە چۆن بتوانێت وایان لێبکات لە قەڵاکانیان دەرچن بۆ جەنگ کردن، پرس و ڕاوێژی کرد بە سوپاکەی لە کۆتاییدا بە دوو داهێنان وەڵامی پێغەمبەریان دایەوە ﷺ لەوانە سەلمانی فارس بیرۆکەی تانک (دەبابە) مەنجەنیق، کە بەرد هەڵبدەن بۆ قەڵاکە و هەروەها لە تەختە و دار شێوەی تانک و دەبابەیان دروست کرد چوونە ژێری تا تیر و ڕمی دوژمن کاریگەری نەبێت.

بەردەوام مەنجەنیق لەسەر قەڵاکە بوو، هەروەها لە ژێر دەبابەکاندا موسڵمانان توانیان بە شێک لە دەرگاکانی قەڵاکە بشکێنن و زۆری نەمابوو بڕۆنە ناو شاری طائیف، بەڵام هێزی طائیف بە جۆرە چەکێک موسڵمانانی سەرسام کرد و لە جێگای خۆیان نەیانتوانی زیاتر هەنگاو بنێن.

ئەویش سوورکردنەوەی تەلەئاسن کە هەموو لە ئاگردا سوور دەکراوە هەڵدەدرا بۆ موسڵمانان، هەموو دەبابە و مەنجەنیقی موسڵمانانی شکست پێهێنا و ژمارەیەکی زۆری موسڵمانان بەو (تەلە ئاسنینە سوورکراوەتەوە لە ئاگردا) شەهید بوون و زۆرێکیش بریندار بوون، کارەساتی زۆر ڕوویدا بەسەر موسڵماناندا ئینجا موسڵمانان بە ئومێدی ئەوەی لە پێناوی باخ و باخاتەکانیاندا بجەنگن و بێنە دەرەوەی قەڵاکە، هەندێکیان دەستیان کرد بە سوتانی باخ و ڕەزی ترێکانی طائیف، ئەمەش بۆ وێرانکردن نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوە بوو لە ناو قەڵاکانیان دەربچن، وەکو تەکنیکی جەنگ بەکاریان هێنا.

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگر بوو لە شکاندنی دار و درەخت، ئەو سوتاندنی ڕەزە ترێیە بۆ ئەوەیە کە پلانی سەربازی پێ بهێنێتە دی.

ئینجا خەڵکی  طائیف بانگی موسڵمانانی کرد و گوتیان بۆ باخەکانمان دەسوتێنن ئەگەر سەرکەوتن بیبەن بۆخۆتان، یان وازی لێ بهێنن لەبەر خوا و سیلەی ڕەحم.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە گوێی لەوانە بوو فەرمووی: ئەوا وازمان لێهێنا لەبەر خوا و پاشان سیلەی ڕەحم. [٣٦]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٣٦ ـ (قَالَ رَسُولٌ: فَأَنِّي أَدَعهَا للّهَ وَلِلرَّحِمِ).



هەرچەندە پەیوەندی خزمایەتی لە نێوان سەقیف و قورەیش زۆر دوورن لە یەکەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ یەکێک لە باوانی دایکی لە هۆزی سەقیف بوو، ئەویش نەنکی پێنجەمی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە سەقیف بوو، ناوی (هیندی کچی یەربوع) بوو.

جیاوازی زۆرە لە نێوان جەنگی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و جەنگەکانی عەلمانی و یەهوود و فارس و ڕۆم...هتد، ئەوان بە تێکدانی ژێرخانی ئابووری و فەساد تێکی ئەدەن و ئەیسوتێنن، نەک بۆ مەبەستێک و پلانێکی هەبێت.

تەنانەت خوای گەورە وەسف و پێناسەی ئەو جۆرانە دەکات دەفەرمووێت:

﴿وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ﴾

[البقرة]

واتە: هەر کاتێک ئەو جۆرە کەسە پشتی هەڵکرد و دەسەڵاتی پەیدا کرد؛ هەوڵ و کۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشووب بەرپا بکات و خراپە بڕوێنێت و کشتوکاڵ لەناو ببات و پاکتاو کردنی ڕەگەزی ئەنجام بدات، بێگومان خوا فەسادو خراپە و تاوانی ناوێت.

چونکە ئەم جۆرە هێزانە مەبەستیان فەساد و لەناوبردنی خەڵک و سەروەت و سامانیانە، وەکو سوپای ئەمریکا، هەموو هیندە سوورەکانی کوشت، پاشان ئەفریقای دزی، پاشان بۆردومانی هیرۆشیما و ناکازاکی، سوپای ئەوروپا ٦٣ ملیۆن خەڵکیان لە خۆیان کوشت لە جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەم دا.

بەڵام کە موسڵمانان زانیان هیچ سوودێکی نییە وازیان لێ هێنا و هەموو سوتاندنی ئەو باخانە ناکاتە ٤ باخ، یان سێ باخ سوتێندراوە یاخود دوو باخ.

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەبەستی هاتنەدەرەوەیان ڕێگایەکی تری گرتە بەر، بۆ ئەوەی هیچ نەبێت، زانیاری تەواوی ناو شاری طائیفی دەست بکەوێت، بانگی هەرچی بەندە بوو لە طائیفدا کردی، فەرمووی هەر کۆیلەیەک لە قەڵاکەدا بێتە دەرەوە و بێتە لامان ئازادە.[37]

لە ناو کۆمەڵگەی عەرەبدا بوونی کۆیلە و عەبد زۆر بوو، لە بنەڕەتدا سیاسەتی ئیسلام بۆ ئازادکردنی کۆیلە و بەندەکان بوو، ئەمەش هەلێکی زۆر باش بوو بۆ ئازادبوونیان، خۆ ئەگەر هاتنە دەرەوە موسڵمان دەبن و ئازاد دەبن لە دنیا و لە قیامەتیش ناچنە ناو ئاگر، بەمەش خەڵکی سەقیف زۆرێک لە بەندە و کۆیلەکان لە دەست ئەدەن چەند ئامانجێکی لە پشتەوە بوو، ئەم بانگەوازەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سەرەتا ئامانجی بانگەوازیان بۆ ئیسلام، پاشان ئامانجی سەربازی، هەروەها ئامانجی لاوازکردنی هێزی دوژمن، هاوەڵان دەستیان کرد بە بانگی کۆیلە و عەبدەکان تا بێنە دەرەوە لە ناو قەڵاکەدا، هەندێک لە قەڵاکە خێرا دەرچوون کە ژمارەیان گەیشتە ٢٣ کۆیلە، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ویستی بۆی هاتەدی و ئامانجی پێکا و زۆرێک لە ستراتیژی سەقیف ئاشکرا بوو.

بەڵام لە سەقیف بڕیار دەرچوو هەر کۆیلەیەک دەربچێت دەکوژرێت، پاسەوانی زیاتریان بۆ دەرگای قەڵاکان دانا کۆیلەکان توانای دەرچوونیان نەما.

بەهەرحاڵ موسڵمانەکان زۆر سوودیان لەو ٢٣ کۆیلەیە وەرگرت، بوون بە هێزێکی زیاتر بۆ ناو سوپای موسڵمانان.

ئەو کۆمەڵە عەبدە پێغەمبەرﷺیان ئاگادار کردەوە بەچەند زانیارییەکی گرنگی سەربازی کە پێغەمبەر سوودی زۆری لێوەرگرت، توانی ستراتیژی سوپاکەی لەسەر بونیات بنێت، ئەویش بریتی بوو لەوەی ئاشکرایان کرد کە ناو قەڵا و شارەکە بەشی یەک ساڵ خواردن و خواردنەوەی تێدایە، هەروەها خەڵکی طائیف دەتوانن تا یەک ساڵ بەرگری بکەن یان چەند ساڵێک!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[37] ـ (قَالَ رَسُولٌ: أَيُّمَا عَبْدٍ نَزَلَ مِنْ ٱلْحِصْنِ خَرَجَ إِلَيْنَا فَهُوَ حُرٌّ).



ئەم زانیارییە زۆر گرنگ بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە موسڵمانان ناتوانن یەک ساڵ گەمارۆی ئەو شارە بدەن، ژیانیان تەرخان ناکەن بەس بۆ گەمارۆدانی طائیف لەبەر ئەوەی سوپای ئیسلام هەموو لەو جێگایەدان، سوپای موسڵمانان لەوێدا کۆبوونەتەوە، پێغەمبەری خوا ناتوانێت شاری مەدینە هەروا بێ سوپا و هێز بۆ ماوەیەکی زۆر جێبهێڵێت، ڕاستە هێزی داناوە، بەڵام هێزەکە کەمە و تەنها بۆ پاراستنی ژن و ماڵ و منداڵی شاری مەدینەیە.

زۆرێک لە هۆزەکانی دەوری مەدینە نەهاتونەتە ناو ئیسلام، زۆرێک کە هاتوون بۆ دەوڵەتی ئیسلامی موسڵمانی نوێن، ئەگەری زۆر هەیە هەڵگەڕانەوە ڕووبدات، پێویستی بە چاودێری بەردەوام هەیە.

لەولاوە یەهوودی خەیبەر و فەدەک تەیما و وادی قورا لەمەڵاسدان، نزیکن لە شاری مەدینە، ئەویش ئەگەری زۆری جەنگ کردنیان هەیە، هەوەها ئەهلی مەککەش نوێن بۆ ئیسلام، هەوەها غەنیمەتێکی زۆر لە دۆڵی جعرانە بەجێ ماوە.

ئەم هەموو کێشە و ئەگەرانە ناکرێت پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر خاتری گەمارۆی طائیف وازی لێ بهێنێت، وا بۆماوەی ٤٠ ڕۆژە شاری طائیف گەمارۆ دراوە هیچ سوودێک و گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ ڕووینەداوە و گەمارۆکە سوودێکی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینیوە، بۆیە ناچار پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە ڕاوێژکردن و پرسیار لە شارەزایانی بواری سەربازی تا چی بکەن و چۆن مامەڵە لەگەڵ ڕەوشەکەدا بکەن؟!



# شوورا بۆ پاشەکشە لە طائیف

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی کرد بەیەک هاوەڵ لە هاوەڵەکانی کە لێوەشاوە و بە توانابوو لە بواری سەربازییدا، کاتێک ناوەکەی دەبیستین هەموو لامان پێمان سەیر دەبێت، بەو هاوەڵەی ڕاوێژ و شوورای پێدەکات، ڕاوێژ و شوورای ئیسلامی مەرج نییە بە کۆمەڵێک کەس بێت، زۆر جار دەشێت یەک کەس بێت یاخود دوو کەس، لە حودەیبییەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە ١٤٠٠ هاوەڵ کرد، بەڵام لە بەدردا بەیەک هاوەڵ، ئەویش (حوبابی کوڕی مونزیر) بوو، هەروەها بۆ پاشەکشە لە گەمارۆی طائیف پرس و ڕاوێژی بە هاوەڵی بە ڕێزی (نەوفەلی کوڕی مەعاویەی دەیلی) دەکات کە گەورە و سەرۆکی هۆزی بەنو بەکرد بووا!

ئەو هۆزەی کە لەگەڵ قوڕەیش هاوپەیمان بوون لە دوای صوڵحی حودەیبییە، هەر ئەوان بوون هێرشیان کردە سەر خوزاعە و پێغەمبەر ﷺ بە هۆکاری جەنگی ئەو دوو هۆزە فەتحی شاری مەککەی پیرۆزی کرد، ئەو کەسە بوو نەوفەل کە کوفری بە خوای خۆی و هۆزەکەی قوڕەیش کرد، وتیان نەوفەل، خواکەت خواکەت ئەویش لە وەڵامدا وتی، ئەی بەنو بەکر ئەمڕۆ ئێوە خواتان نییە.

ئەو کەسەی کە شوورای پێدەکات پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نەوفەلەیە کە ئەو هەموو تاوان و کوشتارەی کرد لە ناو شاری مەککە دا، بەڵام نەوفەل موسڵمان بووە و تۆبەی کردووە هەموو هۆزەکەشی هێناوەتە ناو ئیسلام، یەکێکە لەو موهاجیرانەی سوپای ئیسلامی و ڕاوێژکاری سەربازی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

ئەوەی جێگای سەرنجە لە خیانەتەوە هاتۆتەوە بۆ ئیسلام، لە غەدرەوە بۆ ئەمانەت، لە کوفرەوە بۆ ئیمان، ئەمەش وانەیەکی ترە کە مامۆستای مرۆڤایەتی فێرمان دەکات، کەوا خەڵکی بە توانا و خاوەن بیروبۆچوون کاری خۆی بدرێتێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو توانا و وزەکانی لە جێگای خۆیاندا دادەنا، نموونەی عەمری کوڕی عاص و خالیدی کوڕی وەلید و عوسمانی کوڕی طەڵحە و...هتد.



تەنانەت خالید دەڵێت: هیچ کەس لە هاوەڵان وەکو پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دادپەروەر نەبوو لەگەڵمدا.

بە دڵنیاییەوە چونکە پێغەمبەری خوایە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و هەموو ئەم کارانە لایەنی پێغەمبەرایەتیی هەمووسان دەبێت چاوی لێبکەین و بیکەینە پێشەنگ لە هەموو کار و باری ژیانماندا.

گومانی تێدا نییە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ شوورا و ڕاوێژ بە هەموو هاوەڵانی دەکات، هەرکەسەو لە بواری خۆیدا، بینیمان کەسێکی لاوی دانا بۆ شاری مەککە (عوتابی کوڕی ئوسەید) هەرچەند ڕۆژێك بوو موسڵـان بوبوو، بەم شێوەیە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مامەڵەی دەکرد لەگەڵ ئەوانەی توانا و خاوەنی سەرکردایەتی بوون، بۆ ئەوەی موسڵمانان سوودیان لێوەربگرن، لە کاتێکدا خزم و کەس و کارەکەی دانەئەنا هەرچەندە ئەوانیش هەموو لێوەشاوە بوون، ئەمەش بەرزترین ئاستی حیکمەت و هۆشی پێغەمبەری خوایە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، ویستی پێغەمبەرایەتی بەم شێوەیە مامەڵە و حوکمڕانی دەکرد.

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە حەکیمانەی پێغەمبەری خوا پرسی بە نەوفەلی کوڕی مەعاویە کرد کە خۆی کەسایەتییەکی سەربازی و ستراتیژی زۆر بە توانا بوو لەو جێگایەدا بە کەڵکی موسڵمانان دەهات، سیاسەتی پێغەمبەر کوشتن و لە ناوبردنی سیلەی ڕەحم نەبوو، بەڵکو سیاسەتی ڕەحم و بەزەیی و وەفا بوو، دەیویست هەموو هیدایەت وەربگرن بۆ ئیسلام، هەروەکو خۆی دەفەرمووێت: ئەگەر یەک کەس خوا هیدایەتی بدات لەسەر دەستی من، باشتر و خۆشترە لە هەرچی خۆشی و نیعمەتی دونیایە کە هەیە.

ئەمە سیاسەتی نەگۆڕی پێغەمبەری خوایە، لە دوای ئەوەی پرسی کرد بە نەوفەل، ئەی نەوفەل چی بە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ وت؟!



نەوفەل وتی: ئەی ڕەسولی خوا، ئەمانە وەکو ڕێوین لە ناو کونی خۆیاندان، خۆ ئەگەر بمێنیتەوە هەر دێنە ژێر دەستت، ئەگەر ئێستاش وازیان لێ بهێنیت هیچ زەرەر و زیانێکت پێناگات.[٣٨]

واتا ئەهلی طائیف وەکو ڕێوی وان خاوەنی فرتوفێڵن، تەنانەت لە ناو عەرەب واباوبوو، عویەینە کوڕی حصن دەیووت: سەقیف هۆزێکی فێڵبازن، خاوەنی حیلە و ئەمسەروسەرن جێگای باوەڕنین، هەرچەندە بمێنینەوە ئەوان لە ناو قەڵای خۆیاندان، لە کۆتاییدا هەردەبێت خۆیان بدەن بە دەستەوە.

بەڵام ئاماژەی بەوە کرد وتەیەکی زۆر پڕ بایەخ بوو لای پێغەمبەر ﷺ، نەوفەل وتی: ئەمانە شانوشەوکەت و شکۆیان شکێندراوە، مەعنەویاتیان لە خاک دایە، لەمەولا هیچ قیمەتێکیان نەماوە، ئابڕووچوونیان وەکو ڕۆژی ڕووناک ڕژایە ناو خەڵک، ئەگەر وازیان لێبهێنیت هیچ زیان و زەرەرێکت پێناگات.

پێغەمبەری خوا ﷺ قسەکانی هەڵاوێرکرد و زانی مانەوە هیچ سوودی نییە، هیچ سوودێک بە دەوڵەتی ئیسلامی ناگەیەنێت، بڕیاری کشانەوەی دا.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٨] ـ (قَالَ: يَا رَسُولُ اَللَّهِ، هُمْ ثَعلَبْ فِي جُحْرٍ، إنَّ قُمْتَ عَلَيْهِ أَخَذَتْه؟ وَانْ تَرَكتَهْ لَمْ يَضُرْكَ ).



# بڕیاری کشانەوە بۆ دۆڵی جعرانە

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا سوپاکەی هەموو بگەڕێنێتەوە بۆ دۆڵی جعرانە، لەوێ پڕیەتی لە دەستکەوت و غەنیمەت تا بەسەر سوپاکەیدا دابەش بکات، ئیتر واز لە قەڵا بەهێز و توند و تۆڵەکانی طائیف بهێنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی عومەری کوڕی خەتابی ڕاسپارد کە هەموو سوپا ئاگادار بکاتەوە، سبەینێ بە پشتیوانی خوا دەڕۆین.[٣٩]

داخۆ موسڵمانان لە ئاستی ئەو بڕیارە خاوەن ڕەحمەدا چی بڵێن؟!

زۆرینەی سوپا کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی کە خۆشحاڵ نین بەو هەواڵە بەڵکو حەز دەکەن بمێننەوە و جەنگ بکەن تا خوای گەورە فەتحی طائیفیان بە قیسمەت دەکات بە پەلە هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بەناڕەزاییەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕۆین و فەتح نەکەین؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ زانی بۆچوونەکە زۆرە هەموو داوا دەکەن بمێننەوە، ڕێز و ئیحترامی سوپاکەی گرت، وانەیەکی زۆر واقعی لە ڕووی مەیدانییەوە فێری هەمووانی کرد و فەرمووی: بەردەوام بن لەسەر جەنگ (أغدا عەلی القتال).

ڕێگای پێدان بۆ جەنگ، بۆ ڕۆژی دوایی هەموو موسڵمانان دەرچوون بۆ جەنگ، جەنگێکی زۆر سەخت ڕووی دا، زۆر زۆر لە موسڵمانان بریندار و ناڕەحەت بوون، تووشی زۆر ئازار و ئەشکەنجە بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ کەسیانی سەرزەنشت نەکرد، بڵێت ئەی پێم نەوتن کە بڕۆین، کەچی بەقسەتان نەکردم، بەڵکو ئەم قسانەی نەکرد و زۆر بەسادەیی فەرمووی: بەیانی لێرە دەڕۆین (إنا قافلون غدا إن شاء الله)، هەمان وتەی دوێنێی دووبارە کردەوە، هەموو موسڵمانان خۆشحاڵ بوون یەک کەس موجادەلەی گفتوگۆکەی نەکرد، هەموو

---

٣٩ ـ (أَنَا قَافِلُونَ غَدَاً إِنْ شَاءَ اَللَّهُ).



هەڵسان بۆ خۆئامادەکردن، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم تەنها دەستی کرد بە پێکەنین و هیچی تری نەفەرموو.

ئەم هەڵسوکەوتەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم لە پاشەکشە فێری زۆر شتمان دەکات، وانەکانی پڕ بایەخ و واقیعەتی ژیانە، ئەویش فێری ئەوەمان دەکات مەرج نییە هەموو پڕۆژەکانی ژیان سەرکەوتن بەدەست بهێنیت، بەڵکو زۆر جار دووچاری شکست دەبیتەوە، بەڵام گرنگە واقیع بین بیت و دەست نەبەین بۆ کارێک کە لە توانای ئێمەدا نییە، ئەمەش مانای بێئومێد بوون نییە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم ئەوەی لە توانای دابوو ئەنجامی دا بۆ کردنەوەی دەرگای قەڵاکان، بەڵام ویستی خوای گەورەی لەسەر نەبوو، موسڵمانان سەرکەوتوو نەبوون لە فەتحی شاری طائیف دا لە واقیع بینیدا زۆر بەسادەیی کشانەوە دواوە، ئەمەش لە ڕاستیدا نیوەی سەرکەوتنە.

چونکە جیاوازی هەیە لە نێوان ئارامگرتن و بە فیڕۆدانی کاتدا، ئارامگرتن لە کاتی جێبەجێکردنی هەر کردار و کارێکدا زۆر باشە و پێویستە، بەڵام دەبێت بزانی چەند ئەگەری سەرکەوتن هەیە، هەروەها دەبێت واقیعی بین، بزانین ئایا ئەوەی ئەتەوێت دێتە دی، پێویستە بزانی زیان کەمترە لە سوود، ئینجا دوای ئەوە بە دواداچوون و چاودێری بۆ کارەکە زۆر پێویستە، ئەگەر زاندرا پێچەوانەکەی دێتە دی، زیان زۆرترە تاکو سوود، پێویستە بە زووترین کات وازی لێبهێنیت، تا نەگەیشتۆتە ئاستی خەسارەتی زۆر و دژی توانای هەڵسانەوە بێت.

ئەگەر سەیری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم بکەین زۆر بە جوانی وانەی فێری هاوەڵان کرد وازی لێهێنان تا هەوڵی خۆیان بدەن، پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم زانی فەتحی شاری طائیف زۆر سەختە و ئەستەمە ، بەڵام ویستی هاوەڵان لە واقیعەکەدا بژین و وازی لێهێنان تا خۆیان بڕوایان کرد و زانیان لە توانایان نییە، هاوەڵان خۆیان ڕازی بوون لە وازهێنانی، پێغەمبەر و هاوەڵانی هەموو طائیفیان جێهێشت.

ئەم سەرکردەیە هێمن و لەسەرخۆیە زیاتر و زیاتر ئارامی دایە سەربازەکانی، دڵیان زیاتر پشووی وەرگرت و ئارام بوون، هیچ کاردانەوەی توند و یەئس و دەمارگیری و دوودڵی و بێهیوایی و نا ئومێدی و خەمباری ڕووی نەدا، کەس نەیووت ئەگەر ڕامان بکردایە وا دەردەچوو، ئەگەر



وامان نەکردایە وا دەرنەدەچوو، لێرەدا متمانە و خۆشەویستی تەواو لە نێوان سەرکردە و سەربازدا دەبینین.



# حیکمەتی خوا لە کشانەوەی سوپای موسڵمانان

ماکوان: لە ڕاستیدا بەو کشانەوەیە دەبێت هەموو لایەک دڵخۆش بێت، کە کۆتایی بە جەنگ هات لەگەڵ خەڵکی سەقیف، لەوانەیە لای هەندێک کەس سەیر بێت کەوا دەڵێم، چونکە ئەو کشانەوەی چەند سوودی هەبوو لە چەند دیدگادا:

سوودی یەکەم: ئەگەر فەتحی شاری طائیف بکرایە لەو ڕەوشە قورسە دا، جەنگێکی زۆر سەخت ڕووی ئەدا، شوێنکەوتنی هەوازن لە سەقیف هەروا ئاسان نەبوو لە ناو قەڵا و ماڵ و شاری خۆیاندا، بە دڵنیاییەوە کوشتنی زۆر ڕووی ئەدا کە جێگای داخ دەبوو، ئەو کوشتارە ئەوەندە زۆر دەبوو کە لە ژماردن نەدەهات، خەڵکەکەشی موسڵمانان نەبوبوون و دەچوونە نێو دۆزەخ، پاشان موسڵمانانیش شەهید دەبوون و سوپای ئیسلامی لاوازتر دەبوو، بەڵام لە داهاتوو هەموو موسڵمان دەبن و دەبنە هاوەڵی پێغەمبەر و هێز و توانایان دێتە سەر هێزی دەوڵەتی ئیسلامی.

سوودی دووەم: ئەم پاشەکشەیە خێری زۆری تێدابوو بۆ موسڵمانان، کە کارەکە بە ئەنجام نەگەیشت و گەڕانەوە دواوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر بهاتایە و پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جەختی لەسەر فەتحی طائیف بکردایە تا فەتحی دەکرد، ئەوا دوایی دەبووە سوننەتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و بۆ ئوممەتی ئیسلام نیشانەی زەحمەت و ناڕەحەتی دەبوو، بەڵام وا ئێستا پاشەکشە یەکێکە لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، بەم شێوەیە فێری کردن و بە جێیهێشتن بۆ سەرکردایەتی ئەمیری موسڵمانان لە جەنگ، یاخود شوورا.

نموونەی: خەیبەر ئەگەر زانیان دەتوانن بە ئارامگرتن فەتحی بکەن، نموونەی خەیبەر لەبەر چاودایە و سەروەری سەرکەوتن و گەورە بوو بۆ موسڵمانان، بەڵام ئەگەر زاندرا هیچ سوودی نییە و زەرەر و زیانیان زۆرترە، طائیف و نموونەی طائیف لەبەر چاودایە.

هەردوو حاڵەتەکە سوننەتی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و دەتوانین، ئەو خۆشەویستە بکەینە پێشەنگ و ڕابەری خۆمان.



## پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای هیدایەتی بۆ طائیف کرد

ماکوان: لە دوای گەڕانەوەی سوپاکە بۆ ناوچەی جعرانە، هەندێک لە هاوەڵان زۆر داخ لەدڵ بوون و توڕە بوون کە نەیانتوانی فەتحی شاری طائیف بکەن، هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، داوایان لێکرد کە دوعا و نزا لە سەقیف بکات بە لە ناوچوون و شکستیان.[٤٠]

پێغەمبەری خواش ﷺ بەو پەڕی هێمنی و خۆشەویستیەوە وەڵامی دانەوە، فەرمووی خوای پەروەردگار هیدایەتی سەقیف بدە و بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام و پەشیمان ببنەوە لە کوفر و بێدینیان.[٤١]

هەرگیزا و هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ پەیامەکەی لەبیر نەکردووە، کە دەیەوێت بە هەموو خەڵکی بگات، هاتووە بۆ بانگەوازیکردنیان نەک کوشتنیان، ئەگەر چی خەڵکی سەقیف هەموو دژی ئیسلامن و جەنگ لەگەڵ موسڵمانان دەکەن بە تەواوەتی ئیسلامی ڕەت دەکەنەوە و خۆیان بە لووتبەرز زانی و تەنانەت جەنگی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد، تەنانەت خودی پێغەمبەری خوایان ﷺ بەرد باران کرد و قسەی ناشرینیان پێ وت، کەچی پێغەمبەری بەردەوام بە هیوای ئەوەیە بێنە ناو دینی ئیسلام، ئومێدی زۆری بە موسڵمان بوونیان هەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: نموونەی من وەکو نموونەی کەسێکە ئاگرێکی کردبێتەوە، کاتێک ئاگرەکە بڵێسەدار دەبێت و هەرچی پەپولە و زیندەوەرە خۆیان فڕێئەدەنە ناو ڕۆشناییەکە و بە ڕووناکیەکەی هەڵدەخەڵەتێن منیش ڕێگریان لێدەکەم و ناهێڵم بکەونە نێو ئاگرەکە، بەڵام ئەوان هەرخۆیان بۆ ناو ئاگرەکە هەڵئەدەن، منیش باوەشم کردووە

---

[٤٠] ـ (قَالُوا: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، أُدْعُ اَللَّهَ عَلى ثَقِيفْ).

[٤١] ـ (اللّهمّ اهدِ ثقيفًا اللّهم اِهدِ ثقيفًا وَائْتِ بهم " رواه البخاري).



بە چواردەوری ئاگرەکەدا کە نەکەونە ناو ئاگرەکە، ئەوە نموونەی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە گشتی بۆ خەڵکی ڕەحمەتە، ناهێڵێت بکەونە ناو ئاگر.[٤٢]

خەڵکی طائیف دەیانویست خۆیان فڕێبدەنە ناو ئاگر، پێغەمبەری خوا ﷺ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە موسڵمان بن و وەکو نەفسی خۆی دەیانپارێزێت، تەنانەت بە مەلائیکەتەکانی شاری فەرموو لەگەڵ جوبرەئیل دا واتا بەهەردووکیانی ڕاگەیاند، بەڵکو خوای گەورە هیدایەتیان بدات و لە وەچە و نەوەکانیان خواناسی تێدا هەڵبکەوێت.

تەنانەت بۆ خەڵکی دەوس لە یەمەن هەمان نزای بۆ کردن لە کاتێکدا بە گشتی ئیسلامیان ڕەتکردەوە، فەرمووی خوای پەروەردگار هیدایەتی دەوس بدە و بیانگەڕێنێتەوە بۆ ئیسلام.[٤٣]

هەروەها لە جەنگی ئوحوددا قوڕەیش ٧٠ هاوەڵی پێغەمبەریان شەهید کرد، کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای هیدایەتی بۆ کردن و فەرمووی خوای پەروەردگار هیدایەتی هۆزەکەم بدە، هۆزێکی نەزان و بێ ئاگان.[٤٤]

خوای پەروەرگار ڕاستی فەرمووە:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ ۝﴾ [الأنبياء]

ئەو ڕەحمەتە بەتەنها بۆ موسڵمانان نییە، بەڵکو بە دڵنیایەوە بۆ هەموو خەڵکی ڕەحمەتە، لە دوای ئەو ئایەتە ئەقڵ و قەڵەم و خامە و شعر و پەخشان هەرچی ئەدەبیات و تابلۆی جوانی (ساتیستیک) لێیان بپرسە ئەوە شێوەکارە ؟؟ هەیە دەوەستن و توانای تەعبیریان نییە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٢] ـ (إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ اَلنَّاسُ كَمَثَلِ رَجُلٍ اِسْتَوْقَدَ نَارًا، فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ جَعْلُ الْفِرَاشِ وَهَذِهِ الدَّوَابُّ اَلَّتِي تَقَعُ فِي اَلنَّارِ يَقِهُنَّ فِيهَا، فَجَعَلَ يَنْزِعُهُنَّ، وَيَغْلِبْنَهُ وَيَقْتَحِمْنَ فِيهَا فَأَنَا أَخْذُ بِحَجَزِكُمْ عَنْ اَلنَّارِ، وَهُمْ يَقْتَحِمُونَ فِيهَا ) رواه البخاري ومسلم.

[٤٣] ـ (اَللَّهُمَّ اِهْدِ دَوْسًا وَآتِ بِهُمْ).

[٤٤] ـ (اَللهُمَّ اِهْدِ قَوْمِي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ).



# دابەشکردنی غەنیمەتی حونەین

ماکوان: لە دوای گەڕانەوەی هەموو سوپاکە بۆ دۆڵی جعرانە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە دابەشکردنی غەنیمەت، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ڕاکێشانی دڵی موسڵمانە نوێکان بۆ جێگیربوونیان، لەم غەنیمەتە زۆرەدا زیاتر خۆی تەرخان کرد بۆ ئەوەی ئەوان جێگیر بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ جۆری و نموونەی خەڵکەکانی باش دەناسی، خەڵکانێک هەن کەسایەتییان زۆر بە هێزە، کە چوونە ناو کارێک خۆیان بە خاوەنی کارەکە دەزانن، چاوەڕوانی ئەوە ناکەن کە سەرکردە و خەڵکی ئاڕاستەیان بکات، بەڵکو خۆیان ئۆتۆماتیک دەبنە سەرکردە و ئاڕاستەی خەڵکی دەکەن، ئەو جۆرە نموونانە لە هاوەڵاندا زۆر بوون، وەکو ئیمامی (ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، طەڵحە، ئەبو عوبێدەی کوڕی جەڕاح. سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، زوبێری کوڕی عەووام) زۆری تر، ئەگەر بڵێم هەموو ئەنسار و موهاجیری سەرەتا، بگرە کەمم وتوە بەڵکو هەموو کەسایەتی بەهێز و سەرکردەی ئەم ئیسلامە بوون، چاوەڕوان نەبوون لە پێغەمبەر ﷺ وەربگرن بەڵکو دەیانبەخشی لە پێناوی خودا.

نموونەی خەڵکێک بە دوای تێرکردنی ئەقڵییەوەیەتی، پارە و سەروەتی لا گرنگ نییە، لای گرنگە لەو ژیان و گەردوون و مرۆڤ و دەسەڵاتە تێبگات، لەوانە کە بەو هۆکارە موسڵمان بوون (نەجاشی ئەضحی، وەرقەی کوڕی نەوفەل، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە، ئەبو هورەیرە، ئەبو موسای ئەشعەری، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، سەلمانی فارسی) هەزارەهای نموونەی هاوەڵانی تر.

هەندێک لە خەڵکی کە موسڵمان بوون بە قیادەی سەربازی و ستراتیژی پێغەمبەر ﷺ لە پلان و ڕێکخستنی سوپا و ...هتد.

لەو نموونانە: خالیدی کوڕی وەلید، عەمری کوڕی عاص، عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل موخەرەق، محەمەدی کوڕی مەسلەمە، عوسمانی کوڕی طەڵحە، مالیکی کوڕی عەوفی نەصری، زۆریتر...هتد.



نموونەی خەڵکی زۆرە لە چۆنیەتی سرووشتیان، سەرسامییان بە بەشێکی ئیسلام موسڵمان کردووون، لێرەوە بەشێکی باس دەکەم کە لە ڕێگەی گیرفان و سکیان جێگیر دەبن و موسڵمان بوونیان بەردەوام دەبێت.

هەندێک لەوانە باس دەکەم لە نموونەی تێرکردنی سک و گیرفانیانن، بەڵام مانای وانییە کە مافی خەڵکی داگیر بکەن، بەڵام حەزیان بە پارە و سەروەت و سامانە لە چ ڕێگایەک پارەیان دەست بکەوێت ئەو ڕێگایەیان لا خۆشەویستە.

بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کە لە جەنگی طائیف دا بینی صەفوان کوڕی ئومەییە موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند بە هۆکاری هێز و توانای موسڵمانان بوو، ئەو هەموو دەستکەوتەی دەستیان کەوت، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە غەنیمەت ١٠٠ وشتری دایە هەر بۆیە صەفوان دەڵێت: ئەو بەخشینەی پێغەمبەر پێی بەخشیم لە هیچ کەسم نەدیبوو، ئەو کەسەی کە لە ژیانمدا خۆشم نەویستووە (محمد) بووە، بەڵام ئێستا بە هۆکاری ئەو هەموو بەخشینەی لەخۆمم خۆشتر دەوێت.

بۆ ڕاکێشانی دڵی خەڵکی بەم جۆرەی صەفوان بۆ جێگیر کردنیان لە ئیسلام دا سەروەت و سامانێکی زۆریدا بە سەرکردەکانی قوڕەیش و غەطەفان و تەمیم.

بۆ نموونە ١٠٠ وشتری دایە ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب، ١٠٠ وشتری دا بە سوهەیلی کوڕی عەمر، ١٠٠ وشتری بە حەکیمی کوڕی حیزام و عویەینەی کوڕی حوصنی خیزاری، بە ئەقرەعی کوڕی حابس و سەرو ١٠٠ وشتری بە کوڕەکانی ئەبو سوفیان (معاویە و یەزید) و پاشان قەیسی کوڕی عودەی و زۆری تر، ئامانج لەم بەخشینە زۆرە تەنها و تەنها بۆ جێگیر بوونیان بوو لە ناو ئایینی ئیسلامدا.

بەڵام لە کاریگەری بەخشینی زۆری غەنیمەت بەم تازە موسڵمانانە، زۆر قورس بوو لە دڵی هەندێک موسڵمانی ئەنساری، سەعدی کوڕی عوبادە چووە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و گلەیی ئەنساری بردە لای، فەرمووی بەشێک لە ئەنساری گلەیی ئەوە ئەکەن کە ئەو هەموو سەروەت و وشترەت لە غەنیمەت بەخشی بە کەسانی تر، ئەوان بێبەشبوون لەو بەخشینەی جەنابتان تا ڕادەیەک ڕازی نین، پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەی تۆ دەڵێی چی سەعد لەو بارەیەوە؟!



سەعد بە ڕاستگۆیی وتی: منیش ئەوە دەڵێم کە هۆزەکەم دەڵێت!

ئەمەش حاڵەتێکی زۆر سرووشتییە لە ناو مرۆڤدا، ئەوان زیاتر مەبەستیانە هۆکار بزانن و حیکمەتی ئەو هەموو بەخشینە تێناگەن، دەیانەوێت لەو حیکمەتە تێبگەن، زۆر جار مرۆڤ لە ئاستی تەماع و حەزەکانی بۆ ژیان یاخود تێگەیشتنی ئەقڵی زۆر زۆر بچووک دەبێتەوە، دوایی کە هەست بە خۆی دەکات زۆر پەشیمان دەبێتەوە، خۆی زۆر لەوە گەورەتر هەیە کە دەبێت بەدەستی بهێنێت.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد لە سەعدی کوڕی عوبادە فەرمووی هۆزەکەتم لەم جێگایەدا بۆ کۆبکەرەوە.

سەعد هەڵسا بە ئەنجامدانی کارەکە، هەموو ئەنسارى کۆکردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی بۆ دان لە دوای بسم الله و سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار، ئینجا ڕووی کردە ئەنسار و فەرمووی: قسەکانتانم بە کەسی نزیکی خۆتان پێگەیشتووە ئەوەی لە ناخ و دڵ و دەروونتاندایە و وتووتانە.

ئەی باشە ئەوە بە غەنیمەت نازانن کە سەر لێشێواو و گومڕابوون خوای گەورە هیدایەتی دان؟! وێڵ و سەرگەردان بوون، خوای گەورە بەمن دەوڵەمەندی کردن؟ دوژمنی یەکتر بوون خوای پەروەردگار خۆشەویستی خستە دڵتان؟

هەموو وتیان: بەڵێ منەتی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی بەسەرمانەوە.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی گەلی ئەنسار بۆ وەڵام نادەنەوە؟

ئەنسار وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن وەڵامت بدەینەوە چی بە جەنابت بڵێین؟! منەتی پێغەمبەر زۆرە بەسەرمانەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وەڵڵاهی ئەگەر ئارەزوو بکەن ئێوەش ئەتوانن وەڵامی من بدەنەوە ڕاستگۆن و بە ڕاستگۆتان دەزانم، بڵێن لە لایەن خەڵکییەوەیە بە درۆزن ناسرابووی ئێمە باوەڕمان پێکردی، شکست خواردووبوویت ئێمە سەرمان خستی، دەرکراو بوویت ئێمە جێگامان کردیتەوە، بێناز بوویت نازمان کێشایت، باش بزانن ئەی گەلی ئەنسار کۆمەڵێکی نوێ



موسڵمان بوون بە ماڵی دنیا ڕازی دەبن و ئیسلامەتیان جێگیر دەبێت، منیش ئەوەی بەخشیم بۆ ئیسلام بەخشیومە.

ئەی گەلی ئەنسار بەوە ڕازی نابن خەڵکی بگەڕێنەوە وشتر و مەڕ و ماڵات لەگەڵ خۆیان ببەن، ئێوەش لەگەڵ خۆتان من بەرنەوە و پێغەمبەرەکەتان لەگەڵ خۆتان بەرنەوە بۆ شاری مەدینە؟!

سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەوەی ئێوە بە خێری دەزانن خێری زیاترتان دەست دەکەوێت، سوێند بەخوا ئەگەر هیجرەتم نەکردایە لە مەککەوە بۆ شاری مەدینە، ئەوا خۆم بە کەسێکی ئەنساری هەژمار دەکرد، ئەگەر هەموو خەڵکی بە ڕێگا و دۆڵێکدا بڕۆن، من ڕێگا و دۆڵی ئەنسار هەڵدەبژێرم، ئێوەی ئەنسار داپۆشەری گیانمانن وەکو بەرگی وان لەبەر مرۆڤدا.

ئەی خوای خاوەن بەزەیی یا ئەرحەمەڕاحمین، ڕەحم بە ئەنسار بکە و بە ئەوەی ئەنسارە و بە نەوەی ئەنسار.

ئینجا هەموو ئەنسار ئەوەندە گریان و دڵ نەرم و پەشیمان بوون، تەنانەت فرمێسک ڕیشی پیاوانی ئەنساری تەڕکرد، هەموو بەیەک دەنگ وتیان ڕازین بە بەشی خۆمان کە پێغەمبەری خوایە.

پاشان پێغەمبەر ﷺ تەشریفی برد و ئەنساریش بڵاوەی لێکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی ئەنسار زۆر لەوە گەورەتر بیر بکەنەوە، خەڵکی وشتر و مەڕ و ماڵات دەباتەوە، ئەمان پێغەمبەری خوا ویستی فێریان بکات ئەوانە نوێن بۆ ڕەزامەندی دڵیان ماڵی دونیا جێگیریان دەکات.

لەکاتی بەخشینی غەنیمەتدا ئەعرابەکان زۆر ئازاری دڵی پێغەمبەری خوایان دا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ زۆر ئارامی گرت و فەرمووی موسای برام زۆر لەوە زیاتر ئازاریان داوە، بە پێغەمبەری خوایان وت بە دادپەروەری غەنیمەتەکە دابەش ناکات، چونکە کابرای ئەعرابی خۆی وەکو صەفوان و ئەبو سوفیان دەبینی لە ڕووی پلەدارییەوە!



بەهەرحاڵ کۆتایی بە دابەشکردنی غەنیمەت هات و سوپا ویستی بۆ شاری مەککە بگەڕێتەوە، بەڵام ڕووداوێکی زۆر سەیر ڕوو ئەدات لە دۆڵی جعران.



## هاتنی وەفدی هەوازن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ

ماکوان: دابەشکردنی غەنیمەت و دەستکەوت کۆتایی هات و هەموو بەبەشی خۆی ڕازی بوو، بەڵام ئەوەی کە ڕووئەدات لە بڕوای هیچ کەسدا نییە، سەرکەوتن لە جێگایەکەوە دێت کە نەک بیری لێناکەیتەوە، بەڵکو بە خەیاڵیشتدا نەهاتووە، وەفدی هەوازن هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، بەڵام لە تیرەی (بەنو نەصر) و (بەنو سەعدی) واتا هەردووکیان لە هۆزی هەوازن بوون، بەڵام سەقیف نەهاتبوو، هاتن بۆ دۆڵی جعرانە موسڵمانان خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆ گەڕانەوەیان بۆ شاری مەککە، هاتن بە شیعر هەڵدان بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

امْنُــنْ عَلَيْـنَا رَسُـــولَ اللَّهِ فِـي كرمٍ ... فَإِنَّـكَ الْمَـرْءُ نَـرْجُـوهُ وَنَدَّخِـرُ

امْنُنْ عَلَى نِسْوةٍ قَدْ كُنْتَ تَرْضَعُهَا ... وَإِذْ يَـزِينُـكَ مَا تَأْتِي وَمَا تَـذَرُ

لَا تَجْعَلَنَّا كَمَنْ شَالَتْ نَعَامَتُــهُ ... وَاسْتَبْقِ مِنَّا فَإِنَّا مَعْشَرٌ زُهُرُ

إِنَّا لَنَشْكُرُ لِلنُّعْمَى وَإِنْ كُفِــرَتْ ... وَعِنْدَنَا بَعْدَ هَذَا الْيَوْمِ مُدَّخَرُ

وەفدی هەوازن ئەو شیعرەیان بۆ ئەوە وت تا دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ نەرم بکەن، بەڵام سەرەتا کەس نەیدەزانی بۆ هەڕەشە هاتوون، یاخود بۆ دانوستان، یاخود بۆ دانانی کات بۆ جەنگی داهاتوو بۆ تۆڵە سەندنەوە؟!

بەڵام ١٤ کەس لە ناو هەوازن لە گەورە پیاوانیان هاتبوون، بۆ ڕاگەیاندنی ئەوەی کە هەموو هۆزی هەوازن لە تیرەی بەنو سەعد و بەنو نەصر موسڵمان دەبن.

لە دوای دوو مانگ لە جەنگ ماڵ و سەروەت و سامان و ژن و منداڵ و کەسوکاریان هەموو لەدەست دا، خۆ ئەگەر لەسەر هاوبەشدانان و شەریک دانان بۆ خوا دابنێن ئەوە داهاتووی هەمووان تیاچوونە، خۆ ئەگەر هەروا بمێننەوە ئەوا هەموو ژیانیان دەبێتە پەناهەندەیی لە ناو شاری طائیف دا، ماڵ و جێگا و حاڵیان لە ناو دەچێت بۆیە ناچار گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەری



خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم، تاوەکو ئیسلام بوونیان لێ قبوڵ بکات، ڕەوشی ئەو هۆزە زۆر سەخت و ترسناک بوو، بەڵکو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم کەمێک لە ماڵ و ژن و منداڵیان بۆ بگەڕێنێتەوە.

دیارە بە خۆشی خۆیان و ڕەغبەت نەهاتوونەتە ناو ئیسلام، بەڵام کێشە نییە چونکە ئەگەر ماوەیەک لە خودی ئیسلامدا ژیان فێر بوون خۆیان ئۆتۆماتیکی قبوڵی دەکەن و بە سرووشتیان دوایی ئیسلامیان خۆش دەوێت بۆی دەژین و بۆی دەمرن.

هەموو هەوازن موسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، بێجگە لە سەقیف، لەبەردەم پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم پاشان وتیان: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم ( خۆت دەزانیت چ بەڵایەک بەسەرماندا هاتووە بۆت شاراوە نییە، منەت و گەورەیی خۆت بکە بەسەرماندا؟!

پاشان (زاهیری کوڕی صەرد) لە بەنو سەعد وتی: ئەی ڕەسولی خوا ئەوانەی گیراون لە جەنگدا هەموو پوور و خوشک و کەسوکاری خۆتە لە باوەشیان گرتووی بە منداڵی، شیریان پێداویت خۆ ئەگەر شیر و پەروەردەیان بۆ منداڵی (حارسی کوڕی ئەبی شەمەری غەسانی، یاخود بۆ نوعمانی کوڕی مونزیر) دوو کەسی دڵڕەقی خراپە کار بوون، کە پێشتر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم سوپای کردە سەریان لە جەنگی موئتە و زاتول سەلاسیل ئەوان عاطیفە و سۆزیان دەجوڵا، جا ئێمە لە تۆ زیاتر ڕادەبینین کە تۆ لە هەموو ئەوانە باشتریت، ئینجا کۆمەڵێک شیعری عاطفییان بەسەر پێغەمبەردا خوێندەوە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم: هیچ وەڵامی نەدانەوە بڵێت ئاخر خۆ ئەو کەسانەی کە بە پوور و خوشکی من داتان ناون بۆ جەنگ دژی من هێنابووتان، هیچی وای نەوت.



## گەڕانەوەی هەموو کەس و کار و ژن و منداڵ بۆ هەوازن

ماکوان: ڕەوشەکە لەوپەڕی سەختی و گرفت(حەرەج) دایە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، هەموو غەنیمەت دابەش کراوە، ٦ هەزار ئافرەت و منداڵ دابەش کراوە، بێجگە لەو هەموو وشتر و وڵاغ و مەڕ وماڵاتە، زۆرێک لە غەنیمەتەکان بەسەر موسڵمانە نوێکاندا دابەشکراوە بۆ ڕازیکردنی دڵیان، ئێستا چۆن لێیان وەربگرێتەوە؟!

لەو کاتەدا بۆ زیاتر هاندانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووداوێکی زۆر عاطفی ڕوونەدات، ئافرەتێک دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەناوی (شەیمای کچی حارس) لەو ئافرەتانە بوو کە بوونەتە کەنیزەیەک و لە جەنگدا گیراون! بە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت من خوشکی شیریی تۆم.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: هیچ نیشانەیەکت هەیە کە تۆ خوشکی شیریی منیت؟! شەیمای کچی حارس دەڵێت لە کاتی منداڵی دا زۆر جار فشارم بۆ دەهێنایت تۆش جارێک گازێکت لە پشتم گرت، ئەوە نیشانەی خوشک و برایەتیمانە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ زانی ڕاست دەکات، عەبای سەرشانی داکەند و بۆی ڕاخست و زۆر ڕێزی لێ گرت، پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کرد و چەند مەڕ و ماڵات و کەسێکی بەخشی بە شەیمای خوشکی و ئازادی کرد بگەڕێتەوە بۆ ناو کەس و کاری.

دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ لە بیرکردنەوەی ئەم قەیرانە گەورەیەدا چۆن ئەو سەروەت و سامانە بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو گەلە، نایەوێت ئەوانەی نوێن هەڵبگەڕێنەوە، ئەیەوێت بە جێگیربوونیان بمێننەوە، لێرەوە مەنهەجی ئیسلامی دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خۆشەویست چۆن پیادەی دەکات و لەو قەیرانە دەربازی دەبێت بە باشترین شێوە، ئەگەر چی بۆ پێغەمبەر ﷺ زۆر سەخت بوو، بەڵام هەوڵی جدی دا بۆ ئەوەی دڵی هەموو لا ڕازی بکات، هەربۆیە هەڵسا بە ئەنجامدانی چەند هەنگاوێکی زۆر گرنگ، ئەو هەنگاوانە تەنها لایەقە بۆ خودی پێغەمبەر و پێغەمبەرایەتی، هەنگاوەکان بریتی بوون لە:



هەنگاوی یەکەم: هەوڵی ئەوەیدا بگاتە ئەنجامێکی ناوەندگیر لە نێوان سوپا و خەڵکی موسڵمانبووی هەوازن، چونکە ناتوانێت هەموو شتەکانیان بۆ بگەڕێنێتەوە بەڵام بۆ ئەوەی ئەوانیش جێگیر بکات لەسەر دینداری و خواناسیدا، زۆر بە ڕاشکاوانە بە هەوازنی فەرموو: منداڵ و خێزان و ئافرەتەکانتان دەوێتەوە، یاخود سەروەت و سامان و وشتر و مەڕ و ماڵات؟[٤٥]

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کەسێکی واقیعی بوو، بۆیە دوو هەڵبژاردەی دانێ، بە عاتیفە لەگەڵیاندا کاری نەکرد بەڵکو بە ئەقڵ، دەبێت ئەوانیش ئەوە باش بزانن کە سەروەت و سامان و ژن و ماڵ و منداڵیان بە دزی نەبراوە، بەڵکو لە جەنگدا گیراون، هەوازن باش لەوە تێدەگەیشت، کە ئەوەی بۆیان دەگەڕێتەوە لە کەرامەت و ڕێزی موسڵمانانە، بۆیە ئەوانیش ڕاستەوخۆ وتیان: ئەی ڕەسولی خوا دوو هەڵبژاردەت خستە بەردەممان لە ماڵ و سامان، یان ژن و منداڵمان، بە دڵنیاییەوە منداڵ و ژن و ئافرەتەکانمان دەوێتەوە.

بەمەش لە هەنگاوی یەکەم سەرکەوتووبوو، پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ توانی بگاتە چارەسەرێکی ناوەندگیر لە نێوان موسڵمانان و هەوازندا.

هەنگاوی دووەم: هەوازن بە تەواوەتی هەستیان بەوە کرد کە پێغەمبەری خوا چۆتە طەرەفی ئەوان و هەموو بەیەکەوە لەیەک خەندەق دان، زانیان پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر عاتیفە و هەست و سۆزی لەگەڵیاندایە، بۆ گەڕانەوەی هەموو ژن و منداڵ و کەسوکاریان، ئینجا هەنگاوی دووەمی بریتیی بوو لەوەی (کە هەرچی بەر هۆزی عەبدولموتەڵیب کەوتووە هەموویان بۆ بگەڕێنێتەوە). [٤٦]

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ سەرکردەیەکی دیکتاتۆر و تاکڕەو نییە، ناتوانێت بە زۆر ئەوەی بەخشیویەتی بە سوپاکەی لێیان وەربگرێتەوە، بۆیە هەنگاوی دووەمی هەرچی بەر خۆی و هۆزی بەنو عەبدولموطەلیب گەیشتووە بۆیان دەگەڕێنێتەوە، ئەم بەخشینە هاندانی هاوەڵانە بۆ چاولێکردن لە سوننەتی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەمەش واقعیەتی بەخشینی پێغەمبەری خوایە صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوەی دەتوانێت دەیبەخشێت، چونکە ئێستا

---

[٤٥] ـ (أَبْنَاءُكُم وَنِسَاءُكم أَحَبَّ إِلَيْكم أَمْ أَمْوَالُكُم).

[٤٦] ـ ( أَمَّا مَا كَانَ لِي وَلِبُنَيِّ عَبدالْمُطَلِيبْ فَهُوَ لَكُم).



هەر خوای گەورەیە هۆزی عەبدولمتەڵیبی بێجگە لە پێغەمبەرایەتی ڕابەری گشتی هەموو موسڵمانانە، هەموو عەشیرەتی پێغەمبەر ﷺ ڕازیبوون بە گەڕانەوەی مەڕ و ماڵات و ماڵ و منداڵیان.

واتا بە گشتی هیچیان لای خۆیان نەهێشتەوە، یاخود تەنها لە گەڕانەوەی ماڵ و منداڵەکانیان، بەڵام پێدەچێت هیچیان لای خۆیان گل نەدابێتەوە.

هەنگاوی سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێکەوت لەگەڵ هەوازن دا، کە لەکاتی هەڵسان بۆ نوێژ لەبەردەم موسڵمانان دا داوا لە سوپا بکەن کە سەبی و کەنیزەکەکانیان بۆ بگەڕێننەوە، ئەم هەڵوێستەش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو تواناکانی دەخاتە گەڕ لە پێناوی هۆزێکدا کە پێش لە دوو مانگ جەنگیان لەگەڵ دەکرد، لەسەر ئەوە کۆک بوون موسڵمانان هەموو لەناوبەرن، بەڵام وا لەوپەڕی خۆشەویستی و ڕەحم دا لەگەڵیاندا هاوخەمە، بۆیە ئەو خۆشەویستە فەرمووی بە پیاوانی هەوازن: لەوکاتەی هەڵدەستم بۆ نوێژی نیوەڕۆ نوێژ تەواو دەبێت، هەڵسن و بڵێن، من داوای شەفاعەت دەکەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ موسڵمانان داوا دەکەم لەموسڵمانان شەفاعەتیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئافرەت و منداڵەکانمان بۆ بگەڕێنێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منیش هەڵدەستم داواکانتان بۆ دەکەم.[٤٧]

خۆ پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لای عەبدولموتەڵیب بوو بە نەهێنی وەری نەگرتەوە، بەڵکو لەوێدا ویستی بە ئاشکرا باسی بکات تا موسڵمانان چاوی لێبکەن لاسایی بکەنەوە، ئەوەی بوو بە موڵکی ئەو سوپایە بیگەڕێننەوە، هەوازن پاش ئەو وتەیەی شەفاعەتە زۆر کاریگەر دەبێت لەسەر دڵ و دەروونی موسڵمانان.

پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو شەفاعەتە قبوڵ دەکات، ئەوەش شتێکی ئەستەمە موسڵمانان شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتبکەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ واقیعەتی داواکاریەکەیان بۆیان ڕوون دەکاتەوە، ئامۆژگاریان دەکات داوای

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٤٧ ـ فذا صليت الظهر فقوموا فقولوا إنا نستعين برسول الله على المؤمنين أو المسلمين في نسائنا وأبنائنا فلما صلوا الظهر قاموا فقالوا ذلك.النسائي.



وشتر و مەڕ و ماڵات نەکەنەوە، تەنها داوای منداڵ و ژن و ئافرەتەکانیان بکەنەوە، بۆ ئەوەی سەخت نەبێت لەسەر گشت موسڵمانان و داواکەیان ڕەت بکەنەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پەیمانی دا بە هەوازن کە خۆی داوا دەکات لە موسڵمانان، بۆ گەڕانەوەی سەبیەکانیان هەڵدەستێت بەو کارە.

ئەمەش ئەو مامەڵە شارستانی و پێشکەوتنەیە کە خەڵکە خوانەناسەکان ناوی دەنێن، بەڵام لە ڕاستیدا کاری ئیسلامەتی و لایەنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەو کارە هەر تەنها و تەنها لەو دەوەشێتەوە.

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە نوێژەکەی تەواو بوو وەفدی هەوازن هەڵسا بەوکارەی کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فێری کردبوون، ئەوەی پێویست بوو لەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەیویست لە ناو کۆمەڵەی موسڵماناندا وتیان.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەسەر داواکەیان هەڵسا و فەرمووی ئەوەی بەر من دەکەوێت لەگەڵ نەوەکانی عەبدولموتەڵیب هەمووتان بۆ دەگەڕێنینەوە.



# هەڵوێستی موسڵمانان لە بەرامبەر گەڕانەوەی سەبییەکان

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی لە توانای دابوو ئەنجامی دا، بەڵام وەڵام دانەوەی موسڵمانان دوو جۆر بوو، زۆربەی موهاجیر و ئەنسارییەکان، هەموویان گەڕاندەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان چیمان بەرکەتووە لەسەبیی هەموو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕێنینەوە.

بە واتای ئەوەی کە بۆ شەفاعەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئافرەت و منداڵەکانیان گەڕاندەوە بۆ هەوازن، بەڵام هەندێکیان ڕازی نەبوون وتیان بۆیان ناگەڕێنینەوە.

یەکەم کەس هەڵسا لەناو سوپاکەدا کە ڕازی نەبوو بریتیی بوو لە :

١- ئەقرەعی کوڕی حابس، گەورە و سەرکردەی بەنو تەمیم، وتی: ئەوەی بەرمان کەوتووە نایگەڕێنینەوە.

٢- عویەینەی کوڕی حیصن، لە هۆزی فەزارە، ئەویش وتی: ئەوەی بەرمن و هۆزەکەم کەوتووە نایگەڕێنینەوە.

٣- عەباسی کوڕی مرداس، سەرۆکی هۆزی سولەیم، ئەویش هەمان هەڵوێستی هەبوو، بەڵام هۆزەکەی قسەی عەباسیان شکاند و وتیان ئێمە وەکو بەنو سولەیم هەموو سەبییەکان دەگەڕێنینەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە واتای گەڕانەوەیان بۆ هەوازن.

کەواتە ئێستا دوو کێشەی تر هاتە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بریتی بوو لە:

کێشەی یەکەم: دوو هۆز ڕەتیان کردەوە سەبییەکان بگەڕێننەوە، هۆزی فەزار و تەمیم بوون ڕازی نەبوون، ئەمەش کێشەیە بۆ موسڵمانبوونی هەوازن.



پێغەمبەری خوا ﷺ زانی لە هەوەس و ئارەزووویان لە بارەی پارە و ماددەوە بۆیە بە ماددە مامەڵەی لەگەڵ کردن، چونکە بەم شێوە لەگەڵ سرووشتیان گونجاوە لەم قۆناغەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ لۆمەی نەکردن بەوەی شەفاعەتەکەیان قبوڵ نەکردووە، بەڵکو داواکارییەکی بەنرخترى خستە بەرچاویان، فەرمووی: هەرکەس سەبایەی هەوازن بداتەوە، لە بەرامبەر دا ٦ سەبیی تری ئەدەینێ لەهەر دەستکەوتێکی داهاتوودا.[48]

ئەمە ئەوە نیشان ئەدات کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بەخەمی هەوازنەوەیە، لە کاتێک سەرسەخترین دوژمنی پێغەمبەر ﷺ بوون، هەموو چەند کاتژمێرێکە موسڵمان بوون، بۆ خاتری موسڵمانبوونی ئەوان دەوڵەتی ئیسلامی خۆی ٦ جار قەرزاربارى هۆزی تەمیم و فەزارە دەکات.

هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دانوستانی لەگەڵ کردن، هەر بۆ ئەوە بوو کە ئەمری نەکردووە بەسەریاندا، چونکە بەهەموو پێوەرێک حەقی خۆیانە، پێغەمبەر ﷺ باش لە سرووشت و چەشنی مرۆڤ تێگەیشتوە، باش دەزانێت سنووردانان و پەروەردەی چییە، تێگەیشتوە لە بنەڕەتی سەرکردایەتی کردن، باش لە بنەماکانی ئیدارە و ڕێکخستن و حوکمڕانی و ڕێگاکانی تێگەیشتووە، هونەری مامەڵەکردن دەزانێت لەگەڵ هەموو خەڵکی بە گشتی، بەسە بۆ ئەو کە صیفاتی پێغەمبەرە و سنووری لەناو مرۆڤایەتیدا نییە، نموونەی دەست ناکەوێت تەنها و تەنها خۆی لە خۆی دەچێت، ئەستەمە لە گەورەیی و لێهاتووی ئەو پیاوە تێبگەین، ئەگەر هەموو ژیانمان تەرخان بکەین بۆ لێکۆڵینەوەی ژیانی، بەشتان هەر لەسەرەتا داین کەواتە قورئان باشترین پێناسەی پێغەمبەرە ﷺ.

لەبەر ئەو داوا گەورەیەی پێغەمبەر ١ بە ٦ ڕازی بوون هۆزی سولەیم و فەزارە هەموو سەبییەکانیان گەڕاندەوە بۆ هەوازن، هیچ منداڵ و ژن و کچێک نەما هەموو گەڕانەوە ناو هەوازن و پێغەمبەری خوا ﷺ توانی لەم هەنگاوە پیرۆزەیدا سەربکەوێت، کێشەی یەکەمی چارەسەر کرد.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[48] ـ (منْ تَمَسَّكَ بِحَقِّهِ مِن السَّبَى فَلَهُ بِكُل إنْسانٍ سِتَّه فَرائِض مِنْ أَوّل شَيءٍ نَصيبُهُ).



کێشەی دووەم: کاتێک دەستی پێکرد لە ڕووکەشدا کێشەیەکی بچووکە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە جدی وەریگرت، چونکە بەرکەوتن لە نێوان عەباسی کوڕی حەرداسدا، گەورەی هۆزی بەنو سولەیم و هۆزەکەی ڕاجیایی کەوتە نێوانیان، ئەمەش واتای ئەوەیە هۆزەکەی بەقسەی گەورەکەیان ناکەن بە ئاشکرا دژی وەستانەوە لەم بوارانەدا شوورا هیچ ڕۆڵێکی نابێت، شوورا لەسەر موڵکی شەخسی بڕیار نادات و ئەگەر زۆرینە دەنگی هێنا موڵکی خەڵکی زەوت بکرێت، سەبییەکانیش موڵکی تاکە کەسە، هەربۆیە داوای لێکردن هەموو بەیەکەوە ڕێکبکەون و گەورە و ناسراوێک هەڵبژێرن و بڕیاری خۆتان بدەن، تا بزانین بڕیارەکەتان چییە؟!

مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کە ڕای جیاوازیان نەبێت. [٤٩]

تا لە کۆتاییدا هەموو هۆزەکە کۆبوونەوە ئەوانیش هەموو منداڵ و ئافرەت و ژنەکانیان گەڕاندەوە بۆ هۆزی هەوازن، هەوازنیش باش لەوە تێنەگەیشتن کە مامەڵە لەگەڵ سەرۆکی دەوڵەتە یاخود زەعیم و گەورەی عەرەب، بەڵکو مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەردا دەکەن، ئەمەش بووە هۆکاری جێگیرکردنی ئیسلامەتی لەناو هەوازن دا بە گشتی.

---

[٤٩] ـ (انَّا لا نَدْري مَنْ أذِنَ مِنْكُم فِي ذَلِكَ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنَ فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ الَيْنَا عُرَفَائُكُمْ آمْرُكُم).



# موسڵمانبوونی مالیکی کوڕی عەوف

ماکوان: عەزەمەتی پێغەمبەر ﷺ لەوە دابوو بە موسوڵمانبوونی خەڵکی هەوازن وازی نەهێنا، بەڵکو هەستا بە کارێکی زۆر نایاب و سەرسوڕهێنەر کە تەنها لایەقی پێغەمبەرایەتییەتی.

لە ئێستا هەموو هەوازن موسڵمان بووە، ئەوەی کە ماوە سەرۆک و سەرکردە لاوەکەیانە کە خۆی شاردۆتەوە لە ناو شاری طائیف و لە ناو هۆزی سەقیفدا پەناهەندەیە، ئەو سەرکردەیە دەیویست هەموو موسڵمانان لە ناو بەرێت بۆ یەکەم جار لە مێژووی عەرەبدا ٢٥ هەزار سەربازی کۆکردەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە وەفدەکەی هەوازن وەڵامی نارد بۆ مالیکی کوڕی عەوفی نەصری فەرمووی: پێی بڵێن ئەگەر بە ئیسلامەتی ڕازی بێت و موسڵمانبوونی خۆی ڕابگەیەنێت ئەوا ماڵ و منداڵ و ژنی بۆ دەگەڕێنینەوە و سەروەت و سامانەکەشی و هەروەها ١٠٠ وشتری بە دیاری ئەدەینێ.[٥٠]

پێغەمبەری خوا ﷺ ئامانجی لەم ژیانەدا، تەنها ڕێنوێنی خەڵکی بووە بۆ هیدایەتیان بۆ ڕێگای خوای موتەعال، هەرگیز بە دوای ڕابردوویان نەڕۆیشتووە، ڕەچاوی داهاتوویانی کردووە، ئەوەی لەبەرچاویدابووە با مرۆڤەکەش ترسناک و زیانی هەبێت بۆ کۆمەڵگە، بەڵام ئامانجی ئەوەبوو چۆن بیکاتە پیاوێکی چاکەخواز و باش بۆ کۆمەڵگەکەی، هەموو یاسا و دەوڵەتانی جیهان بە دوای چاکەی خەڵکی خراپەوە نین، بەڵکو بیر لە زیندان و کوشتن و لەناوبردن و سڕینەوەیان دەکەنەوە، تەنها و تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لای چاکەکردنی خەڵکییە و بەرەو بەهەشت ڕێنمونییان دەکا، پێغەمبەر ﷺ توانای مرۆڤەکانی دەزانی، بۆیە بەهەر یەکێکیان حەق و مەکانەتی خۆی پێدەبەخشی، مالیکی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٠] ـ (أخْبِروا مَالِكاً إنْ أتَانِي مُسْلِماً رُدَّتْ الَيْهِ أهْلَهُ وَمَالَهُ، وأعْطِيَتَه مِأةً مِنَ الْإبْلِ).



کوڕی عەوفی نەصری لەو گەنجە بەتوانا و بەهێز و سەرکردانە بوو کە دەبوو بانگ بکرێت بۆ ئیسلام توانا و هێز و چالاکییەکانی لەناو ئەم ئیسلامەدا وەگەڕبخات.

هەموو ئەمانە بێگومان لە بیری پێغەمبەر ﷺ دابوو کە لاوێک لە تەمەنی ٣٠ساڵیدا بتوانێت ٢٥ هەزار کەس کۆ بکاتەوە، هەموو سەروەت و سامانیان پێبهێنێت بۆ جەنگ ئەم پیاوە لە دەرەوەی موسڵمانان دابێت زۆر ترسناکە، بەتایبەت لە ناو شاری طائیف و قەڵا بەهێزەکانیان، تا ئەم کاتەش هەموو خەڵکەکەی کافرن، هەربۆخۆی وجودی مالیک خەتەر و ترسناکی گەورەی هەیە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، ئەو هەموو کەسەی کۆکردەوە لە پێناو ئامانجێکی زۆر هیچ و پووچ، ئەی ئەگەر ئەم توانایە لە ناو هێزی موسڵمانان دابێت و ببێتە یەکێک لە سەرکردە ئیسلامییەکان چ هێز و قورساییەک ئەدات بە سوپای موسڵمانان، بیر لەوە بکەرەوە ئەگەر ببیتە موجاهید لە پێناوی خودا، لە جیاتی ئەوەی جەنگاوەر بیت لە پێناوی هەوازندا؟

هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ جەختی لەسەر کردەوە کە دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی شکۆی بۆ بگەڕێنێتەوە و کەرامەتی پارێزراو بێت بەوەی ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامان و دیارییش وەربگرێت، هەمووی بۆ بگەڕێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی موسڵمانبوونی هەوازن شکستی گەورەتربوو لە حونەین بۆ مالیک، نەیویست زیاتر بشکێت و بێ سەرباز بمێنێتەوە، ویستی لە سەربازگەی ئیسلامی دا بەشدار بێت و ببێتەوە سەرکردەیەکی سەربازی گرنگ، هەر بۆیە ئەو چاکەیەی لەگەڵ کرد و بەو شێوەیە دەرگای گەڕانەوەی بۆ کردەوە و ئەو پڕۆژە بەنرخەی خستە بەردەمی و بووە سەرلەنوێ لە دایک بوونەوەی.

ئەوەی دەیەوێت فێری حیکمەت بێت پێویستە باش شارەزابێت لە ژیانی سەروەرمان (محمد) موستەفا ﷺ.

هەواڵ گەیشتە مالیکی کوڕی عەوف، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕوانی دەکرد ئەوە ڕوویدا، چونکە ڕەوشی زۆر قورس و ترسناک بوو، تەنانەت لەوێش دەترسا کە هۆزی سەقیف بیکوژن، چونکە لە ناو شاری طائیف چواردەوری گیرابوو چونکە دەیانزانی ئەو هۆکار بووە بۆ شکستی هەوازن و موسڵمانبوونیان، بۆیە زۆر ئەترسا لە ناو شاری طائیفدا، کەسی لەگەڵ نەمابوو هەموو هاتبوونە بەرەی موسڵمانان.



هەر هەواڵەکەی پێغەمبەری صلى الله عليه وعلى آله وسلم پێگەیشت بێ دوودڵی و دەستبەجێ هەڵسا و بەپەلە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بۆ ئەوەی موسوڵمانبوونی خۆی ڕابگەیەنێت، چووە خزمەت پێغەمبەر و موسڵمان بوو، هیچ کەس ئەو ڕەوشەی بە خەیاڵدا نەهاتووە پێش دوو مانگ لە حونەین جەنگیان کرد وا ئێستا هەموو موسڵمان بوون، ئەوە تەنها لە مەنهەجی ئیسلام ئەم مامەڵەیە لەگەڵ مرۆڤدا دەکرێت، بەم جۆرە مالیک هاتە ڕێزی موسڵمانان، جا ئەگەر لەبەر شکستی بێت یان ناچاربێت وا ئێستا موسڵمانە و لە ناو ڕیزی موسڵمانان دایە.

چونکە لە ڕەوشێکی زۆر سەختدا موسڵمان بوو، لەوانەیە لەبەر خاتری گەڕانەوەی ماڵ و منداڵ و وشتری بووبێت، یان لە پێناوی گیانی خۆی کە سەقیف نەیکوژن یان لە ترسی موسڵمان و پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەڵسا بە ئەنجامدانی دوو هەنگاو، یاخود دوو پلان بۆ گەڕانەوەی شکۆ و پاشان جێگیر و دڵنەواییکردنی بۆ ئەم ئیسلامە.

هەنگاوی یەکەم: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم گەڕاندییەوە بۆ ناو هۆزەکەی هەروەکو جاران ئەو سەرکردە و زەعیمیان بێت، چونکە لە دەستدانی مالیکی کوڕی عەوف خەسارەتێکی زۆر گەورەیە لەو هۆزەدا، بە پەراوێز خستنی ڕەوشی ئەو عەشیرەتانە جێگیر نابێت، مەگەر بە ڕەزامەندی ئەو سەرکردەیە نەبێت، چونکە بە گەڕخستنی توانای ئەو لە هۆزەکەیدا لە بەرژەوەندی دەوڵەتی ئیسلامییە، ئەو زیاتر شارەزاترە لەخەڵکی هەوازن و عەشیرەتەکەی، لەوانەیە پرسیار درووست بێت بڵێین ئەی بۆ ئەبو سوفیانی لە سەرۆکی مەککە هێنایە خوارەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێم ڕەوشەکە بۆ ئەبو سوفیان جیاواز بوو لە نێوان ئەم دوو سەرکردەیەدا جیاوازی زۆر زۆرە، ئەبو سوفیان مێژوویەکی زۆر دوورو درێژی دوژمنایەتی هەیە لەگەڵ موسڵماناندا وەکو ویراسە بۆی ماوەتەوە، بەڵام مالیکی کوڕی عەوف نوێیە، ئەو دوژمنایەتییەی نییە ئەوەی ڕووی داوە لە نێوان مالیک و پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەمووی چەند ڕۆژێکی پێچووە کەسێکی فکری نییە لەبەر خاتری هوبەل و لات و عوزا جەنگی نەکردووە، کەسێکی سادە و ساکار بووە بۆ هۆز و عەشیرەتەکەی جەنگی کردووە، کەسی لێ نەکوژراوە.



بەڵام ئەبو سوفیان کوڕی کوژراوە، غەرق و نغرۆ بووە لە بەندایەتی بۆ لات و عوزا و هوبەل، مالیکی کوڕی عەوف هیچ جۆرە خوایەکی دەستکردی نەبووە خۆشیشی نەویستوە، ئەبو سوفیان چەندین جەنگی ئەنجام داوە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەشێت جارێکیتر هەڵبگەڕێتەوە، بەڵام مالیکی کوڕی عەوف جەنگی کرد شکستی خوارد، بەڵام دوای شکست هەستی بە مامەڵەی جوانی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەگەڵیدا، هەرچی سەبی بوو بۆی گەڕاندەوە.

هەنگاوی دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو کارێکی ئیداری نەیهێشت مالیکی کوڕی عەوف بێکار بێت، بەڵکو کاری دا بەسەریدا بۆ ئەوەی هەستی بۆ دروست بێت خۆی و هۆزەکەی ئیتر بەشێکن لە دەوڵەتی ئیسلامی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایسپارد کە گەمارۆی شاری طائیف بدات، بەم کارەش چەند ئامانجێک دەپێکێت، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا کە ئەو کارەی دا بەسەریدا بۆ ئەوە بوو هەست بکات کە بەشێکی سەرەکییە لە دەوڵەتی ئیسلامی، پاشان هەست بە متمانەی پێغەمبەر ﷺ بکات بۆی، ئەمەش گومانی تێدا نییە کە زیاتر مالیکی کوڕی عەوف هۆزەکەی جێگیر تر و ڕاوەستاوتر دەبێت لە ناو ئیسلامدا، ئامانجی تری ئەم هەنگاوەی پێغەمبەر ﷺ پاراستنی دەوڵەتی ئیسلامییە لە هێرشی طائیف بۆ ناوچەکە لە ڕێگای ئەو سەنگەرە گەورەیەی کەوا لە ڕێگای هەوازنەوە دەبێت، پاشان گەمارۆی ناوچەکە ئەدات و لە تواناکانی سەقیف کەم دەکاتەوە، لە سەرروو هەموویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەتوانێت بە دڵنیاییەوە بگەڕێتەوە بۆ شاری مەدینە و ژیان و کار و کرداری دەوڵەتی ئیسلامی ڕێکبخات.

بڕیاری مالیکی کوڕی عەوف بۆ سەرکردایەتی هەوازن و ئەو ناوچەیە زۆر گرنگ بوو، توانیان ئامانجی سەرەکی بپێکن و زۆرێک لە بت و پەیکەر و خواکانیان شکاند و بەباشی توانی سەقیف لاواز بکات، نەیانهێشت هیچیان بۆ بڕوات و گەمارۆیەکی زۆر سەختی خستە سەر شاری طائیف، یەک ساڵ گەمارۆی دان تا ناچاریکردن کە بیر لە ئیسلامەتی بکەنەوە.

بەمەش تا ڕادەیەک کۆتایی بە کێشەی هەوازن هات و پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر خەڵکی لە ناوچەکەدا بڵاو کردەوە بۆ بانگەوار و خواناسی و شارەزابوون لە ئیسلام.



هەروەها هەندێک مەفرەزە و سریەی تری نارد بۆ جێگاکان، پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی لە شکاندنی هەندێکی تری لە بتەکانی عەرەب و ئاقڵ کردنی هۆزەکانی ناوچەکە و چاوترساندنیان و خستنە ژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئیسلامی لەو سریانە بریتیی بوون لە:

١- سریەی طوفەیلی کوڕی عەمر بۆ ناوچەکانی طائیف ٤٠٠ موجاهید سواری لەگەڵ بوو لەگەڵ مەنجەنیق و تانکی تەختە، توانیان بگەنە ناوچەی (ذي الكفين) کە بتێکی گەورەی تێدابوو، ناوی (ذي الكفين) بوو ناسرابوو بە بتی (عەمر کوڕی حوومەی دەوسی) بتەکەیان شکاند و سووتاندیان، بەسەرکەوتووی ئەو سریە گەڕایەوە.

٢- سریەی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهمی، کێشە لە نێوان خۆیان دا دروست بوو توانای ئەنجامدانی کاریان نەبوو, گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ.

٣- سریەی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناردنی بۆ ناوچەی طەی کە وڵاتێکی بچووکی سەربەخۆ بوو ٢٠٠ سەربازی لەگەڵ دابوو توانیان بەسەرکەوتوویی کارەکە ئەنجام بدەن، گەورەترین بتی ناوچەکەیان شکاند کە ناسرابوو بە بتی (فولس) بتی طەی بوو جەنگ ڕووی دا موسڵمانان سەرکەوتوو بوون سەرکردەکەیان ڕایکرد بۆ شام بەناوی عودەی کوڕی حاتەمی طائی، پاشان خوشکەکەی (سفانة) بە کەنیزەیەک گیرا و هێنایانە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر بەخشندەیی باوکی ئازادی کرد و زۆر ڕێزی لێگرت و بە چەند کەسێکدا ناردییەوە بۆ شام بۆلای براکەی عودەی کوڕی حاتەم, هەر خوشکەکەشی بوو هانی براکەی دا کە بڕواتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و چەند چاکەی لەگەڵ کردووە، عودەی گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئەویش موسڵمان بوو، ناوچەی (طائي) هاتە سەر دەوڵەتی ئیسلامی.

٤- سریەی جەبری کوڕی عەبدوڵا بۆ ناوچەی (ذي الضلصة) لە نزیک یەمەن بە ١٥٠ سەربازدا توانیان کارەکەیان بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدەن، دوو هۆزی لێ بوون ئەم ناوچەیە بەناوی (خثعم و بجيلة) ماڵێکیان دروست کردبوو ناویان نابوو کەعبە.

ئەو سریەیە توانیان دوای جەنگێکی سەخت ئەو ماڵەش بڕوخێنن، پاشان هەر لەو ساڵەدا هەموو شاعیرە بەناوبانگەکانی عەرەب موسڵمان بوون هیچ شاعیرێک نەما لەناو عەرەبدا ناسراو



بێت و موسڵمان نەبووبێت لەوانە کەعبی کوڕی زوهێر، ضیراری کوڕی خەطاب، عەبدوڵڵای کوڕی زەبعەری، ئەبوسوفیان کوڕی حارث، حارسی کوڕی هیشام، عەباسی کوڕی مرداس، ئەم کۆمەڵە بەناوبانگترین و بە هێزترین شاعیری عەرەب بوون، کۆتایی بە زەمەنی شاعیری جاهیلی هات، لەدواییدا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ گەڕایەوە بۆ ناو شاری مەدینە.



## شاری مەدینە بوو بە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی

**ماکوان:** دوای فەتحی مەککە و جەنگی حونەین، پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، هەموو نیوەدوورگەی عەرەبی کەوتە ژێر ڕکێفی فەرمانڕەوایی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەموو لاکان ملکەچ بوون بۆ ئیسلام، دەوڵەتی ئیسلامی ناو و ناوبانگی لە هەموو جیهاندا بیسترا.

گومانی تێدا نییە ئەمەش جێگای سەرنجی دەوڵەتی ڕۆم دەبێت، دەکەوێتە باکووری نیوەدوورگەی عەرەبی و ناوچەی شام بۆ سەرەوە حکومڕانی بوو، شیکارییەک بکەین بە چاوی دەوڵەتی ڕۆم بۆ ڕەوشەکە و دەوڵەتی ئیسلامی بکەین و لە چەند خاڵێکدا کورتی بکەینەوە.

خاڵی یەکەم: هێزی دەوڵەتی ئیسلامی زۆر بەخێرایی زیاد دەکات لە نەشونما دایە، پێشتر وەکو بزووتنەوەیەکی چەوساوەکان تەماشا دەکرا، ئێستا دەوڵەت و پایتەختی هەیە و شاری تری لەبەردەست دایە، بەڵکو مەلیک و ئیمارەتی تریش سەرپەرشتی دەکات وەکو بەحرێن و یەمەن و عەمان...هتد، کە هەموو لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدان، ئیتر دەوڵەتی ڕۆم ترسی ئەوەی هەیە لە ڕۆژهەڵات فارس و ئیمپراتۆرەکەیەتی، لە باکووریش دەوڵەتی ئیسلامی لە هەموو جیهاندا دەوڵەتە گەورەکان ترسیان لە بزوتنەوە ئیسلامییەکان هەیە، نەک لەبەر ئەوەی حوکمی وڵاتی خۆی یان ناوچەیەک بکات سرووشتی ئیسلام وایە دەیەوێت حکومڕانی جیهان بکات.

خاڵی دووەم: ڕۆم هێزی موسڵمانانی باش دەزانی لەناو خۆیاندا چەند بەهێزن لەبەر ئەوەی شوێنکەوتووی پێغەمبەرن ﷺ، یان شوێنکەوتووی پێغەمبەرێکن، ئایینیان دینی ئاسمانییە و ڕاستە و دەستکاری نەکراوە، هیرەقلی ڕۆم باش درکی بەو باسە کردبوو کە لەگەڵ ئەبوسوفیان کەوتە گفتوگۆ، خۆی دانینا بەوەی کە جێگای قاچی هیرەقل دەگرن واتا شام و فەلەستین.



خاڵی سێیەم: ڕۆم ترسی ئەوەی هەبوو شام لە باکووری نیوەدوورگەی عەرەبی و میسر لە ڕۆژئاوا، هەردووکیان داگیرکراون لە لایەن ڕۆمەوە، ئەگەری زۆری هەیە، بڕۆنە ناو دەوڵەتی ئیسلامی، کە هەردوو جێگاکە دەوڵەمەنترین ناوچەن.

خاڵی چوارەم: ناوچەی شام پڕە لە مەمالیکی ڕۆم، کە هەموو عەرەبن و ئایینیان نەسرانیە، زۆر ئاسانە بڕۆنە ناو ئایینی ئیسلام چونکە خودی هیرەقل بیری لەوە کردەوە ئوسقوفەکەشی موسڵمان بوو، یان بەلای کەمەوە وەلائو خۆشەویستییان بۆ دەوڵەتی ئیسلامی زیاتر دەبێت.

ئەمەش خەسارەت و زیانێکی گەورە دەبێت بۆ ڕۆم.

خاڵی پێنجەم: ڕۆم زۆر لە موسڵمانان دەترسێت، چونکە هەمووی ساڵێک تێپەڕبووە بەسەر جەنگی موئتە کە ٣ هەزار کەس ڕووبەڕووی ٢٠٠ هەزار سەربازی ڕۆم بوونەتەوە.

خاڵی شەشەم: جددیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ مامەڵەکردنی دەوڵەت و مەمالیک و ئیمپراتۆرەکان، کارێکی هەروا ئاسان نییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نامە بۆ هەمووان بنێرێت و داوای موسڵمان بوونیان لێبکات، یەکێک لەوانە خودی قەیسەرە هیرەقل گەورەی ڕۆم، دوودڵ نەبوو لە ناردنی نوێنەر بۆلای و بانگکردنی بۆ ئەم ئایینە، وازهێنان لە ئایینی دەستکاریکراوی باوک و باپیری ئەگەر چی نامەککە لە ڕووکەشدا زۆر نەرم و نیانە و جێگا و گەورەیی هەرقەلی دیاری کردووە، بەڵام لەناو جەوهەردا هەڕەشەیەکی زۆر قورسە لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت (فن عەلیک إثم ریسین)، واتا دەبێت هەڵگری تاوانی شوێن کەوتووەکانت بیت، ئایینی نوێ داوات لێدەکات لە خۆت و گەلەکەت خوا بپەرستن و دووربن لە زوڵم و زۆرداری.

خاڵی حەوتەم: ئەم خاڵە زۆر گرنگە، هەموو ئایینەکانی دونیا سرووشتیان وایە ئایینی ئیسلام قبوڵ ناکات، بەڵام ئەگەر چی بڕواشیان بەیەکتر نەبێت ئایینەکانی دیکە هەمیشە یەکتری قبوڵ دەکەن، بەڵام ئیسلام قبوڵ ناکەن، لە دوو حاڵەت بە دوور نییە، یان دێنە ناو ئیسلام، یان دژی پلانگێڕی و خراپەکاری دەبن، خوای گەورە دەفەرمووێت:



﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾﴾ [البقرة]

واتە: هەرگیز جولەکە و گاورەکان لە تۆ (ئەی محمد (صلی الله عەلیه وسلم)، ئەی ئیماندار) ڕازی نابن، هەتا بە تەواوی شوێن ئایین و بەرنامەیان نەکەویت، پێیان بڵێ: بەڕاستی هەر بەرنامەی خوا (ئایینی ئیسلام، شایستەی ئەوەیە کە هەموولایەکمان شوێنی بکەوین) هیدایەتی ڕاست و دروست هەر لای ئەوە، خۆ ئەگەر شوێن ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت پاش ئەوەی زانیاری و زانستیت پێگەیشتووە، ئەوە بزانە کە لە لایەن خواوە هیچ سەرپەرشتیاری و یارمەتییەکت دەست ناکەوێت.

دەوڵەتی ڕۆم ڕازی نین بە دەوڵەتی ئیسلامی لەتەنیشتی، بێ هیچ بەرژەوەندی و هۆکارێک، یان دەبێت ببیتە دەوڵەتی نەسرانی و واز لە ئیسلام بهێنیت ئەمەش ئەستەمە ڕووندادات، یان دەبێت ببێتە جەنگ و یەکلاببێتەوە لایەک سەرکەوێت، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾﴾ [البقرة]

واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی جەنگ لە مانگی حەرامدا (کە بریتین لە ـ ذوالعقدة ـ ذوالحجة ـ محرم ـ ڕەجب)، بڵێ: جەنگ لەو مانگانەدا کارەسات و هەڵەیەکی گەورەیە، بەرهەڵستی ڕێبازی خوا و بێ باوەڕی پێی، جەنگ لەمزگەوتی حەرامدا و دەربەدەرکردنی خەڵکەکەی زۆر گەورەترە لای خوا (لە کوشتنی کەسێک یان چەند کەسێک لە مانگی حەرام دا) هەروەها ئازاردانی ئیماندار تا هاوەڵگەر بێت پاشگەز بێتەوە تاوانێکە لە کوشتن گەورەترە، (بێگومان بێ باوەڕان) بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێبکەن لە دین و ئایینتان پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێت، جا هەر کەس لە ئێوە پاشگەز بێتەوە لە ئایینەکەی و بە کافریش



بمرێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان پووچەڵ دەبێت لە دنیا و قیامەتدا و ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنە سەر.

خاڵی هەشتەم: غروری بە هێز و لووتبەرزی، هەرگیز ڕازی نابێت هێزێکیتر لە تەنیشتییەوە هەبێت، هەمیشە دوو هێز وەکو یەک خاوەن هێز بن پێداکێشان ڕوودەدات، هەر لەبەر ئەوەبوو هەمیشە لە جەنگدا بوو لەگەڵ فارسدا، وا ئێستا هێزێکی گەورە دروست بووە ئەویش هێزی دەوڵەتی ئیسلامییە.

بەم هۆکارانە وا ڕۆم خەریکی کۆکردنەوەی هێز و سوپایە بۆ سەر شاری مەدینە لەوانەی کۆی کردۆتەوە بۆ ئەم جەنگە چوار هۆزی گەورەیە کە بریتین لە (لەخم و جوزام و عاملە لەگەڵ غەسان)لە ناوچەی بەلقاء (ئەردەنی ئێستا) بۆ سەر شاری مەدینە خۆیان ئامادە دەکرد.



## خۆ ئامادەکردن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆم

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر پێشبینی ئەوەی کردبوو کە ڕۆم خەریکی خۆئامادەکردنە و هاوەڵانی ئاگادار کردبووەوە، بە بەڵگەی ئەوەی جارێک دراوسێیەکی ئیمامی عومەر زۆر بەقایم لە دەرگای ماڵی ئیمامی عومەری کوڕی خەطابی دا، ئەویش ڕاپەڕی وتی هۆزی غەسان هات! چونکە پێشبینی ئیمامی عومەر وابوو کە درەنگ یاخود زوو هۆزی غەسان کە سەرەکیترین و گەورەترین هۆزی شام و عێراقە، بۆیە چاوەڕێی ئەوەبوون بێن بەرەو شاری مەدینە، دوور و نزیک ئەو جەنگە ڕوو ئەدات بە دڵنیاییەوە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکێکی زۆری بۆ ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە ئامادە کردووە، چونکە ئەگەری زۆری دانابوو لە ماوەی داهاتوو جەنگێکی زۆر سەخت لەگەڵ ڕۆم دا ڕوو ئەدات، بۆیە چاو و دەزگای هەواڵگری هەواڵگری ئیسلامی بڵاوکردبووەوە لە ناوچەی ڕۆم دا.



# ئامادەکردنی هێز و سوپا دژی ڕۆم بۆ جەنگی تەبووک

ماکوان: هەواڵگری ئیسلامی بە زووترین کات هەواڵی گواستەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ڕۆم وا خۆی ئامادە کردووە بۆ سەر شاری مەدینە، ئینجا بڕیاری دا لەسەر ئەم جەنگە، ئایا چاوەڕێیان بکات، یاخود بۆیان بڕواتە دەرەوەی شاری مەدینە بۆ باکووری ئەو شارە.

هەرچەندە چاوەڕێکردنی ڕۆم و هاتنی سوپاکەی زۆر ئاسانتر و باشتر بوو بۆ موسڵمانان چونکە ماوەی نێوان ڕۆم و مەدینە زۆر دوور و درێژە، هەروەها لە سوودی سەربازی موسڵمانانە چونکە ڕۆمەکان زۆر ماندوو ئەبن و گەرما و سەحرای ناوچەکە لەناویان دەبا، ئەوانیش توانای جەنگیان نییە لە گەرمادا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەوانەی تێپەڕاند و بڕیاری دا بڕواتە دەرەوەی شاری مەدینە، بڕواتە باکووری نیوەدوورگەی عەرەبی بە تایبەت بۆ جێگایەک ناوی تەبووکە، ئەویش لەبەر چەند هۆکارێک:

یەکەم هۆکار: لە ڕووی مەبدەئییەوە پێغەمبەر ﷺ خۆی جێگای جەنگ و کات و زەمەنی جەنگ هەڵدەبژێرێت، ئەمەش دوژمن ناچار دەکات ڕازی بێت بە کات و شوێنی سوپای بەرامبەر.

دووەم هۆکار: بۆ ئەوەی هێز و توانا و قووەتی ئیسلامی دەربکەوێت، وا نەزانن دەوڵەتی ئیسلامی دەترسێت، ترسیان لە جەنگ هەیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەدوای جەنگەوەیە، ئەمەش وای کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ ترس بخاتە دڵی دوژمن.

سێیەم هۆکار: پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی سەرپەرشتی جەنگ دەکات و دەردەچێت بۆ باکووری نیوەدوورگەی عەرەبی و ناهێڵێت گەلەکەی بێ بەرگری کاربێت و وەکو هیرەقل ناکات خۆی لە دووری چەند هەزار کیلۆمەتر دووربێت، جەنگ بە گەلەکەی بکات و خۆی و دارودەستەکەی لە شەوانی سووری خۆشی خۆیان دابن، ئەو کە خۆی سەرۆکی دەوڵەت و سوپایە لە پێش هەموو سەربازەکانییەوە دەبێت.



هیرەقل  ئەوانەی بۆیە بۆ جەنگ ئامادە کرد و تا پایتەختی خۆیَ پێ بپارێزێت، ئیتر لای مەبەست نییە کێ دەکوژرێت و لەناو دەچێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵکەکەی بەبەزەییە و دین و دونیایان بۆ دابین دەکات و قیامەتیان بەم ئاینە ئاوەدان دەکاتەوە، ئەمەش جیاوازی مەلیک و سەرۆک کۆمار و دیموکراتخواز و زەعیمەکانی دونیایە، لەگەڵ خودی پێغەمبەر ﷺ و کاری بانگەوازی پێغەمبەرایەتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی کرد و تەشریفی بردە دەرەوەی شاری مەدینە لەگەڵ خۆشەویست و هاوەڵانی، تا ڕووبەڕووی گەورەترین هێزی جیهان ببێتەوە تا پارێزگاری لە خوێنی ئوممەتەکەی بکات، ئەگەر چی ئوممەتەکەی خەڵکی سادە و ساکارن و لە بیابان و ناوچە بیابان نشینەکاندا دەژین.



## خوای گەورە ئەم جەنگەی ناونا بە جەنگی قورس

ماكوان: بڕیاری جەنگ هەروا ئاسان نییە، بڕیارێكی زۆر سەختە، ئەوە من نیم تا هەڵسەنگاندن بۆ ئەم جەنگە بكەم بەڵكو خوای پەروەردگار بە بڕیاری سەخت جەنگی سەخت ناوی بردووە، دەفەرمووێت:

﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾﴾ [التوبة]

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ كرد لە پێغەمبەر و كۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی كە شوێنی پێغەمبەر كەوتن لەكاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبووك)دا، دوای ئەوەی كە خەریك بوو دڵی دەستەیەكیان لە خشتە بچێت و (بێزاری دەربڕێت)، لەوەودوا تەوبە و پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ كرد، چونكە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە بەسۆز و میهرەبانە لەگەڵیاندا.

تەبووك لە نێوان دۆڵی (وادی القری) و شام دایە زیاتر لە دیمەشق نزیكترە تا شاری مەدینە، ئەم غەزایە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٩ كۆچی دا ڕوویدا، كە بەرامبەرە بە مانگی سێپتەمبەری ساڵی ٦٣٠ زایینی كە كۆتا غەزەواتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئاگاداری كردنەوە كە دەڕوات بۆ جەنگی ڕۆم، لەو كاتەدا موسڵمانان لەوپەڕی قەیراندا بوون، ئەو قەیرانە وایكردبوو كە سوپا نەتوانێت بجوڵێت، هەر لەبەرئەوەشە خوای گەورە بە سەخت و قورس ناوی بردووە، بەڵام ئیمانداری ڕاستەقینە بە ئیمانیان دەتوانن ڕاستگۆبن و سەربكەون بەسەر هەموو قەیرانەكاندا، تەنها مونافیق و دووڕووەكان تووشی شكست و فەشەل بوون، ئەوەش هۆكاری ئەوەبوو كە سوپای موسڵمانان ڕیزەكانیان پاك بێت لە مونافیقەكان و سوپاكە بە تەواوەتی سوپای ئیمان بێت، خاڵی بێت لە هەموو فەساد و خراپەكارییەك، ئەمەش ویستی خوای گەورەیە و ئەوكات بە دڵنیاییەوە سەركەوتن لای خوای پەروەردگارەوە دەبێت.



## بۆچی ناونرا بە سوپای قورس

ماکوان: ئەگەر بەچاوی شیکاری و زیاتر ڕوونی بکەمەوە بۆچی ئەو ناوەی لێنراوە، هۆکاری هەڵگرتنی ئەو ناوە بۆ پێی دەوترێت سوپای سەخت و کاری سەخت.

هۆکاری یەکەم: کۆششکردن و نەبوونی زاد و کۆمەکی پێویست بۆ ئەو سوپا و جەنگە.

لەبەر ئەوەی ساڵەکەی زۆر وشکە ساڵی بوو، زۆر گەرم بوو هاوینەکەی سووتێنەر بوو، هەروەها بەرووبووم پێنەگەیشتبوو، نەدەتوانرا پارە و کەرەستەی جەنگی بە گوێرەی پێویست ئامادە بکرێت بۆ ئەو سوپایە، چونکە ڕێگاکەش دوورە و سوپاکە یەکجار زۆرە، کەرەستەی جەنگی لەو کاتەدا زۆر سەخت بوو، پەیداکردنی خواردن بۆ ئەو سوپایە دەستەبەر نەدەکرا.

(موجاهید)، یەکێکە لە ڕاڤەکەرانی ئەو ئایەتە، بۆ وشەی (العُسرة) دەڵێت: ئەوەندە سەخت بوو بۆ هاوەڵان وایان لێهاتبوو کە دەنکێک خورمایان بە دوو کەس دەخوارد یاخود دەیانمژی و ئاویان بەدوایدا دەخواردەوە.

هەروەها (قەتادە) ئەویش هەر ڕاڤەکاری قورئانە دەڵێت:

زۆر لە کاتی نارەحەتی دەرچوون بۆ جەنگی تەبووک، دەنکە خورمایەک ژەمی دوو هاوەڵ بوو بەیەکەوە واتا بەسەرە خورماکەیان دەمژی و ئاویان بە دواییدا دەخواردەوە پاشان ئەوەی تر دەری دەهێنا و دەیانمژی بەسەرە ئاویان بەدواییدا دەخواردەوە، بێجگە لە خورما سوپاکە هیچی تریان نەبوو بیخۆن.

شێخ حەسەنی بەسری ڕاڤەی ئەو ئایەتە دەکات و دەڵێت: لە دوای مژینی خورماکە ناوکی خورماکەیان دەهاڕی و دەیانکرد بە ئارد، تێکەڵیان دەکرد لەگەڵ گەنمێکی هاڕاوی بۆگەندار و ئەوەیان دەکردە نان و ئەوەیان دەخوارد، ئەویش تاچەند ڕۆژێک بەشیکردن، دوای هەر خەریکی مژینی خورماکە بوون بە ئاوەوە.



کەواتە سوپای ئیسلام لەو جەنگەدا دەتوانین بڵێین لە ژێر هێلی هەژارییەوە بوون، دەرچوونیان بۆ جەنگ گوێڕایەڵی و فەرمان بوو، سوپاکەش ژمارەی لە ٣٠ هەزار زیاتر بوو، واتا ئەو حاڵ و گوزەرانە (سی هەزار) موجاهید بوون.

هۆکاری دووەم: هاوینی گەرم و کوشندەی بیابان.

خوای گەورە قەدەری وابوو مەناخ و ژینگەی ئەو کاتە زۆر گەرم بوو بەتایبەت ئەو ساڵە، لەگەڵ نەبوونی خواردن و ئاوی کەم لەگەڵ ئەوەشدا گەرمای بیابان ئەوەندە گەرم بوو تەنانەت گەیشتە حاڵەتی مردنی خەڵکی، بەڵام هاوەڵان هەوڵی تەواوی خۆیاندا و خۆگر بوون لەو گەرمایە دا، ئەوەشی زۆر زیاتر ناڕەحەتی کردن نەبوونی ئاو بوو، تەنانەت ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب دەفەرمووێت: لە تەبووک ئەوەندە تینوومان بوو لە ماوەیەکدا ئاومان لێ بڕا تەنانەت هەناسە بە گەروومانداا نەدەچووە خوارێ لە تاو وشکی، واماندەزانی قوڕگمان بڕاوە ئەوەندە وشک ببوو.

هەندێک لە هاوەڵان ناچار بوون وشترەکانیان سەر بڕی تا ئەو ئاوەی هەڵی گرتبوو لە ناو هەناو و پشتیدا کۆی کردبوویەوە ئەویان دەخواردەوە.

لە کاتی دەرچوونی سوپادا مونافیقەکان ئەوەیان کردە هەنجەت بۆ ئەوەی لەگەڵ سوپاکەدا دەرنەچن خۆیان شاردەوە لە جیهاد، دەیانووت گەرمە و بەو گەرمایە بۆکوێ دەچن.

خوای گەورە ئایەتی لەسەر دابەزاندن فەرمووی:

﴿فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾﴾ [التوبة]

واتە: (دووڕووەکان)، ئەوانەی کە بەجێهێڵران لەناو مەدینەدا شادمان بوون بەدانیشتنیان و دواکەوتنیان لە پێغەمبەرو نەچوونیان بۆ غەزا، حەزیان نەکرد جیهاد و تێکۆشان بە خۆیان و ماڵیان لە پێناوی خوادا بکەن و بە ئیماندارانیان وت: لەم گەرمایەدا دەرمەچن بۆ جیهاد، ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ بەتینتر و بەهێزترە لەگەرمیدا ئەگەر تێ بگەن و بیر و هۆشیان بخەنەکار.



هۆكاری سێیەم: دوژمنەكەیان لە موسڵمانەكان بە هێزتر بوون لە ڕووی ماددیەوە، موسڵمانان وەكو جاران دەرنەچوون بۆ جەنگ لەگەڵ هۆزێك یان شارێك یاخود دەوڵەتێك، دەرچوون بۆ جەنگ بەرامبەر ئیمپراتۆرێك، كە گەورەترین هێزی ناوچەكە و جیهان بوو، دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بەسەر سێ كیشوەردا بڵاو بوبوویەوە، ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقا دەوڵەمەنترین بوو لە ڕووی پارە و سەروەتی مرۆیی، تەنانەت مونافیقەكان بەوە موسڵمانیان دەترساند دەیان وت ئێوە پێتان وایە جەنگی ڕۆم وەكو جەنگی عەرەب وایە؟ سوێند بە خوا سبەینێ كە ڕووبەڕوویان بوونەوە هەمووتان بە حەبل دەبەستنەوە، ئەوەش ئەوەمان بۆ دەردەخات هێزی دوژمن توانای زۆر لەوە زیاترە كە بە قەڵەم باسی بكەین.

هۆكاری چوارەم: هۆكاری جوگرافیا و سەختی ڕێگا و دووری ڕێگا، ئەوەش هۆكارێكی تری سەخت بوو كە هاتە بەردەم سوپای تەبووك، جێگا و ناوچەی تەبووك لە نێوان شام و دۆڵی فورات دابوو كە مەودایەكی زۆر دوور و درێژە لە شاری مەدینەوە، هەڵبژاردنی ئەو جێگایە و كاتەكەی هەموو هۆكاری سەركەوتنە بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵی بژاردووە با ڕێگاكەش دوور بێت، خوای گەورە لە باسی دووری جێگاكەدا دەفەرمووێت:

﴿لَوۡ كَانَ عَرَضٗا قَرِيبٗا وَسَفَرٗا قَاصِدٗا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ [التوبة]

واتە: ئەگەر (غەزای تەبووك) دەستكەوتێكی ئاسان و نزیك بوایە، یا سەفەرێكی مامناوەندی بوایە، ئەوە دووڕووەكان شوێنت دەكەوتن، بەڵام ڕێگەی دوور و پڕ مەینەت بۆ ئەوان زەحمەتە، (جا لەوەودوا دێن) و سوێند بەزاتی خوا دەخۆن و دەڵێن: ئەگەر بمانتوانیایە ئەوە لەگەڵ ئێوەدا دەردەچووین و دەهاتین بۆ غەزا، ئەوانە بەو ڕەفتار و درۆیانەیان، خۆیان تیادەبەن، خوایش دەزانێت بەڕاستی ئەوانە درۆزنن.

هۆكاری پێنجەم: كاتی ڕووبەڕووبوونەوە، زۆرینەی خەڵكی شاری مەدینە خەریكی كشتوكاڵ و بەروبوومی خورما بوون، تا ئەم سەردەمەی ئێستاش خورمای مەدینە بەناوبانگترین خورمایە، بوجەی وڵات بەگشتی لەسەر خورما بوو، چ لە شاری مەدینە و لە جێگاكانی تریش وەكو خەیبەر، كاتی پێگەیشتنی بەروبووم بوو.



ئەم کاتە بۆ جوتیار زۆر قورسە ساڵێک چاوەڕێی بەرووبووم بکات، لە کاتی پێگەیشتنی دا بەجێی بهێڵێت، بەگشتی لەسەر دڵ و دەروون و نەفسی بەشەر زۆر کاریگەرە، ئەم هۆکارە ئەوەندەی تر لەسەری سەخت کردن کە دەرچن بۆ جەنگ لەگەڵ ڕۆم دا، ئیتر تاقیکردنەوەی خوای پەروەردگارە، تا پێغەمبەر ﷺ بۆی ڕوون بێتەوە کێ لە خەڵکەکەی ڕاستگۆیە و کێ مونافیقە، هەموو دڵ و دەروونەکان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان ئاشکرا دەکات، تا بزانن کام جۆر لە مرۆڤەکان جێگای بڕوایە تا بڕوای پێبکەیت و کامیش مونافیقە و تەنها ئەهلی دەم بادان و قسەی زلە.

هۆکاری شەشەم: بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لەلایەن مونافیقەکانەوە، گوایە نەخۆشی بڵاوبۆتەوە و بەناوی (الداء العضال)، هەروەها کە گوایە جۆرێک لە مار بڵاوبۆتەوە بە شەو دەردەچن و ژەهریان کوشندەیە، ئەوەش لە ناو عەرەبدا زۆر ترسناک بوو کاریگەری کردە سەر دڵودەروونی موسڵمانان، خوای گەورە دەفەرمووێت: لە ناو ئێوەی موسڵماندا گوێ بۆ مونافیقەکان دەگیرێت ﴿... وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ...﴾ [التوبة]

ئەمەش وای کرد کە هەندێک موسڵمانی لاواز کە بترسێت و دەرنەچێت، لەسەر ئەم جۆرە پڕوپاگەندانە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ [التوبة]

واتە: (لەکاتی غەزای تەبووک)دا پاکانەکەران لە بیابان نشینانی عەرەب هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی مۆڵەتیان بدرێت کە نەچن بۆ جیهاد، هەروەها ئەوانیش کە درۆیان لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەیدا دەکرد دانیشتن و بەشداری غەزاکەیان نەکرد، ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لەناو ئەوانەدا لەئاییندەدا سزایەکی پڕ ئێش و ئازاریان تووش دەبێت.

بێگومان عوزر و هەنجەتیان هیچ نەبوو تەنها درۆ و دەلەسە بوو، خوای گەورە ئایەتی تری لەسەر دابەزاندن و فەرمووی:



﴿سَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ إِذَا ٱنقَلَبۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ۝ يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝﴾ [التوبة]

واتە: کە ئێوە گەڕانەوە (لە غەزا) بۆ لایان سوێندتان بۆ دەخۆن بە خوا بۆ ئەوەی وازیان لێ بهێنن و سەرزەنشتیان نەکەن، جا ئێوەش وازیان لێ بهێنن و پشتیان تێبکەن، چونکە بەڕاستی ئەوانە (دڵ و دەروون) پیسن، شوێن و جێگەیان دۆزەخە لە پاداشتی ئەو کارو کردەوەی کە دەیانکرد.٩٥

هەر سوێندتان بۆ دەخۆن تا لێیان ڕازی بن و چاوپۆشییان لێبکەن، خۆ ئەگەر ئێوە ڕازی بن لێیان، ئەوە بێگومان خوا لە کەسانی لە ئایین دەرچوو ڕازی نابێت.٩٦

پاشان خوای گەورە بۆ وەڵامی ئەو مونافیقانە لە قورئان دا وەڵامی سەختی دانەوە دەفەرمووێت:

﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ۝﴾ [التوبة]

واتە: (لەو دووڕووە بێ چاو و ڕووانە) کەسانێک هەن کە دەڵێن: مۆڵەتم بدە و تووشی گوناهو سەرپێچیم مەکە! (بەبیانووی ئەوەی لە غەزادا، لەوانەیە تووشی گوناهو هەڵە ببێت!) لە حاڵێکدا ئەو جۆرە کەسانە با چاک بزانن کە لە گوناهو تاواندا ڕۆچوون، بێگومان دۆزەخیش گەمارۆی بێ باوەڕانی داوە و (ڕزگاربوونیان ئەستەمە).

هەروەها لەگەڵ سوپاکەدا سەرۆکی مونافیقەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول دەرچوو بەڵام لە نیوەی ڕێگادا گەڕانەوە، کە بریتی بوون لە ٨٠ کەس، هۆکاری گەڕانەوەیان کوفری عیناد و نیفاق بوو، ئەمەش نیعمەتێک بوو لە ڕاستیدا و لە ناوەخندا، بەڵام لە جەوهەردا کاریگەری خۆی هەیە ئەگەرچی ئەوانە وەکو مێش وابوون، کەم و بچووک ماندووکەر و ئیزعاج بوون، خوای پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرمووێت:



﴿لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ يَبۡغُونَكُمُ ٱلۡفِتۡنَةَ وَفِيكُمۡ سَمَّٰعُونَ لَهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ۝٤٧﴾ [التوبة]

واتە: ئەوانە ئەگەر دەرچوونایە و لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆ ئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لە سستی نەبێت (لە ئاشووب و گێرە شێوێنی زیاتریان لە دەست نەدەهات) و دەستیان دەکرد بە چرپ و چاپ لەناوتاندا و دەگەران بۆ دۆزینەوەی کەلێنێک، بەئاواتی ئاشووب هەڵگیرساندن لە نێوانتاندا، کەسانێکیش هەن لەنێو ئێوەدا، گوێیان بۆ دەگرن، خوایش چاک ئاگادارە بە کاروکردەوەی ستەمکاران.

هەر بەوەندە وازیان نەهێنا بەڵکو گەیشتە ئەو ڕادەیەی گاڵتە و ڕابواردن بەو موسڵمانە هەژارانە بکەن کە بەگوێرەی توانای خۆیان دەیانبەخشی خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝٧٩﴾ [التوبة]

واتە: ئەو بێ باوەڕانەی کە پلار دەگرنە ئەو ئیماندارانەی کە زیادە بەخشن لە خێر کردندا بەویستی خۆیان لە ڕێگەی خوادا و پلاریش لە ئیماندارانی هەژار دەگرن کە بێجگە لە ڕەنجی شانی خۆیان هیچی تریان دەست ناکەوێت، ئینجا هەر گاڵتەشیان پێدەکەن، ئەوانە خوا تۆڵەیان لێ دەسێنێت و ڕیسوایان دەکات، بەهۆی ئەو گاڵتە کردنەیانەوە و سزای بە ئێش و ئازاریش بەشیانە.

مونافیق ڕەفتاری وایە، ئەگەر موسڵمان زۆر ببەخشێت دەڵێت بۆ ناو و ڕیاکردنە، بەڵام گەر کەمی بەخشی گاڵتەی پێ دەکەن.

ئەنجامی ئەو کارانەی دووڕووەکان کاریگەری کردە سەر هەندێک لە ئیمانداران و لە هێز و توانایانی کەم کردەوە، چونکە پڕوپاگەندەکانیان زۆر پیس و بۆگەن بوو کاریگەری کردە سەر حەماس و برەودانیان بە خۆیان، لەوانە کە تووشی ڤایرۆسی مونافیقەکان بوو (میرارەی کوڕی ڕەبییع و کەعبی کوڕی مالیک و هیلالی کوڕی ئومەییە) بەڵام چونکە ڕاستگۆبوون لەگەڵ ئیمانەکەیاندا، خوای پەروەردگار لە دوای تۆبەکردنیان لێیانخۆش بوو، ئەمەش ٥٠ شەوی خایەند.



بەڕاستی چەندین قەیران و سەختی ڕووبەڕوویان بوویەوە، ئەگەری زۆری هەبوو کە سوپای موسڵمانان دوا بکەون بۆ دەرچوون، زۆر کاریگەر دەبوو بۆ شاری مەدینە ئەگەر ڕۆم هەڵی بکوتایەتە سەریان، لە ڕاستیدا دەرچوون بۆ ئەو غەزوەیە زۆر سەخت و قورس دەبوو، ئەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەر نەبوایە و موسڵمانانی ڕاستگۆ سەر ڕاست و جێگیر و ڕاوەستاو نەکردایە، زۆر قورس بوو بۆ موسڵمانان.

ئەمەش هەمووی تاقیکردنەوەی خوایی بوو لە ئاستێکی زۆر بەرزدا تاقیکردنەوە ڕوویدا و سوپاس بۆ خوا موسڵمانەکان سەرکەوتووبوون هۆکاری ئەو تاقیکردنەوە قورسەش بۆ ئەوە بوو مونافیق لە موسڵمان جیابکرێتەوە، هەرکات دەوڵەت گەیشتە ئاستی تەمکین و جێنشینکردن ئەوا تاقیکردنەوەی خوایی سەختر دەبێت، چونکە زۆرینەی مونافیق لە دەوڵەتی بەهێزی ئیسلامیدا خۆیان دەشارنەوە.

خۆ ئەگەر دەوڵەت لاواز بوو مونافیق خۆی ئاشکرا دەکات و کێشەی نییە، بەڵام ئەگەر دەوڵەت چووە ئاستی (نەمری) مەجد و سەروەری خۆی، ئەوا تاقیکردنەوە ئەوەندە سەخت دەبێت تەنها موسڵمانانی ڕاستگۆ تێیدا سەرکەوتوو دەبێت.

چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی لەگەڵ ئیمانداراندا کرد لەم تاقیکردنەوە سەختەدا، ویستی هاوکاری هاوەڵانی بێت بە دوو شێوە:

یەکەم: هاوکاریان بکات ئیمانداران لەم تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتووبن، بە پاکی لێی دەربچن، هاوکاریان بێت بەسەر شەیتانەکاندا.

دووەمیان: هەموو دەستی مونافیقەکان ئاشکرا بکات، بە چاکی و تەواوەتی بیانناسێت.

بۆ ئەم مەبەستە و سەرکەوتنی هەردوو خاڵەکە هەڵسا بە کردنەوەی دەرگای جیهاد بە ئاشکرا بانگی هەموویانی کرد بۆ جیهاد بە ماڵ و نەفس، بەمەش پێغەمبەر ﷺ قیستی پاک لە ناو مونافیق دەربچێت.

ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێشبینی کردبوو هاتە دی، توانی ڕێزی موسڵمانانی ڕاستگۆ و سەرڕاست لە دووڕووەکان جیاکاتەوە، لە هەموو قەیرانەکاندا موسڵمانەکان بۆ جیهاد



ئامادەیە و ئەوەی هەیەتی ئەیبەخشێت، مونافیق بە پێچەوانەوە بە دوای عوزری خۆشاردنەوەیە، دەست ناکات بە گیرفانیدا بۆ خزمەتی موسڵـمانان، هەر زوو عوزر ئەدۆزێتەوە بۆ خۆدەربازکردن، مونافیقەکان دەڵێن: کێ دەڵێت ڕاست دەکەن بۆخۆیانی ئەبەن و خۆیانی پێ دەوڵەمەند ئەکەن...هتد، لەم جۆرە قسانە و لەم حاڵەتەدا کۆمەڵگەی موسڵمانان دابەش دەبێت بەسەر پێنج چین، بەڵام لە ڕۆژانی ئاساییدا تەنها چینی هەژار و دەوڵەمەند دەردەکەون، بەڵام لەکاتی جیهاد دا پێنج جۆر چین و توێژ لە ناو کۆمەڵگەی موسڵمانان‌دا دەردەکەوێت.



# چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵگەی موسڵمان

ماکوان: لە ڕاستیدا کۆمەڵگەی موسڵمان هەمیشە لە پێنج چین و توێژ پێک دێت بەڵام هەموو کات هەست بەم پێج چینە ناکرێت تا کاتی قەیران و کێشە و جەنگ، بەڵام لەکاتی جەنگ دا زۆر باش جیا دەکرێتەوە و هەموو چینەکان دەچنە ڕیز و قاڵبی خۆیان.

ئەم قسەیەم تایبەت نییە بەجەنگی تەبووک، بەڵکو تایبەتە بە هەموو سەردەم و زەمەنێک و هەموو قۆناغێکی مێژووی ئیسلامی و هەروەها لە ئێستادا و لە داهاتوودا و تا ڕۆژی قیامەت ناگۆڕێت هەر ئەو پێنج بەشەیە، ئەویش بریتییە لە:

چینی یەکەم: پێیان دەوترێت خاوەن ئیمانی پۆڵاین، ئەم چینە تەنها یەک پیاوی بە ۱۰۰۰ پیاوە یان زیاتر، ئەم چینە لە دوای پێغەمبەر ﷺ ئیتر ئەوان هەڵگری ئەم ئایینەن و خۆیان بە خاوەنی دەزانن، ئەم چینە لە دوای خراپەکاری خەڵک چاکسازی دەکەن بە جوانترین شێوە وەکو ئەوەی خوا و پێغەمبەر دەیانەوێت، هەر ئەم چینەن ماڵ و سەروەت و سامان دەبەخشن چاوەڕوانی وەرگرتنەوە نین لەکەس، کات دەبەخشن لە پێناو ئیسلامدا جیهاد و کۆششیان هەمیشە بەردەوامە، بەڵکو گیانیان دەبەخشن لە پێناوی ئەم دینە و ئوممەتەکەی لە پێناو بەدەستهێنانی ئاخیرەتیان, نیەتیان پاکە و بۆ خوا دەژین و بۆ خوا دەمرن، هەموو بچووک و گەورەیان لە ژیاندا لەبەر خاتری خوای پەروەردگارە.

ئەم کۆمەڵەیە باشترین چینن لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامدا، ئەم کۆمەڵەیە سەرکردە و خەڵکی بە توانان، نیشانەیان ئەوەیە دەبەخشن، هەرگیز بە دوای پارە و سەروەت و ناو و پلە و پایەوە و پۆستی و دونیاوە نین، ئامانجی ئەم کۆمەڵە تەنها و تەنها قیامەتە.

لە ناو ئەو کۆمەڵەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەم چینەدان، لە سەروو هەموویان (ئیمامی ئەبوبەکری سدیق، ئیمامی عوسمانی کوڕی عەفان، ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف...هتد) ئەتوانین بڵێین هەموو موهاجیر و ئەنسار، ئەم کۆمەڵەیە بوو بە هەوڵ و ماندووبوونیان ئوممەتی ئیسلامی پێکهات.



نموونەی عوسمانی کوڕی عەفان لە ڕۆژی سەختی سوپای تەبووک کە بە سوپای سەخت ناسراوە بە ڕۆژی تەنگانە و سەخت ناسراوە (یوم العسرة).

بەڕاستی بۆ عوسمانی کوڕی عەفان ئەو ڕۆژانە هەمووی بۆ ئەو تۆمار کرا, دریغی نەکرد لە ڕۆژی سەختی جیهاد دا، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بە ئاشکرا دەرگای جیهادی کردەوە، تا پێشبڕکێی خێر و چاکە لە نێوان هاوەڵاندا ڕێکبخات، داوای کرد کێ دەیبەخشێت؟!

عوسمان هەڵسا و وتی: من ۱۰۰ وشتر ئەبەخشم بە هەموو پێداویستییەکانی, واتا ئەگەر کەسێک خاوەن وشتر بێت، بۆ پێداویستییەکانی پێویستی بە چەک و خواردن هەیە، واتا ئەو ۱۰۰ وشتری ئامادە کرد بە هەموو پێداویستییەکانی، پێشتر خەڵکانێک کەدەهاتنە ناو ئیسلام داوای ۱۰۰ وشتریان دەکرد، عوسمان ۱۰۰ وشتر دەبەخشێت بە ڕەزامەندی خۆی بێ هیچ فشارێک تەنها و تەنها لە پێناو خوا، خۆ ئیمامی عوسمان لەسەری نەبوو ئەو هەموو وشترە بدات بەڵام ئەو کێشەکەی بە کێشەی خۆی دەزانی، بۆ ئەو گرنگە پڕۆژەکانی ئیسلام و پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەربکەوێت، چاوەڕێی ئەوە نەبوو کە کەس هانی بدات.

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر خۆشحاڵ بوو بەو کارەی ئیمامی عوسمان، پێوەی دیار بوو خۆشی و شادی بۆ جاری دووەم دەرگای بەخشین بۆ جیهاد کرایەوە، دیسان شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش و سەرسوڕهێنەر ڕوویدا, بۆ جاری دووەم ئیمامی عوسمان هەڵدەسێت و دەڵێت؛ ۱۰۰ وشتری تر بە هەموو پێداویستییەکانیەوە.

واتا ۲۰۰ وشتری بەخشی بۆ جیهاد بە هەموو کەرەستە و پێداویستییەک، ئەم پیاوە بۆ ئیسلام دەژی، لە پێناو ئوممەتەکەیدا کار دەکات, هەر گەل و ئوممەتێک پیاوی وەک عوسمانی تێدابێت هەرگیز شکست ناخوات، ئەوەندەیتر پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆشحاڵ کرد، تا گەیشتە ئاستی ئەوەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: لەمەولا هیچ تاوان و گوناهێک عوسمان زەرەرمەند ناکات. [٥١]

ئەو ئەجر و پاداشتەی کە عوسمان لەمڕۆدا وەریگرت، هەرگیز هیچ تاوانێک ناتوانێت کەمی بکاتەوە، ئەمەش دەرئەنجامی شیکاری نییە، بەڵکو فەرمودەی پێغەمبەری خوایە

---

٥١ ـ (ما ضَرَّ عُثْمَان مَا فَعَلَ بَعْدَ الْيَوم).



ﷺ زۆر جار مرۆڤ لەبەر هەڵوێستێک لە پێناوی خوا دەرکەتووی هەردوو دونیا دەبێت.

بۆ جاری سێیەم پێغەمبەری خوا ﷺ داوای بەخشینی کردەوە، دیسان عوسمان ١٠٠ وشتری بەخشی بە هەموو کەرەستەکانییەوە واتە بە کۆی گشتی کردی بە ٣٠٠ وشتر، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد بۆ عوسمان و فەرمووی: پەروەردگار لە عوسمان خۆشبە، ئەوەی کردوێتی لە ڕابردوودا و ئەوەی تووشی دەبێت لە داهاتوودا، لێی خۆشبە ئەوەی بە نهێنی و بە ئاشکرایە لێیخۆشبە لەوەی شاراوەیە و والآیە و بەرچاوە[٥٢].

ئەمەی کە ڕوویدا لە عوسمان لەبەرچاوی هەموو هاوەڵاندا بوو، بەڵام دوایي بە خودی خۆی پێغەمبەر ﷺ ٤٠٠ وشتری بەخشی بە هەموو پێداویستییەکانی واتا سەرجەم ٧٠٠ وشتری بەخشی.

بەخشینی تەنها بە وشتر نەبوو، بەڵکو گەڕاوە بۆ ماڵەوە ١٠٠٠ دیناری هێنا، خستییە کۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ، دینار لەو سەردەمەدا ئاڵتوون بووە و درهەمیش زیو بووە.

ئیتر (رسول الله) دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: خوای پەروەردگار من لە عوسمان ڕازیم تۆش لێی ڕازیبە.[٥٣]

لێرەدا گرنگی عوسمان لە بەخشینەکەیدا نەبوو، بەڵکو لە یەکەم کەسەکە دابوو کە پێش هەموو لایەک بەخشی، هەر ئەوەبوو هانی خەڵکی تریدا چاوی لێبکەن ئەو پێشەنگ بوو، جا هەرکەس چاوی لێبکات و لە دوای ئەو بەخشین بدات لە پێناوی خودا، دەچێتە سەر تەرازووی چاکە و حەسەناتی عوسمانی کوڕی عەفان، ئەمەش بە هیچ حاسیبە و ئامێرێکی ئەلیکترۆنی ئەو چاکانە هەژمار ناکرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: هەرکەس هەڵبسێت

---

٥٢ ـ (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُثْمَانَ مَا أَقْبَلَ وَمَا أَدْبَرَ وَمَا أَخْفَى وَامَا أعْلَن، وَمَا أَسَرَّ وَمَا أَجْهَر).

٥٣ ـ (أللهُمَّ ارْضِ عَنْ عُثْمَان، فَنِّي عَنْهُ راضٍ).



بە کارێکی چاکە پاداشتی خۆی وەردەگرێت، پاداشتی ئەو کەسەش وەردەگرێت کە هانیداوە کە چاوی لێکردووە، بێ ئەوەی لە چاکەی هیچ لایەک کەم بکرێتەوە. [٥٤]

عوسمان لە چینی کۆمەڵگەی ئیمانی پۆڵایین بوو توانی ئەو ڕۆژە بۆ خۆی تۆمار بکات.

ئەبوبەکری سدیق ئەویش لە کۆمەڵگەی ئاست بەرزی ئیمان پۆڵاین بوو، هەڵسا ٤٠٠٠ درهەمی بەخشی بەو جیهاد و ڕۆژە سەختە لە پێناوی خوادا، ئەوەی بەخشی تەنها ئەوەی هەبوو.

لەوانەیە بەرامبەر بەخشینی ئیمامی عوسمان زۆر کەم بێت، بەڵام لە خەزێنەی خوای پەروەردگاردا زۆر گەورەیە، دەشێت ئیمامی عوسمان سەروەتی تری مابێت، بەڵام ئیمامی ئەبوبەکر هەرچی هەیبوو بەخشی، کەس ئەتوانێت کاری وابکات؟!

ئەمەش یەکەم جاری نییە ئیمامی ئەبوبەکر، بەڵکو چەندین جار لە پێناوی خوا و پێغەمبەرەکەی هەموو سەروەتەکەی بەخشیوە بە ئەندازەیەک کە پێغەمبەرەکەی دەیزانی هیچ ناهێڵێتەوە بۆ ماڵ و منداڵی، لە ئیمامی ئەبوبەکری پرسی، بۆ ماڵ و منداڵەکەت هیچت جێهێشتوە؟!

ئیمامی ئەبوبەکرد لە وەڵامدا وتی: خوا و پێغەمبەرم بۆ جێهێشتوون! [٥٥]

بە دڵنیاییەوە خوای گەورە دەستبەرداری کەسوکاری نابێت.

هەموو بە خۆمان دەڵێین ئیماندار، بەڵام ئیمانمان وەکو ئیمانی ئیمامی ئەبوبەکرە؟! بە دڵنیاییەوە نەخێر، ئیمانی ئێمە لە چاو ئەودا تەنها تیۆرییە، ئیمانی ئەو زۆر کرداری و عەمەلییە، ئەو تێگەیشتنە ئیمانییەی ئەوە ئوممەتان بەرەو باشە و چاکە دەبات، ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب نیوەی سەروەتەکەی هێنا، لە پێناوی جیهاد کردن لە پێناوی خودا، ڕاستە بە بەراورد لە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٤] ـ (منْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أجْرها وَأجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِم مِنْ شَيء.

[٥٥] ـ (سَألَهُ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم): هَلْ أبْقَيْتَ لأهْلِكَ شَيْئاً؟ فَقَال أبْقَيْتُ لَهُم الله وَ رَسُولُه).



لەگەل ئیمامی ئەبوبەکردا کەمترە، بەڵام بە پێوەر مرۆڤی تر کێ وەک ئەوی پێدەکرێت؟! ئیمامی عومەر تەنها لەو جێگایەدا ئەو کارەی نەکردووە، بەڵکو چەندین جاری تر نیوەی سەروەتی خۆی بەخشیوە.

لەسەر شانی ئەم پیاوانە ئیسلام بە گەلانی تر گەیشتووە، ئەمانە هێزی سەرەتایی پۆڵایین بوون، ئەگەر ئەم جۆرە پیاوە پۆڵایینانە نەبوونایە، بە پیاوی شوشە و ناسکی ئەم سەردەمە چۆن ئەم دینە بڵاو دەبێتەوە!

هاوەڵان تەنیا لە پەنای کەعبە دانەنیشتوون، بەڵکو بە شاخ و شار و بیابان و دەریا و دونیادا بڵاوبوونەتەوە، تا ئەم دینە بگەیەنن، هەموو لە پەنای شاخ و بیابان (سەحرای) گەرم شەهید بوون، ژیان لە پێناوی ئیسلام و مردن لە پێناویدا.

عەبدورەحمانی کوڕی عەوف نموونەی سەرکردە و کۆمەڵگەی پۆڵایینی ئەم ئیسلامەیە، هەروەکو ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب هەڵسا بە هێنانی نیوەی سەروەتەکەی کە بریتیی بوو لە ٢٠٠ ئۆقیە زیو، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ناو ئەو پارەی بەخشیوتە و ئەوەشی کە ماوەتەوە بەجێتهێشتووە. [٥٦]

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاستی فەرموو دوعاکەی گیرابوو، هەرگیز ماڵی عەبدوڕەحمان کەمی نەکرد کە وەفاتی کرد ئەوەندەی ئاڵتوون هەبوو بە تەور دەیانکرد بە دوو کەرتەوە، لە ژیاندا هەر دەوڵەمەند بوو لە دوای وەفاتی دا سەروەتەکەی هەر بەرەکەتداربوو بۆ منداڵەکانی.

لێرەدا پێوەری ئەم پیاوانە بە سەروەت و سامان و دەوڵەمەندییان ناکرێت، نا بەڵکو پێوەری چێنی کۆمەڵگە موسڵمان بە ئیمانە، بە ڕۆڵیانە لە ناو کۆمەڵگەکەدا بەوەی هەرگیز لەسەر بەخشینی ئیسلام دوانەکەوتوون، ئەوەی لە توانایان دابووبێت کردوویانە درێغیان نەکردووە هەرگیز کەمتەرخەم نەبوون وا هەستیان نەکردووە ئەوانە دەوڵەمەندن و ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێهێناوە بۆ ئەم ئوممەتە، نەخێر بەڵکو هەستی بەرپرسیارێتیان لەسەر شان بوو خۆیان بەخاوەنی کێشەکان زانیوە، وتویانە سوپاکە سوپای خۆمانە، هیوایان بۆ سەرکەوتن بوو

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٦] ـ (بَارَكَ الله فِمَا أَنْفَقْتَ وَفِيمَا أَبْقَيْت ).



بەسەرکەوتنی خۆیان زانیوە، عیزەتی ئیسلام ئامانجی بوو، خوای گەورەی مەبەست بووە، زانیویەتی بۆکێ کاردەکات.

لەناو ئەو ئیمانە پۆڵایینانە هاوشانیان هەژارانی ناو کۆمەڵگەکە بوون!

کۆمەڵگەی چینی هەژارانی پۆڵاین و ئیمان عیملاق، هاوشانی دەوڵەمەندان هەریەک لە کۆمەڵگەن، ئیسلام چینی کۆمەڵگەی لە ئیماندا دابەش ناکات بەسەر هەژار و دەوڵەمەند، ئەمە لە پێوەری ئیماندا هیچ بایەخی نییە، لە ئیماندا هەژار و دەوڵەمەند وەکو یەکن، ئەوەی جێگای بایەخە سێ بنەمایە ئەویش (کردار، ڕەفتار، گوفتار و نییەت).

کەواتە پرسیارەکە بەو شێوەیە نییە، ئەوەی پارەی زیاتر بدا ئیمانی زیاترە، بەڵکو زۆر لە مونافیقەکان بۆ خۆدەرخستن پارەی زۆریان دەبەخشی، بەڵام هیچ نرخی (ئەرزشی) نییە لەبەر فەسادی و خراپی نییەتەکەیان.

بەڵام هەژارێک یەک درهەم ببەخشێت، ئەجر و پاداشتی ئەڕوات بە قەد دەوڵەمەندەکان کە بە هەزاران درهەم ببەخشن، لێرەدا نییەت و خۆساغ کردنەوە بۆ کاری ئیسلامی بانگەواز، خودی پارەکە گرنگ نییە، الله ڕازقە، بەڵام خودی مرۆڤەکە گەورەیە، توانا و هێزی چەندە ئەوەندەی بۆ هەژمار دەکرێت، دەشێت چنگێ خورما بێت، بەڵام لە قیامەت بۆی دەبێت بە هەزارەها کیلۆ خورما هەڵبەت لە پاداشتدا، بگرە لە ناو ئەو چینە ئیمانە پۆڵایینەدا هەر پارە نییە، یاخود نەخۆشە و بە هۆکارێک ناتوانێت بڕوات بۆ جیهاد توانای چەک هەڵگرتنی نییە، یان ئاواتەخوازە بۆ چوون بۆ خاکی جیهاد، بەڵام خاوەنی پێداویستی نییە بۆ ڕۆیشتنی بۆ ئەم جۆرە دەرچوونانە چونکە ڕاستگۆ و نییەت پاکن، ئەمان ئەجری ئەوانەیان هەیە کە لە خاکی جیهاددان.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: نموونەی ئەم ئوممەتە وەکو نموونەی ٤ جۆرە لە مرۆڤ و کردارەکانی کەسێک خوای گەورە زانست و پارەی پێبەخشیوە، کار بە زانستەکە دەکات و لە ماڵەکەشی دەبەخشێت حەقی خوای لێ ئەدات، کەسێکی تر تەنها خوای پەروەردگار زانستی پێ بەخشیوە دەڵێت ئەگەر پارە و سەروەتم هەبوایە منیش دەمبەخشی، (یاخود هەریەک لەو کارانە کە مرۆڤ نییەت پاک بێت، پێغەمبەر ﷺ



دەفەرمووێت: وەکو پاداشت و ئەجری کەسی یەکەم وان کە لەبەخشین و زانستدا (ئەوە یەکێکە لەو ٤ جۆرە). [٥٧]

خوای گەوەر دەرحەق بەو مرۆڤە هەژارانە دەفەرمووێت:

﴿لَّيۡسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرۡضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ مِن سَبِيلٖۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝﴾ [التوبة]

واتە: لاواز و نەخۆش و ئەوانەش کە خەرجییان دەست ناکەوێت، هیچ گوناهو گلەییەکیان لەسەر نییە (لە بەشداری نەکردنی غەزادا) کاتێک دڵسۆز بن بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، لەسەر ئەو چاکەخواز و پاکانە هیچ جۆرە گلەیی و ڕەخنەیەک نییە، خوای گەورە لێخۆش بووە و میهرەبانیشە.

نموونەی عولبەی کوڕی زەید لە هەژارەکان بوو ئیمانی پۆڵایینی و لە کۆمەڵگەی چینە پۆڵایینەکان هەژمار دەکرا.

کۆمەڵێکی زۆر هەژار و نەدار و دەستکورت بوون، بەڵام لەگەڵ خوای خۆیان دا ڕاستگۆ و نیەت پاک بوون، پارەیان نەبوو، بەڵام زۆر حەزیان بە جیهاد بوو بە نەفسیان بەشداربن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەبەر نەبوونی پێداویستی تەواو وڵاغ کە هەڵیان بگرێت، فەرمووی بگەڕێنەوە ئێوە خاوەن عوزرن، لەو کاتەدا ئەوان نەیانوت سوپاس بۆ خوا ئێمە بەخشراین لە جیهاد، بەڵکو خەمباری دایگرتن و تاڕادەیەک کە هەموویان دەستیان کرد بە گریان لەبەر ئەوەی بێبەش بوون لەو جیهاد و خێر و پاداشتەدا تەنانەت لە قورئان دا ناویان هاتووە بە گریاوەکان لە پێناو جیهاد دا، ئەو کۆمەڵەیە ٧ کەس بوون کە دەستیان کرد بە گریان، خوای گەورە دەفەرمووێت:

---

[٥٧] ـ (مِثْلُ هَذِهِ ٱلْأُمَّةِ كَمَثَلِ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ رَجُلٍ آتَاهُ ٱللَّهُ مَالاً وَعِلْمًا فَهُوَ يَعْمَلُ بِعِلْمِهِ فِي مَالِهِ يُنْفِقُهُ فِي حَقِّهِ وَرَجُلٌ آتَاهُ ٱللَّهُ عِلْمًا وَلَمْ يُؤْتِهِ مَالاً فَهُوَ يَقُولُ لَوْ كَانَ لِي مِثْلِ هَذَا عَمِلْتُ فِيهِ مِثْلَ ٱلَّذِي يَعْمَلُ قَالَ رَسُولُ ٱللَّهِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهُمَا فِي ٱلْأَجْرِ سَوَاءٌ.



﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّواْ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ۝﴾ [التوبة]

واتە: هەروەها گلەیی و رەخنە نییە لەسەر ئەو کەسانەی کە دێن بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی وڵاخی سواریان بۆ پەیدا بکەیت و بێن بۆ جیهاد، تۆش دەڵێیت: هیچ شک نابەم تا بتاندەمێ بۆ سواری (ئیتر بە نائومێدی) گەڕانەوەو چاویان فرمێسکی لێ دەڕژا لە خەفەتدا ئەسرینی لێ دەباری، چونکە هیچ شک نابەن بیبەخشن و خەرجی بکەن (لە پێناوی خوادا، چۆن لە غەزا دواکەوتن).

ئەگەر بە چاوی لیکۆڵەر تەماشای بکەین ئەمانە لە قورئاندا باسکراون تا ڕۆژی قیامەت ئێمە چیرۆکی ژیانیان دەخوێنینەوە، چونکە لە ئیمانی پۆڵایینی چینی ئاستی بەرزی ئیمانن هەرچەندە هەژاریشن، هیچ شک نابەن.

بەڵکو ئەوانە خۆزگە و ئاواتیان گەیشتە ئاستێک بۆ جیهاد، کە جێگای بڕوای کەس نەبوو، کەس بەخەیاڵی دا نەهاتووە و کەسیش ئەنجامی نەداوە ئەویش ئەو هاوەڵە بەڕێزەیە کە ناویمان هێنا، یەکێک لەو ٧ کەسەی کە بۆ خاتری جیهاد گریا و پاشان کە گەڕاوە بۆ ماڵەکەی شەوەکەی شەونوێژی کرد، دوای گریان دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و داوای لە پەروەردگار کرد وتی: خوایە خۆت ئەمرت کردووە بە جیهاد و منیش حەزم لێکرد، بەڵام هیچ لە دەسەڵاتی من و پێغەمبەرەکەت دا نەبوو تا بتوانم بێم یاخود پێغەمبەرەکەت کەرەستەی جەنگم بۆ دابین بکات، جا داوات لێدەکەم چاکە و خێرەکانم کە کۆمکردۆتەوە ئەیکەم بە خێر بۆ ئەو موسڵمانانەی کە لەو سوپایەدا بەشدارن!

ئەم کەسە دەیەوێت بەهەر شێوەیەک بێت بەشداربێت، لە هەمان کاتدا دەیەوێت خزمەت بە جیهاد و موجاهیدان بکات، هیچی پێنییە تابیبەخشێت، بیری لەوە کردەوە تەنها حەسەنات و پاداشتی کە هەیبوو ئەوە دەبەخشێت.

ئاستێکی زۆر بەرزە لە ئیمان و خواناسی، ئەم جۆرە چین و توێژە لەناو کۆمەڵگەی موسڵماندا بەرەکەت و نیعمەتن هەستانەوە و مانەوەی ئەم ئوممەتە بەم جۆرە پیاوانەیە، خۆشەویستی بۆ کارکردن لە پێناوی خوا و ئیسلام و ئوممەت.



ئایا هیچ کاردانەوەیەک بۆ بەخشینەکەی ئەم شەوەی عولبەی کوڕی زید هەبوو! کاتێک ئەم بەخشینە و دوعایەی کرد.

بۆ نوێژی بەیانی چوو بۆ مزگەوت نوێژی کرد لە دوای تەواو بوونی نوێژ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: کێ بوو ئەم شەو ئەو بەخشینەی کرد؟! [58]

کەس وەڵامی نەدایەوە، عولبە لە دڵی خۆیدا وتی، خۆ مەبەستی من نییە پاشان بۆ جاری دووەم پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ( کوا ئەو خێرکەرەی ئەم شەو با هەڵسێتە سەرپێ؟! (أين المتصدق فليقم)؟

ئینجا عولبە تێگەیشت کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ مەبەستی ئەوە، هەڵسا و چووە خزمەتی، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە بەخشینەکەت بۆ قبوڵکرا و بۆت نوسراوە مژدەت لێبێت. [59]

لەگەڵ هەژاری و بێ دەسەڵاتی و نەبوونی نەداریدا، تەواو خوای گەورە بەخشینەکەی وەکو هاوەڵان هەژماری کرد.

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر سەرسام بوو بە هێزی ئیمانی ئەم جۆرە خەڵکانە کە لە ئاست بەرزی ئەو ئیمانە پۆڵایینەدا و کۆمەڵەی چینی کۆمەڵگەی یەکەمی موسڵمانان، هەندێکیان لەبەر نەبوونی گەڕانەوە، هەندێکی تریان بە هۆکاری نەخۆشی و لاوازی لە ڕێگادا گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، بەڵام لە کۆتاییدا هەموو ڕاستگۆ و نییەت پاک بوون پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەرحەق بەوان فەرمووی: کۆمەڵێک لە هاوەڵانتان لە شاری

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[58] ـ (أينَ المتَصَدِّقُ هَذِهِ اللَّيلَةَ؟!).

[59] (فَقَامَ الَيْهِ عُلْبَة ابْن زَيد وأخْبَرَهُ, فَقالَ رسُول الله (صلى الله عليه وسلم) أبْشِر، فَوَالله الّذي نَفْسِ بِيَدِه كتَبت في الزكاة المتقبلة)



مەدینە جێماون، بەڵام هەر ڕێگایەک یان دۆڵێک ئەوان لەگەڵمان بەشداربوون، بەڵام هۆکاری نەهاتنیان عوزر و هەنجەتی ڕاستی و ڕاستگۆییان بووە کە نەهاتوون.[٦٠]

ئەمەش ڕاستگۆی و نیەتپاکی موسڵمان لێرەدا کاریگەرە، کە پاداشت و ئەجری بۆ دەنووسرێت، تەنانەت ئەگەر بە ڕاستگۆیی داوای شەهیدیش بکات لەسەر جێگای بەدەردی خوایی بمرێت ئەوا پاداشتی شەهیدی بەردەکەوێت مادام نیەت پاک و ڕاستگۆ بووە.[٦١]

لەناو ئەم چینەدا تەنها پیاوان ڕۆڵیان نەبوو بەڵکو ئافرەتانیش خاوەن ڕۆڵی سەرەکی بوون، لە کاتێکدا ئەوان جیهادیان لەسەر واجب و فەرز نەبوو، بەڵام هەستی بەرپرسیارێتی وایلێکردن، کە بێنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای بەشداری بکەن، لەم پێشبڕکێیە ئیمانییەدا، ئافرەتان بەشدار بوون ئەوانی لەنێو کۆمەڵگەی یەکەمی چینی ئیمان کە پیاو و ژن هەردووکیان شان بە شانی یەکتر ئامادەی بەرپرسیارێتین، لەبەرامبەر ئوممەتەکەیدا، زۆر جار ئەم چینە لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا زۆر کەم دەبنەوە تا ئاستی یەک کەس یاخود دوو کەس!

چینی دووەم لە کۆمەڵگەی موسڵمان دا: ئەمانەش بە گشتی بە موسڵمانی چاکەخواز ناو دەبردرێن، ئەگەر چینی یەکەم پێکهاتەی سەرکردایەتی بێت, دووەم چین شوێنکەوتووی چینی یەکەمن، خەڵکی خواناس و خاوەن فیطرەتی پاک و بێگەرد و ڕەوشتجوان و بەرزیان هەیە، بە گیانێکی ئیسلامی پاک کاردەکەن، ئیسلام و مسڵمانانیان خۆش دەوێت کاتێک گوێیان لە بانگی جیهاد و بەخشینی بوو بێ دوودڵی خێرا ئامادەن و تەمەڵی ناکەن خێرا دێنە دەست و خەڵکی کردە و هەڵگری ئاڵای حەقن.

ئەم چینە، چینی سەرەکی نێو ئوممەتی موسڵمانن، بەبێ ئەم خەڵکە ئیسلام سەرناکەوێت ئەم چینە دوای چینی ئیمانە پۆڵاینەکان دێن، کۆڵەکەی دەوڵەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی خەڵکی ناو وڵاتەکەن بە گشتی، خاوەن چاکە و خێرن و هیوای زۆر دەبەخشن.

---

[٦٠] ـ (وَعِنْدَ اَلْبُخَارِي مِنْ حَدِيثِ أَنَسْ: رَجَعْنَا مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ مَعَ اَلنَّبِيِّ؟ فَقَالَ: إِنَّ أَقْوَامًا خَلْفَنَا بِالْمَدِينَةِ، مَا سَلَكْنَا شَعْبًا وَلَا وَادِيًا إِلَّا وَهُمْ مَعَنَا حَبَسُهُمْ اَلْعُذْرُ).

[٦١] ـ (مِنْ سَأَلَ اَللَّهُ تَعَالَى اَلشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَغَهُ اَللَّهُ مَنَازِلَ اَلشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ).



ڕاستە ئەوانە قیادە و داینەمۆی ناو کۆمەڵگەکە نین، بەڵام هەموو کەس ناتوانێت ئیمامی (ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی) بێت, ئەگەر ئەم جۆرە لەخەڵکی سەربازی ئازا و چاونەترس نەبن قیادە هیچی پێناکرێت، با قیادە و سەرکردە پاک و باش بن.

بەڵام گەر گەل و هۆزەکە فاسد و خراپەکار بوون هیچ بەهاو قیمەتێکی نییە، هەروەها بە پێچەوانەوە ئەگەر گەل و خەڵکی بە گشتی باش بن بەڵام قیادە فاسد و خراپەکار بوو بەهەمان شێوە قیمەتی هیچ نییە.

کەواتە سوننەتی خوایی وایە دەبێت گەل و قیادە هەردوولا باش بن هاوشێوەی یەک بن، گەلی باش قیادەی باش بەڕێوەی دەبات، قیادەی خراپ گەلی خراپ حوکمڕانی دەکات، چونکە ئامانجی خراپی هۆز و گەلەکە حاکمەککە دێت لەناو کۆمەڵگەکەوە هاتووە.

بەڵام بەگشتی خەڵک فیطرەتی پاکە خوا و پێغەمبەریان خۆش دەوێت، ئەم خۆشەویستییە لە سرووشتی مرۆڤەکاندا خوای پەروەردگار ڕواندوێتی، بەڵام پێویستی بە هۆکاری پەروەردەوە هەیە نوخبەی باش بێت کاری تێدا بکات و بە باشی پەروەردەی بکات. هەموو خەڵکی لەسەر فیطرەتی پاک لە دایک دەبێت، لە دوای ئەوە دایک و باوک و کۆمەڵگە دەیگۆڕن، دەشێت سەرکردەی چاک و خواناس لەگەڵ نوخبەی چاکو خواناس گەلی خوانەناس بگۆڕێت و پەروەردەی باشیان بکات تەنانەت دەتوانێت وا لە کۆمەڵگەکە بکات نەهێڵێت هۆکاری خراپەکاری لە دەرەوە بێتە ناو کۆمەڵگە و کۆمەڵگە خراپ بکات، ئەوەش کاری سەرەکی سەرکردە و نوخبەیە بۆ تێگەیشتنی گەلی چاک و نییەت پاک.

ئەگەر سەرکردە توانای ئەو چاکسازییەی نەبێت پێویستە واز لە سەرکردایەتی بهێنێت و بیداتە دەست کەسانی لێهاتوو، چونکە خەڵکی بەگشتی لەسەر ئایینی دەسەڵاتدارانن, هەروەک چۆن زۆرێک لە سەرکردەکان چاکسازییان کرد و خاوەنی ئەو توانا و هێزە بوون، نموونەی سەلاحەدینی ئەیوبی و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، ئەلب ئەرسەلان و قطز و محمد فاتح و...هتد، توانیان گۆڕانکاری لە ناو دەسەڵات و گەلەکەیاندا بکەن، بەڵام پێش هەموو ئەوانە کە پێشەنگی ئەو سەرکردانە بووە, پێشەنگی ئێمەش پێغەمبەری خوایە.



پێغەمبەری ﷺ ئازیز ئەو داینەمۆ بزوێنەرەیە کە گۆڕانکاری لە ژێر سفرەوە کرد بۆ ئاستی ٪١٠٠ جیهادی کرد، کاری کرد، دەوڵەتی دروست کرد، بانگەوازی کرد و توانی خۆشبەختی بۆ خەڵکی بەدەست بهێنێت لە دونیا و ئاخیرەت دا.

داوا لە سەرکردەی موسڵمان ئەوە نییە کە کۆمەڵگە هەموو بکات بە خاوەن ئیمانی پۆڵایین، نموونەی ئیمانی (ئەبوبەکر و عومەر) بەدەست بخات، هەرگیز ناتوانێت ئەو کارە بکات بەڵام لە سەرکردەی لێهاتوو ئەوە داوا دەکرێت، کە وا بکات لە دڵی گەلەکەی خۆشەویستییان بۆ حەق هەبێت، چاکە و خێر و پیاوەتییان خۆشبوێت، حەق وەربگرن و لەسەری پەروەردەبن، گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە بن، بە دڵنیاییەوە لە ناو ئەم گەلە کۆمەڵێک دروست دەبێت کە خاوەنی ئیمانی پۆڵایین بن.

هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن پەروەردەکارێکی باشترین بوو، توانی کۆمەڵێک پەروەردە بکات تا ئەم ئوممەتەی لەسەر دابمەزرێت، هەرچەندە سەرەتا زۆر نەبوون، بەڵام کاریان کرد کە توانیان لە بانگەوازی مەککەوە لە دەربەدەرییەوە بەرەو بزوتنەوە و دەوڵەت و ئیمپراتۆر بڕۆن و هەنگاو هەڵبهێنەوە، باشترین و جوانترین شارستانییەتیان دروست کرد.

مانای وانییە ئێمە ناتوانین و کارەکە کۆتایی هاتووە، لە ڕاستیدا مەنهەج هەمان مەنهەجە و کات هەر هەمان کاتە و زەمەن گۆڕاوە بۆ پێشکەوتن، بەڵام ئەوەی داوا دەکرێت گۆڕانکاری بەسەر دانایەت لە هیچ تەمەنێکیشدا، خواناسی لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و لە سەردەمی ئێستا و داهاتوشدا تا ڕۆژی قیامەت هەر خواناسییە ئەم دوو چینە خوای گەورە بۆی باسکردووین لە قورئان دا، هەردووکیان لەسەر خێر و چاکەی زۆرن

﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ [الحديد]

واتە: جا ئیتر ئەوە چیتانە و بۆچی ماڵ و سامانتان نابەخشین لەرێگەی خوادا، خۆ هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ خوا دەمێنێتەوە، بێگومان چوونیەک نین ئەوانەتان کەپێش



ڕزگاری مەککە، یاخود پێش سەرکەوتن، ماڵ و سامانی بەخشیووە و جەنگاوە، چونکە ئەوانە پلە و پایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی کە دوای ڕزگاری مەککە و بەدەست هێنانی سەرکەوتن ماڵ و سامانیان بەخشیووە و جەنگاون، بەهەردوولاشیان خوا بەڵێنی بەهەشتی بەخشیوە، بێگومان ئەو خوایە ئاگایە بەکاروکردەوەتان.

ئەوانەی پێش فەتح بەخشندە بوون ئەوانە ئیمان پۆڵایینەکانن، ئەوانەی دوای فەتح هەموو خەڵکی موسڵمانی باش و چاکن.

ئەگەرچی هەر دوولا بە چاکە خواز و باش ناوزەد کراون، بەڵام هەرگیز وەکو یەک نابن بۆیە دوو وشەی (لا يَسْتَوون) بەکار هاتووە.

ئەوەش فەزڵ و کەرەمی خوای پەروەردگارە کە دەیبەخشێت.

﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤﴾﴾ [الجمعة]

واتە: ئەوە ڕێز و بەهرەیەکی خواییە دەیبەخشێت بەو کەسەی کە خوا خۆی ئارەزووی بکات و شایستە بێت، خوایش خاوەنی بەخشش و بەهرەی گەورە و بێسنوورە.

چینی سێیەم: موسڵمانی تەمەڵ و هەستی بەرپرسیارێتی هیچ نییە.

ئەمانە دووڕوو و مونافیق نین ڕاستگۆن، بەڵام شەهوەت و حەز و ئارەزووەکانیان کوێری کردوون، تەمەڵی کردوون، زۆرجار دەشێت لە خەڵکی ئاستبەرزی ئیمانی بن، بەڵام بە هۆکاری تاوان جاروبار شکست دەخۆن.

ئەمەش حاڵەتێکی سرووشتییە لەناو ئەم چینە دا، مرۆڤ سرووشتی وا هەڵکەوتووە کە تەمەڵی دەکات و لاواز دەبێت تاوان دەکات، بەڵام گرنگە بگەڕێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگاری و تەوبە بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: (هەموو نەوەکانی ئادەم تاوانی زۆر دەکەن، بەڵام باشترین لە تاوانباران ئەوانەن کە زوو تەوبە دەکەن.[٦٢]

---

[٦٢] ـ (كُلُّكُمْ خَطَّاءُونَ وَخَيْرُ ٱلْخَطَّائِينَ ٱلتَّوَّابُونَ).



هیچ کەس ناتوانێت بڵێت من مەعصومم تەنها پێغەمبەران نەبێت، ئەوانەی کە تاوان دەکەن ناچن بۆ جیهاد بەواتای ئەوە نایە بڕوایان پێ نییە یان گاڵتەی پێ بکەن یان قسەی ناشرین بە شەریعەت بڵێن، چرکەساتی لاوازی ئیمانە دێت بەسەریاندا و تاوان دەکەن، بەڵام ئەگەر چووە گاڵتەوگەپ و جنێودان و ڕەتکردنەوەیەوە کوفرە، ئێمە لێرەدا باسی کۆمەڵگەی موسڵمانان دەکەین، چینی سێیەم لە موسڵمانان لە چینی لاوازی ئیمانداراننن، تاوانەکانیان کاتییە و زوو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار.

لە ناو کۆمەڵگەی موسڵماناندا دەبێت ئەم کۆمەڵە هەر هەبێت، ئەستەمە بڵێین نابێت هەبێت، خۆ ئەگەر نەبوایە لە کۆمەڵگەی پێغەمبەردا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەم چینی سێیەم بەدی نەدەکرا، بەڵام لەناو کۆمەڵگەی سەرەتایی ئیسلامیدا بوونی هەبووە، هەرگیز خاڵی نابێت لەم جۆرە موسڵمانانە، بەڵام گرنگە نەهێڵدرێت بڕواتە ئاستی زۆربەرز واتا دیاردە بێت بەڵام نەک بە گشتی کۆمەڵگەیەکی تاوانکار و خراپەکاربن، ئەوکات چاکەخواز زۆر ئەستەم دەبێت و کۆمەڵگە سەردەکێشێت بۆ کوفر.

سرووشتی مرۆڤ وەکو فریشتە نییە تاوان نەکات، داواشی لێنەکراوە وەکو فریشتە بێت، بەڵام گرنگە لەسەر تاوان بەردەوام نەبێت، تووشی هەر گوناهێک بوو تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆلای خوای پەروەردگار، لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی پێغەمبەردا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ سێ کەس بەم شێوەیە بوون، نموونەی (کەعبی کوڕی مالیک، مورارەی کوڕی ڕەبیع، هیلالی کوڕی ئومەییە) لە پێناوی سەروەت و سامانیاندا نەچوون بۆ جیهاد و سەرپێچیان کرد لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر.

لە ٣٠ هەزار سەرباز تەنها ٣ کەس سەرپێچی کرد، لەوانەیە بوترێت خۆزگە ئەو سێ کەسەش سەرپێچیان نەکردایە تا ڕادە و ڕێژەکە بڕۆشتنایە بە ١٠٠٪، بەڵام لە ڕاستی ویستی خوای گەورە و کەرەمی خوایە ئەو سێ کەسەش سەرپێچیان کرد، سیرەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئێمە نەخشە و ڕێگایە، خۆ ئەگەر ئەوە ڕووی نەدایە لە ئێستا بۆ ئێمە زۆر سەخت دەبوو، بۆیە ژیانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و ڕەفتار و کرداری بۆ ئێمە سوننەتە ئەو پێشەنگە و دەبێت چاوی لێ بکەین.



﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو ڕێك و پێك هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

بەهەرحاڵ لەناو کۆمەڵگەی موسوڵمانان ئەم سێ چینەی تێدایە، کە لە قەیرانی جەنگی تەبووک و ئامادەکردنی سوپاکەی بە تەواوەتی بەدی کرا:

١- چینی: ئیمانی پۆڵایین.

٢- چینی: خەڵکی بەگشتی چاکەخواز.

٣- چینی: خەڵکی تاوانبار و گوناهکار بۆ ماوەیەکی کاتی.

ئەم سێ چینە بە گوێرەی پەروەردە و ئاستی تێگەیشتن لە دینی خوا، نەوە (جیل) و ڕەوەند جیاواز دەبێت، گۆرانکاری لە چینەکاندا بەهۆکاری پاڵپێوەنانی ئیمانی گۆڕانکاری بەسەردادێت.

ئێستا دوو چینی تری ناو موسڵمانان ماون کە باسی بکەم، ترسناکترین چینی ناو کۆمەڵگەی موسڵمانانن وەکو کرم و مار و مێروو و ڤایرۆس وان، ئەگەر تەشەنە بکەن بەرهەمی کوفر زۆر دەبێت، ئەگەر چارەسەر بکرێت کۆمەڵگە پڕ خێر و خۆشی لێ دەردەچێیت، ئەو دوو چینەش بریتین لە چینی دووڕووەکان.

چینی چوارەم: سەرکردەی دووڕووەکان و خۆمەڵاسدان لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، ئەم چینە بە موسڵمان تەماشا دەکرێن، بەڵام بە داخەوە لەناو کۆمەڵەی مونافیقەکاندایە ئەمانیش دوو جۆرن جۆری یەکەم مونافیقە سەرکردەکان نموونەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەلول.

لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دەبێت دوو جۆر بوونی هەر هەبێت، لەکاتی بەهێزی دەوڵەتی ئیسلامیدا شاراوە و زەلیل و مەلکەچن لە تاریکیدا کاردەکەن.



بەڵام لە لاوازی دەوڵەتی ئیسلامیدا و یاخود کەوتنی دا دەم هەراش و مولحید و خوانەناسن، بەبێ مونافیق دەوڵەتی ئیسلامیش وجودی نییە.

ترسناکترین جۆری دەوڵەتی ئیسلامین کە لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هەبوون بەردەوام هەن و زۆر لە کافر خراپتر و ترسناکترن، لەبەر ئەوەی لە ڕووکەشدا موسڵمانن و لە ناوەخندا بوغز و کوفراوی و پیسن، ڕوو لە قیبلەی خوا دەکەن بەڵام دڵیان لای قیبلەی کافرانە، باسی خوا دەکەن بەڵام لە پاشملە قسە بە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێن، ڕقیان لە ئیسلامە، هەمیشە خەریکی پیلان و ئاژاوە گێڕین، لە تەلەفیزیۆنەکان بەناوی پیاوچاک و خواناس دەردەکەون بەڵام جەوهەریان بۆگەنە، خوای گەورە لوتف و کەرەمی لەگەڵ کردووین زوو دەردەکەون نیشانەیان زۆرە، ئەم چینە زۆر ترسناکن.

﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ١٤٥﴾ [النساء]

واتە: بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خواری ناو دۆزەخدان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەست ناکەوێت.

جۆری پێنجەم: لە چینی ناو کۆمەڵگەی موسڵمان، مونافیقی گوێڕایەڵە بۆ سەرکردەکەی ئەم جۆرەش جێبەجێ کارن، هەمیشە پیادەی پلانی سەرکردەکانیان.

حەزیان زۆر بە خۆدەرخستنە، لە شەیتان خراپترن، خوای گەورە ڕەحمی کردووە کە سیفاتیان زۆر و نیشانەیان هەیە تا بیانناسینەوە.



# نیشانەی ناسینی مونافیق

ماکوان: سیفات و پێناسەیان زۆرە لە قورئان و فەرموودەدا، لەوانەی کە گرنگە و زوو دەناسرێنەوە، بریتییە لە:

١- حەزیان بە درۆکردنە، لە هەڵسوکەوت و گوفتار و ڕەفتاری گەورە و بچوکیاندا.

٢- بیانوو (عوزر) دەهێننەوە و خۆیان ئەدزنەوە لە هەموو کار و چالاکی موسڵمانانداا، نموونە لە کاتی جیهاد لە وتنی حەق، لە بانگەواز، لە چاکسازی، لە بەخشینی سەروەت و سامان.

٣- دروست کردنی فیتنە و هەوڵدان بۆ ئاژاوەگێڕی و حەزیان بە دووبەرەکییە.

٤- دڵخۆشن بە شکستی موسڵمانان و بە پێچەوانەوە دڵتەنگن بە سەرکەوتنیان.

٥- لەکاتی نوێژدا تەمەڵن، گوێنادەن بە نوێژ کردن.

٦- نوێژی بەیانی و عیشا ناکەن.

٧- نا بەخشن، ئەگەر بەخشیان زۆر دڵتەنگ دەبن، زۆر بەخیلن بۆ موسڵمانان، بەڵام بۆ بەکارهێنانی یاری و کاری خراپ و دژی دینی خوا بێت زۆر دەبەخشن و دڵیان پێخۆشە.

٨- هەمیشە گاڵتە بە موسڵمانی مولتەزیم و خواناس دەکەن.

٩- لە کاتی قسەکردنیان زۆر بێئەدەبن بەرامبەر بە خوا و پێغەمبەر ﷺ، ڕێزیان نییە.

١٠- ڕقیان لە موسڵمانانە و قسە بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێن.

١١- ئاواتیان ئەوەیە خراپەکاری و فاحیشە لەناو موسڵمانان بڵاو بکەنەوە بە دوای کاری خراپەوەن.



١٢- ئاواتیان پڕوپاگەندە و اهوزڕاندن بۆ موسڵمانان و پیاو و ئافرەتیان دروست بکەن.

١٣- ڕێگری لە خەڵکی دەکەن بۆ کاری چاکە و خێر، هانی خەڵکی ئەدەن بۆ خراپەکاری و شەڕ.

١٤- هەمیشە پەیمان دەشکێنن و گوێ بە گفت و بەڵێن نادەن.

١٥- زۆر زوو توڕە دەبن و کە توڕەش بوون بەشی ئاشتەوایی تیاناهێڵن.

١٦- هەمیشە لە خیانەتکاری و خیانەتدان و لە تاواندا نغرۆ بوون.

١٧- دەست لەگەڵ دوژمنی موسڵمانان تێکەڵ دەکەن بۆ لێدانیان.

١٨- حەزیان لە لاسایی کردنەوەی کافر و خوانەناسان هەیە فەخریان پێوە دەکەن بە شەرمەزاری دەزانن ئەگەر بڵێن ئیمانمان بە ئیسلام و موسڵمانان هەیە.

١٩- لەکاتی قسەکردنیاندا زۆر باسی ڕەوشت و قسەی باق و بریق و مافی مرۆڤ و داوێنپاکی و شەرەف و ئەمانەت دەکەن، بەڵام لە خۆیاندا ئەو سیفاتانە نییە و پیادەی ناکەن.

٢٠- زیکر و دوعا و پاڕانەوە بۆ خوای پەروەردگار زۆر بەکەمی دەکەن.

٢١- هەرگیز حوکم بە شەریعەت و قورئان ناکەن، ئەگەر سوودیان بۆیان هەبێت دەیکەن بەڵام گەر سوودیان بۆیان نەبوو ئەوا حوکمی ئیسلام ڕەت دەکەنەوە.

٢٢- ئەگەر چوونە خاکی جەنگ ڕادەکەن، یاخود لە قەیراندا پیاوی ڕووبەڕووبوونەوە نین و هەستی بەرپرسیارێتیان نییە.

٢٣- هەر وترا جەنگ و جیهاد خێرا دونیایان لێدێتەوە یەک و ترس و لەرز دایان دەگرێت و قەیسەرییان لێ دەبێتە کونە مشک.

٢٤- لە کاتی قسەکردنی موسڵماناندا ئەوان خێرا دەیبەنە سەرخۆیان، وا دەزانن باسی ئەوان دەکەن، ئەمەش بە هۆکاری کاری گەندەڵ و چەپەڵیانەوەیە.



٢٥- هەمیشە هەڵەی خۆیان ئەدەن بەسەر خەڵکی تردا، هەرگیز ناڵێن ناهەق بووین.

٢٦- هەمیشە مەدح و پیاهەڵدانیان بۆ دەسەڵاتدارانە، ئەگەر دەسەڵاتیان نەما خێرا دەکەونە جنێودان پێیان.

٢٧- لە قسەکانیان پێچەوانەی زۆری تێدا بەدی دەکرێت، ئەوەش بە هۆکاری درۆکردنی زۆریانە، نازانن چییان وتووە پێشترا!

٢٨- ئەگەر بەخشیت پێیان و داوایان کرد و ڕازیبووین ئەوا دۆست و خۆشەویستی، بەڵام ئەگەر یەکجار ڕازی نەبوویت و نەتدا پێیان، لێت هەڵدەگەڕێنەوە و قسەی سووک و ناشرینت پێ دەڵێن!

٢٩- گوێ بە سیلەی ڕەحم و دایک و باوک نادەن و لایان گرنگ نییە برا و خوشک و عەشیرەت و وڵاتیان، ئاواتیان بەرژەوەندی خۆیانە.

٣٠- سوێند زۆر دەخۆن بە ڕاست و درۆ، چونکە دەزانن خەڵکی پێیان بڕوا ناکات، بۆیە زۆر لایان ئاساییە سوێند خواردن بە درۆ.

بەم جۆرە سیفەتیان ئاشکرا بوو هەرکەس دەیەوێت زیاتر لە سیفاتیان بزانێت دەتوانێت لە سورەتی التوبة، الأحزاب، النساء، المنافقون، محمد، الفتح، الحشر، النور و البقرة، بێجگە لەو سورەتانە لە زۆر سورەتی تر لە قورئاندا سیفاتی دووڕووەکان باسکراوە.

ئەم کۆمەڵە زۆر خراپ و پیسن هەمیشە گومان و خراپەکاری بڵاو دەکەنەوە بانگەوازی بێڕەوشتی و خراپەکاری دەکەن.

بەهەرحاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ سنووری داناوە بۆ مونافیق بە سیفەتەکانی، لە دڵەوە بۆ پەروەردگاری بەجێدەهێڵێت، بەڵام کە سیفاتەکانیانمان زانی، بێگومان دەبێت خۆمانیان لێ بپارێزین، هەرگیز بڕوایان پێنەکەین، بڕوا بە شیکاری و لێکۆڵینەوەکانیان نەکەین، زۆر بە پوختی خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەوانە دوژمنن لێیان بەئاگابن ﴿... هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ ...﴾ [المنافقون]



خوای گەورە پێناسەیانی بە دوژمن کردووە، ڕاستە موسڵمان و ئەم ئیسلامە دوژمنی زۆرە، بەڵام بە پێوەر بە موونافیقەکان ئەوان گەورەترین و سەرسەختترین دوژمنن، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیان و مەنهەجیدا هەمیشە بە ئاگابوو لە دووڕووەکان, بەڵام لە ڕووکەشدا ئەحکامی لەسەر دانەمەزراندون.



# ڕۆڵی مونافیق لە دروستکردنی قەیران بۆ تەبووک

ماکوان: بۆ دروستکردنی قەیران ئەجندای (بەرنامەی کاری)مونافیقەکان چیبوو؟

یەکەم: بە کۆی گشتی بڕیاریان دا کە نەڕۆن بۆ جیهاد، جا چ بە ماڵ بێت یان بە نەفس، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ أَنۡ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ وَقَالُواْ ذَرۡنَا نَكُن مَّعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾ [التوبة]

واتە: کاتێکیش سوورەتێک لە قورئان دابەزێنرێت و (داوایان لێ بکات) کە باوەڕ بەخوا بهێنن و لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا جیهاد بکەن و تێ بکۆشن و بچن بۆ غەزا، ئەوە دەسەڵاتدار و سەرمایەدارەکانیان (دووڕووەکان) مۆڵەتت لێ دەخوازن و دەڵێن: وازمان لێ بێنە تا لەگەڵ پەککەوتە و دانیشتووەکاندا بین.

دووەم: لەم کارەی کردیان و بڕیاری نەچوونیان دا بۆ جیهاد زۆر دڵخۆش بوون، هیچ خەمبار و ناڕەحەت نەبوون لەوەی کە نەچوون، بەڵکو شانازییان بە تاوان و گوناحەوە دەکرد و دڵیان زۆر پێخۆش بوو، بە پلەیەک خوای گەورە باسیان دەکات و دەفەرمووێت:

﴿فَرِحَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ بِمَقۡعَدِهِمۡ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّۗ قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّٗاۚ لَّوۡ كَانُواْ يَفۡقَهُونَ﴾ [التوبة]

واتە: (دووڕووەکان)، ئەوانەی کە بەجێهێڵران لەناو مەدینەدا شادمان بوون بەدانیشتنیان و دواکەوتنیان لە پێغەمبەر و نەچوونیان بۆ غەزا، حەزیان نەکرد جیهاد و تێکۆشان بە خۆیان و ماڵیان لە پێناوی خوادا بکەن و بە ئیماندارانیان وت: لەم گەرمایەدا دەرمەچن بۆ جیهاد، ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ بەتینتر و بەهێزترە لەگەرمیدا ئەگەر تێ بگەن و بیر و هۆشیان بخەنەکار.



سێیەم: لە هەمان ئایەتدا ئاماژە بەوە دەکات کە پڕوپاگەندەیان بڵاودەکردەوە گوایە دنیا گەرمە ئێستا مەڕۆن بۆ جیهاد، یاخود موسڵمانانیان بەوە دەترساند کە ناتوانن ڕووبەڕووی ڕۆم ببنەوە و هەمووتان بە حەبل و گوریس دەبەستنەوە.

﴿۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ۞﴾ [الأحزاب]

واتە: بەڕاستی خوا ئەو کەسانە دەناسێت کە کۆسپ و تەگەرە درووست دەکەن لەئێوە، ئەوانەی بە براکانیان دەڵێن وەرن بۆ لای ئێمە، (خۆتان بدزنەوە لە سوپای ئیمانداران)، ئەوانە تەنها کەم نەبێت خۆیان ناخەنە ناو تاڵوکەی جەنگەوە.

چوارەم: خەریکی تانە و تەشەردان بوون لە موسڵمانان بەتایبەت لەوەی کە دەیانبەخشی بە سوپاکە، ئەوەی زۆری ببەخشیایە تانەیان لێ ئەدا و دەیانووت بۆ خۆدەرخستن و ڕیا وادەکات، ئەوانەی کەمیان ببەخشیایە، گاڵتەیان پێدەکرد و پێیان ڕادەبوارد، خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ۙ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۞﴾ [التوبة]

واتە: ئەو بێ باوەڕانەی کە پلار دەگرنە ئەو ئیماندارانەی کە زیادە بەخشن لە خێر کردندا بەویستی خۆیان لە ڕێگەی خوادا و پلاریش لە ئیماندارانی هەژار دەگرن کە بێجگە لە ڕەنجی شانی خۆیان هیچی تریان دەست ناکەوێت، ئینجا هەر گاڵتەشیان پێدەکەن، ئەوانە خوا تۆڵەیان لێ دەسێنێت و ڕیسوایان دەکات، بەهۆی ئەو گاڵتە کردنەیانەوە و سزای بە ئێش و ئازاریش بەشیانە.

پێنجەم: بڵاوکردنەوەی گومانی زۆر سەرەتایی و دەیانویست بەدرۆ بۆخۆیان بشەرعێنن کە ناچن بۆ جیهاد لەبەر ئەوەی ئافرەتانی ڕۆم زۆر جوانن و ئەوانیش خاوەن وەرع و تەقوان، بۆیە کەمترین ژیان هەڵدەبژێرن، ناڕۆن بۆ جیهاد، ئەم گومانانەیان بڵاو دەکردەوە، خوای گەورە دەفەرموویت:



﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ ۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ [التوبة]

واتە: (لەو دووڕووە بێ چاو و ڕووانە) کەسانێک هەن کە دەڵێن: مۆڵەتم بدە و تووشی گوناهو سەرپێچیم مەکە! (بەبیانووی ئەوەی لە غەزادا، لەوانەیە تووشی گوناهو هەڵە ببێت!) لە حاڵێکدا ئەو جۆرە کەسانە با چاک بزانن کە لە گوناهو تاواندا ڕۆچوون، بێگومان دۆزەخیش گەمارۆی بێ باوەڕانی داوە و (ڕزگاربوونیان ئەستەمە).

شەشەم: بەڵکو هەندێکیان بڕیاریان دا بڕۆن بۆ جەنگ لە نیوەی ڕێگادا گەڕانەوە، ئەمەش پلانێکی پیسی مونافیقەکان بوو، ئەوەی هەڵسا بەم کارە قێزەونە (عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەلول) بوو هەمان کار بوو کە لە جەنگی ئوحود ئەنجامیدا.

حەوتەم: تا کۆتایی بڕیاریان دا هەندێکیان کە بڕۆن بۆ جیهاد، پاشان بۆ ئەوەی بڵێن پابەندین و ئێمەش حەزمان بە جیهادە، بەڵام لە کۆتاییدا عوزریان هێناوە، نەچوون بۆ جیهاد و پێغەمبەر ﷺ ئیزنیدان کە دانیشن، خوای گەورەش ڕەخنەی لە پێغەمبەرەکەی گرت و فەرمووی:

﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ [التوبة]

واتە: خوا لێت خۆش بێت (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)! بۆ مۆڵەتت دانێ (نەدەبوایە مۆڵەتیان بدەیتێ) هەتا بەچاکی بۆت دەربکەوێت، کێ ڕاستە و باوەڕ دامەزراوە، کێش درۆزن و دووڕووە.

بۆ ئەوەی هەموو دەستەکەیان ئاشکرابێت بۆ موسڵمانان.

چوونە دەرەوە لەگەڵ موسڵماناندا شەڕ و فیتنەیان زیاترە و زیاتر موسڵمانان دەترسێنن و تووشی دڵەڕاوکێ و دوودڵییان دەکەن، چونکە دەشێت موسڵمانان وا لێبکەن کە جەنگ نەکەن و ڕاکەن، تابگاتە ئەو ڕادەیەی موسڵمانان گوێ بۆ مونافیقەکان بگرن و باوەڕ بەوە بکەن کە قسەکانیان ڕاستە، خوای گەورە دەفەرموێت:



﴿لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [التوبة]

واتە: ئەوانە ئەگەر دەرچوونایە و لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆ ئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لە سستی نەبێت (لە ئاشووب و گێرە شێوێنی زیاتریان لە دەست نەدەهات) و دەستیان دەکرد بە چرپ و چاپ لەناوتاندا و دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی کەلێنێک، بەئاواتی ئاشووب هەڵگیرساندن لە نێوانتاندا، کەسانێکیش هەن لەنێو ئێوەدا، گوێیان بۆ دەگرن، خوایش چاک ئاگادارە بە کاروکردەوەی ستەمکاران.

دووبارەکردنەوەی زۆری باسەکان بە گوێی موسڵمانان کاریگەری خۆی هەیە.

بەهەر حاڵ سوپای موسڵمانان گەیشتە (٣٠) هەزار موجاهید و دەرچوون بەرەو ناوچەی تەبووک بۆ جەنگی ڕۆم، هەموو نییەتیان بۆ خوای گەورە بوو، پشتیان بە خوای گەورە بەستبوو، خوای گەورەش هەرگیز بێ هیوایان ناکات و سەریان دەخات.



## سوپای موسڵمانان بەرەو تەبووک کەوتنە ڕێ

ماکوان: سوپای موسڵمانان لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٩ کۆچی بەرەو تەبووک کەوتە ڕێ، پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەسەر شاری مەدینە (محەمەد کوڕی مەسلەمە)ی دانا، لەسەر کەس و کار و ئالوبەیتی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی دانا، سوپا ڕێگەیەکی زۆر سەخت و دوورو درێژی بڕی، لە ئارامگرتنێکی بێ وێنەدا، ئەوەندە خاوەنی خۆشەویستی و برایەتی بوون لە هەژاری سوپاکەدا خورمایەک دەکرا بە دووبەش بۆ دووکەس، خواردن و زادیان زۆر کەم بوو، هەروەها ئاویان زۆر کەم پێبوو، ناچار بوون وشترەکانیان سەربڕی بۆ خواردنەوەی ئەو ئاوەی کە هەڵیگرتوە لە هەناوی دا، ئەوەندە وڵاغ و وشتریان کەم بوو ناچار دوو کەس یاخود سێ کەس بە نۆرە سواری یەک وشتر دەبوون، تووشی ئیبتیلا و تاقیکردنەوەیەکی زۆر قورس بوون.

هەموو ئەم ناڕەحەتییانە بەس نەبوو، بەڵکو تاقیکردنەوە و ئیبتیلای زیاتر و قورستر دێن بەسەر موسڵماناندا، تاقی کردنەوەیەکی نوێ بۆ ئەوەی زیاتر گوێڕایەڵبن، سوپاکە زۆر موحتاجی ئاو بوون، زۆر تینوویان بوو، گەیشتنە ناوچەی (الحجر) کە خەڵکی سەموود لەو جێگایەدا دەژیان، پێغەمبەرەکەیان حەزرەتی (صالح) بوو، خوای گەورە لە ناوی بردن بە هۆکاری سەرپێچی سەربڕینی وشترێک بە موعجیزە لەناو ئەو گەلەدا بوو، لەو ناوچەیەدا هەندێک بیری ئاوی لێبوو، کە موسڵمانان بیرەکانیان بینی بەپەلە ڕۆیشتن ڕووەو بیرە ئاوەکان، هیچ مۆڵەتێکیان لە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەرنەگرت، هەرچی گۆزە و کەرەستەیان بوو پڕیان کرد لە ئاو و دەستیان کرد بە هەویر شێلان بۆ دروستکردنی نان، تا سکی برسی و ماندوویان تێر بێت.

بەڵام کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بە ناوچەکەی زانی و بینی کە موسڵمانان وا خەریکی دروستکردنی خواردنن، کار و فەرمانی زۆر قورسی دا بەسەر سوپادا و فەرمووی: کەس لە ئاوی



ئەو بیرانە نەخواتەوە بە هیچ شێوەیەک، دەستنوێژ بەو ئاوە مەگرن، ئەو هەویرەی شێلاوتانە بەو ئاوە دەرخواردی وشترەکانتانی بدەن، بە هیچ شێوەیەک خواردنی لێ دروست مەککەن.[٦٣]

لەبەر ئەوەی ئەو ئاوە موبارەک نەبوو، ئاوی خەڵکانێک بوو زوڵمی زۆریان کردبوو، فەرمانەکە زۆر ڕوون و ئاشکرابوو کە نابێت بە هیچ شێوەیەک بخورێتەوە موسڵمانان لە سەریانە کە گوێڕایەڵ بن و سەرپێچی نەکەن، هەموو گوێڕایەل بوون و کەس مشتومڕ (موجادەلە)ی نەکرد و کۆمێنتی نەبوو، بڵێن ئەم ئاوە چ پەیوەندی هەیە بەسەر بەشەری کافر و فاجر و فاسق، موسڵمان لێی دەخواتەوە، لە ئێستا دا هەموو پێویستیان بە ئاوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئاوی مەککەی دەخواردەوە، جەنابیان ڕۆژێک لە ڕۆژان نەیفەرموو ئەوە ئاوی کافرە یان موسڵمان.

دەتوانرا ئەم هەموو ئارگۆمێنتە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەکاربهێنن، بەڵام هاوەڵان زۆر باش لەوە تێگەیشتبوون، زۆر حیکمەت هەیە ئاشکرایە و ڕوونە بەڵام هەندێک حیکمەت لەناو جەوهەردا و لەناوەخنیدا حیکمەتەکە خۆی حەشارداوە، بۆ ئەوەی بزانرێت تا چەند گوێڕایەڵن بۆ فەرمانی پێغەمبەرەکەیان، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ۝﴾ [الأحزاب]

واتە: بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار نییە کاتێک کە خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن ئەوان سەرپشک بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕا و سەرلێشێواوە.

هەموو موسڵمانانی سەرڕاست لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرچوون، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن کە نەڕۆنە ناو ماڵ و ئاسەواری ڕووخاوی (حِجر) یاخود (ثمود)، خۆ ئەگەر چوونە ناوی و هەوڵیان دا بیگرن کاریگەری ئەوەتان لەسەر دروست بێت کە

---

[٦٣] ـ (قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): [لَا تَشَرَّبُوا مِنْ مِائها سَيئًا وَلَا تَتَوَضَؤُوا مِنْهُ لِلصَّلَاةِ وَمَا كَانَ مِنْ عَجِينٍ عَجَنْتُمُوهُ فَاعْلُفُوهْ اَلْإِبِلُ وَلَا تَأْكُلُوا مِنْهُ شَيْئًا].



ئەو گەلە سەرپێچی پێغەمبەرەکەیان کرد ئاوایان بەسەر هات، یاخود سەروچاوی خۆی داپۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا لەو جێگایەدا نەما فەرمووی بیگرن و سەرتان داپۆشن بە خوای گەورە وەکو ئەوەی ئەوان بەسەریان هات بەسەر ئێوەشدا نەیەت.

کاتێک موسڵمانان لەو ناوچەیە ڕەت بوون، تاوایان لێهات هیچیان پێنەما و تووشی نەهامەتی زۆر بوون، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد کە خودای گەورە فریایان بکەوێت.

هاوەڵێک بەناوی مەحمودی کوڕی لەبەید دەڵێت؛ لە دوای دوعاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەڵە هەورێک هات و بارانێکی باراند بەسەرماندا هەموو تێراو بووین، پاشان دەڵێت زۆرێک لە هاوەڵە مونافیقەکانمان دەناسی دوای ئەو موعجیزەیە چووینە لایان و وتمان لەمە زیاتر چیترتان دەوێت، بە لووتبەرزییەوە وتیان پەلە هەورێک بوو تێپەڕی!

بەهەرحاڵ ۳۰ هەزار سەرباز تێراو بوون حەوزیان دروست کرد بۆ شۆردنی جل و بەرگ و وشترەکانیان...هتد.

پاشان برسێتی زۆری بۆ هێنان داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە هەندێک وشتر سەربڕن بۆ ئەوەی سکیان تێربکەن، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دان، بەڵام ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب داوای کرد لە پێغەمبەر ﷺ ڕێگریان لێبکات لەسەر بڕینی وشترەکان چونکە دوای توانای هەڵگرتنی چەک و کەرەستە سەربازییەکانیان نابێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد کە واز لە سەربڕینی وشترەکان بهێنن و هەرکەس تۆزێک لە زادی خۆی بهێنێت بۆ پێغەمبەر ﷺ، هەر یەکە و دووخورمای هێنا، هەبوو چنگێکی خورمای دەهێنا و هەبوو مشتێکی دەهێنا، پێغەمبەر ﷺ دوعای بەرەکەتی بەسەردا خوێند، ئەگەر چی خواردنەکە بەشی ۱۰۰ کەسی نەدەکرد، بەڵام موعجیزەی خوای گەورە بەرەکەتی تێخست و هەموو سوپاکە تێریان لێخوارد، پاشان فەرمووی بڕۆن قاپ و قاچاختانی لێ پڕ بکەن، هەموو سەربازگە و سەربازەکان تێر و پڕیان لێخوارد و خواردنی زیادەیان هەڵگرت کە بینی هەموو تێریان خوارد. [٦٤]

---

[٦٤] ـ ( أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا ٱللَّهُ ، وَأَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ ، لَا يَلْقَى ٱللَّهُ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرُ شَاكٍ فِيهِمَا إِلَّا دَخَلَ ٱلْجَنَّةِ).



لەوکاتە وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵهات و ون بوو، کۆمەڵێک لە هاوەڵان شوێنی کەوتن تا بیدۆزنەوە، دوو هاوڵ ڕۆشتن تا بیدۆزنەوە یەکێکیان موونافیق بوو، هاوەڵە بەڕێزەکە ناوی (عومارەی کوڕی حەزم)بوو لە پەیمانی عەقەبەدا بوو لە جەنگی بەدریشدا بوو، ئەو هاوڕێیەی کە لەگەڵیدا بوو موونافیق بوو ناوی ( زەیدی کوڕی لوصیت) بوو.

بە عومارەی وت : محمد دەڵێت من پێغەمبەرم هەواڵی ئاسمانتان پێ ئەدات کەچی نازانێت وشترەکەی بۆ کوێ چووە.

عومارە گوێی پێنەدا و ڕۆیشت تا بەشوێن وشترەکەدا بگەڕێت، بەڵام ماوەیەک گەڕان و هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ عومارە بێدەنگ بوو، کۆمەڵێک لە هاوەڵان وەستابوون و بێئومێد بوون لە دۆزینەوەی وشترەکە و عومارەش لەگەڵیاندابوو.

پێغەمبەر ﷺ بە هەموویانی فەرموو (پیاوێک لە ناو ئێوەدا وتی: محمد دەڵێت هەواڵی ئاسمانتان پێدەڵێم، بەڵام نازانێت وشترەکەی خۆی بۆ کوێ چووە؟!)

سوێند بە خوا من هیچ زانیاریم نییە، بێجگە لەوەی کە خوای گەورە لێی ئاگادارم دەکاتەوە، خوای پەروەردگارم ئاگاداری کردمەوە لەو دۆڵەدا و لەو ڕێگایەوە وشترەکەم ڕێشمەککەی لە دارێکدا گیر بووە لەوێدایە و بەستراوەتەوە، بڕۆن بۆم بهێننەوە، وشترەکەیان بۆ هێنایەوە لەو جێگایەدابوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی کتومت وابوو خێرا عومارە چوو بۆ لای زەید و وتی ئەی دوژمنی خوا تۆ هاوڕێیەتی من نەکەیت، لە هاوڕێیەتی دەریکرد، دەڵێن لە دوای ئەو ڕووداوە تۆبەی کرد.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سبەینێ بە پشتیوانی خوای پەروەردگار دەگەین بە چاوگەی ئاوی تەبووک، ئەگەر کەسانێکتان پێش من گەیشتە ئەو جێگایە دەستکاری چاوگە ئاوەکە مەککەن.

ئەو سەرچاوەیە لە شێوەی کانییەکی بچووک دابوو، کە چوونە سەر ئاوەکە زۆر کەم بوو پاشان پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ خوێند و ئاوەکە تەقییەوە بووە سەرچاوەیەکی ڕۆشن لە شێوەی چەمێکی بچووک دا، هەموو تێر ئاویان خوارد و پێغەمبەر ﷺ



بە هاوەڵانی فەرموو: ئەم جێگایە دەبێتە باخ و باخاتێکی خۆش، ماوەیەکی کەمی پێچوو هەموو ئەو ناوچەیە بووە باخ و باخات، تا ئەمڕۆش ئەو ناوچەیە سەوزایی و باخ و باخاتە.



# سەرکەوتن لە تەبووک بێ جەنگ کردن

ماکوان: لە کۆتاییدا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ناوچەی تەبووک، ٧٧٨ کم لە شاری مەدینەوە دوورە، بەو سوپا گەورەیەوە لەو خاکەدا سەربازگەی خست، لەوکاتەدا شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر ڕووی دا کە سوپای ڕۆم ڕایکردووە بۆ ناو شاری دیمەشق. هەر ئەوەندەی هەواڵیانزانی بوو خودی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکردایەتی سوپاکە دەکات، یەکەم سوپای گەورەی دونیا بە سەرباز و چەک و جبەخانەیانەوە هەڵهاتن، ئەم هاوکێشە تەنها و تەنها قورئان بۆمان شیدەکاتەوە دەفەرمووێت:

﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًاۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [آل عمران]

واتە: (ئەی گرۆی ئیمانداران دڵنیابن) کە لەمەودوا ئێمە: ترس و بیم فڕێ دەدەینە دڵی ئەوانەی کە بێ باوەڕن، بەهۆی ئەوەی شەریک و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوە بێ ئەوەی خوا هیچ دەسەڵاتێکی پێدابن (بۆ دانانی هاوەڵگەری)، ئەوانە سەرەنجامی گەڕانەوەیان ئاگری دۆزەخە کە چەند ناخۆش و خراپە جێگەی ستەمکارانن.

ترس چووە دڵی سوپای ڕۆم، ترسیش سەربازی ڕەحمانن، هەروەکو چۆن لە بەدردا ڕوویدا ئاواش لە تەبووکیشدا ڕوویدا، ڕۆم زانی ٣٠ هەزار موجاهید هاتوون و پێغەمبەرێک سەرکردایەتی سوپاکە دەکات، یادگاری موئتەیان لە بیر نەچۆتەوە کە ئەوکات تەنها ٣ هەزار بوون وا ئێستا دە جار سوپاکە لە سوپای موئتە گەورەترە بێجگە لەوە سوپای موئتە پێغەمبەریان لەگەڵدا نەبوو، بەڵام لە تەبووک پێغەمبەر ﷺ ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی دەکات.

ڕۆم لێکدانەوەی تەواویان کردبوو، ڕاکردن باشترین غەنیمەتە ئەگەرچی هەیبەتی بەناوبانگی ڕۆم بشکێت باشترە لە بەرامبەر دەوڵەتی نوێی پێگەیشتووی ئیسلامی، چونکە دەیانزانی کۆتاییان لە ناوچوونە.



تەنها ڕۆم نەبوو کە هەڵهات بەڵکو هەموو هۆزەکانی عەرەب ڕایانکرد و کەسیان توانای ئەوەی نەبوو ڕووبەڕوویان ببێتەوە، لە کاتێکدا خاکی تەبووک نیشتیمان و جێگای ئەوانە، نەک هەر بیریان لە بەرگری نەکردەوە بەڵکو زۆر بە سەرشۆڕی هەڵهاتن.

جا ئەگەر ڕۆم بەو هێز و توانا و سەرکردانەوە ڕابکەن، دەبێت چۆن کلکەکانیان خۆیان بگرن، بەدڵنیاییەوە هەڵدێن.

پێغەمبەر ﷺ بەم سەرکەوتنە گەورەیە وازی نەهێنا، بەڵکو بۆ ماوەی ٢٠ ڕۆژ لەناو خاکی ڕۆمدا لە ناوچەی تەبووک دا مایەوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە ئێوە ترسنۆکن و ئێمە لێتان ناترسین، ئەوانەشی لەگەڵیاندان ترسنۆکن هیچیان لە باردانەبوو، لەکاتێکدا سوپای سەرکەوتن تەنها ٣ ڕۆژ دەمانەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی ڕۆم بزانێت کە هیچ ترسێکیان لێیان نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژەکانی بۆ زیادکردن بۆ ٢٠ ڕۆژ، سەربازگەی لەناو خاکی تەبووک دا چەقاند و لەوێوە سریە و سوپای بۆ ناوچەکان دەنارد.



## بەدیلگرتنی پادشای کیندی نەسرانی

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی بچووکی بۆ خالیدی کوڕی وەلید ڕێکخست کە بریتیی بوو لە ٤٢٠ سوارچاک تا بڕۆن بۆ ناوچەی (دومەتول جەندەل) بۆ سەر هۆزی کیندی کە لە تەبووکەوە نزیکەی ٣٣٥ کم دووره، پێغەمبەر ﷺ داوای کرد کە پادشاکەیان بە قۆڵ بەستراوی بۆی بهێنن و کە ناوی (ئوکەیدری کوڕی عبدوملەلیکی کیندی).

لە موعجیزەیەکی تریدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خالیدی فەرموو، دەست بەسەری دەکەیت نیشانەکەی ئەوەیە کە لە قەڵا و قولەی خۆی دابەزیوە بۆ ڕاوکردنی گای کێوی، بیگرە و بیهێنە.

خالید کە چووە ناوچەکەیان بینی کە خەریکی ڕاوی گای کێوییە لە دەرەوەی قەڵاکەی و ئەسیری کرد و بە دیلکراوی هێنای، پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی بە خوێنڕشتن نەبوو، بۆیە هەردوولا سوڵحیان کرد لەسەر دانی جزیە بە دەوڵەتی ئیسلامی.

پاشان پادشا و مەلیکەکانی ناوچەی شام زانیان حاڵیان لە حاڵ و گوزەرانی کیندی باشتر نابێت، بۆیە هەموو نوێنەر و وەفدی خۆیان نارد بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ، لەوانە پادشای (ئەیلە) (یوحەنای کوڕی ڕوئبە) ئەویش سوڵحی کرد بە جزیە، پاشان هۆزی (جەرباءو أذرح و مقنا) هاتن سێ هۆزی گەورەی وڵاتی شام بوون و ئەوانیش بە دانی جزیە ڕازی بوون.

هەموو ئەمانەی کە ڕوویدا بێ جەنگکردن بوو، تەنها لە کاتی دەستگیرکردنی ئوکەیدری کوڕی عبدوملەلیک ڕووبەڕووبوونەوەیەکی بچووک ڕوویدا، بێ خوێن ئەو هەموو سەرکەوتنە بەدەستهات.

بۆمان دەرکەوت لە ناو موسڵمانان و سوپاکەیاندا زۆر جار سەرکەوتن لە شێوەی جەنگێکی زۆر سەخت و قورس دایە وەکو بەدر، یان زۆر جار لە شێوەی گەمارۆی موسڵماناندایە، بۆ هەموو فەرمانێک موسڵمانان ملکەچ دەبن...هتد، یان هەر جەنگ ڕوونادات وەکو تەبووک.

خوای گەورە دەفەرمووێت:



﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ [آل عمران]

واتە: جا کاتێک عیسا هەستی بە کوفرو بێ دینی ئەوانە کرد وتی: کێ پشتیوانمە بۆ لای خوا، (کێ دێت تا پێکەوە بەرنامەی خوا بگەیەنین)، حەوارییەکان وتیان: ئێمەین پشتیوانانی دین و ئایینی خوا، باوەڕی تەواومان بەو خوایە هێناوە، تۆش شایەتی بدە کە بەڕاستی ئێمە موسڵمان و ملکەچ و فەرمانبەردارین.



## بیرکردنەوەی پێغەمبەر بۆ فەتحی شام پێشگەڕانەوەی بۆ مەدینە

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەوە کردەوە کە ڕۆشتنەکەی بۆ ناوچەی ڕۆم تەواو بکات و بەرەو شام و ناوچەکانی بکەوێتە ڕێ، تا شوێن سوپای هەڵهاتووی ڕۆم بکەوێت، پێش ئەوەی شوورا بکات، ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب هەستی کرد کە پێغەمبەر ﷺ ئارەزووی بەرەو ناوچەی دیمەشق هەیە.

چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئاماژەی ئەوەی بۆ کرد کە سوپاکە بگەڕێنێتەوە و شوێن ڕۆم نەکەوێت چونکە کۆمەڵێکی یەکجار زۆرن، هەروەها لە ناوچەی شامدا یەک موسڵمانی تێدا نییە تا پشتیوانی لە سوپاکە بکەن، عەرزی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد کە ئێمە باش لێیان نزیک بووینەتەوە، ئەم نزیک بوونەوەمان لەرز و ترسی تێخستوون، ئەگەر ساڵی ئایندە بگەڕێینەوە بۆ جەنگ لە ئێستا باشترە یان بە ویستی خوای گەورە کەی ڕەزامەندی هەبوو.

ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب ڕاکەی زۆر نایاب بوو، چونکە ناوخاکی شام کارێکی ترسناکە، لەبەر ئەوەی خاکی شام خاکی بیابانی نییە هەموو دار و شاخ و چەمە، موسڵمانانیش نموونەی جەنگی وایان نییە، بۆیان نوێ دەبێت، لەوانەیە ڕۆم لەو کاتەدا زۆر بەهێزتر و چالاکتربن لە موسڵمانان، هێزی ڕۆم لە ناو خاکی شامدان ٢٥ هەزار سەربازن، ئەم ژمارەیە یەکجار زۆرە، بێجگە لە هاوکاری هاوپەیمانەکانی لە یەمەن و شام و ناوچەکە بە گشتی، موسڵمانانیش لە هیچ لایەکەوە هاوکارییان پێناگات و سوپاکەش ماندو و برسی و تینووە، گەڕانەوەش لەم سەرکەوتنە بەهێزەدا لە ئێستادا باشترین شتە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاکەی ئیمامی عومەری پێ باش بوو و جێبەجێی کرد بە سۆز و عاتیفەوە بیری نەکردەوە، بەڵکو زۆر واقیعیانە گەڕانەوەی هەڵبژارد بە سەرکەوتنەوە، کەسی لێنەکوژرا و سوپای ڕۆم و عەرەبی هاوپەیمانی ڕایانکردووە، سەکەوتنەکە زۆر گەورە و بێ وێنە بوو.



موسڵمانان بە تەواوەتی کۆنتڕۆڵی هەموو باکووری نیوەدوورگەی عەرەبیان کرد، لە ئەنجامدا سەروەری و گەورەیی دەوڵەتی ڕۆم شکستی خوارد و سەرنەوی بوو، ئەمەش ئاسانە بۆ فەتحی شام لە داهاتوودا.



## گەڕانەوەی سوپا بۆ شاری مەدینە و هەوڵی کوشتنی پێغەمبەر ﷺ

**ماکوان: پێغەمبەری خوا** ﷺ بڕیاریدا کە بەتەواوەتی سوپاکەی بگەڕێنێتەوە بۆ شاری مەدینە، هاوکاتە لە بەرواری ٢٦ی ڕەمەزانی ساڵی ٩ی کۆچی.

هەوڵێکی شکست خواردووی مونافیقەکان بۆ ئیغتیالی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوویدا ئەویش لەناوچەی عەقەبەی نزیک وڵاتی ئەردەن، لەو هاوەڵانەی لەگەڵیدابوون حوزەیفەی یەمانی و عەماری کوڕی یاسر بوو ئەو دوانە بەرگرییەکی بێوێنەیان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ مونافیقەکان هەڵهاتن، بەڵام بەداخەوە نەزانرا کە کێبوون، چونکە دەموچاویان هەڵبەستبوو، دەمامکدار بوون.

هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ زانی کە کێن هەڵبەت لە ڕێگای وەحییەوە، بەڵام بەهیچ جۆرێک باسی نەکردن و لێپێچینەوەی لەگەڵ نەکردن و هیچ حەدد و یاسایەکی بەسەردا نەسەپاند، تەنانەت بانگێشتی نەکردن لەبەر دوو هۆکار:

هۆکاری یەکەم: بۆ ئەوەی نەبێتە ناو باسی خەڵکی، بڵێن محمد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێت.

هۆکاری دووەم: لەبەر ئەوەی هیچ جۆرە بەڵگە و زانینێک نییە لەسەر ئەو دوو کەسەی کە هەوڵی کوشتنی پێغەمبەریان دا، مەبەست لە بەڵگە و زانین شەرعی مەبەست لە بەڵگە و زانینی وەحی نییە، واتا بەڵگەیەکی ماددی یان شاهێدێک بینیبێتی...هتد.

ئاساییە هەر مونافیقێک بانگ بکەیت درۆ دەکات و هەزار و یەک سوێندی درۆ دەخوات، ئەمەش ئاستی بەرزی دادپەروەری دەوڵەتی ئیسلامی دەردەخات کە هەموو کارێکی لەسەر بنەمای بەڵگەیە و تا تاوانبار بە تاوانەکەیەوە ئاشکرا بێت، نەک لەسەر بۆچوون و شک و گومان کە لە یاسا و ڕێسای ڕۆژئاوا و عەلمانی دەبێت.



# هەڵوەستەیەک لەسەر جەنگی تەبووک

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوە شاری مەدینە بە ئارامی بێ ئەوەی سوپاکەی تووشی جەنگ و زەرەر و زیان ببێت، ئەوانەی کەوا هەستیان دەکرد جەنگێکی سەخت ڕوو ئەدات وا دەرنەچوو، ئەوانەی وایاندەزانی دەرچوون لە پێناو خوای پەروەردگاردا تووشی فیتنە و ناڕەحەتی دەبێت ئەویش وا دەرنەچوو.

ئەی تاقیکردنەوەکە لە کوێ دایە لەم جەنگەدا ڕاستگۆ و درۆزن لە کوێدا تاقی دەکرێتەوە؟!

بەڕاستی تەبووک هیچ تاقیکردنەوەیەکی تێدا نەبوو، بەڵکو تاقیکردنەوەی گرنگ لەناو خودی شاری مەدینە دابوو ٧٧٨ کم دوور بوو لە ناوچەی تەبووک.

کەواتە تاقیکردنەوە لە تەبووک دا نییە وەکو هەندێک وا پەی دەبەن، بەڵکو بنەمای سەرەکی تاقیکردنەوە کە لە خودی بڕیاری جیهاد دابوو لە شاری مەدینە دا، تاقی کردنەوەکە لەو کاتەدا دەستی پێکرد، کە کێ توانای سەرکەوتنی هەیە بەسەر نەفسی خۆیدا، ئەتوانێت دەست بەسەر شەهەواتی دا بگرێت و کۆنترۆڵی بکات، گوێ نەدات بەماڵی دونیا و ژیانی لا بچووک بێت و سەرکەوێت بەسەر شەیتانەکانی ژیانیدا، ئەوانە سەرکەتوو بوون لە یەکەم چرکە ساتدا بڕیاری جیهاد و دەرچوونیان دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ.

شکستخوارد و فاشیلەکان ئەوانە بوون کە لە ناخیاندا داڕمابوون، نەیاندەتوانی لە قەیرانی ناخی خۆیان دەربچن، ترسنۆکی تەنگی پێهەڵچنین و داینیشاندن، بۆ زانیاری ترس مرۆڤ دەکات بە موونافیق، مرۆڤی ئازا هەرگیز نابێتە دووڕوو.

بەهەرحاڵ زۆرجار ڕزگاربوونی مرۆڤ تەنها لە بڕیاردانیدایە و کە بڕیاری ئازایەتیدا، سەرکەوتوو دەبێت.

هەموو ئەوەی کە ڕوویدا نزیکەی ٤٠ ڕۆژی پێچوو، چەندین ساڵ و مانگ بەسەر مرۆڤدا دەڕوات و هەستی پێناکات، بەڵام لەماوەی ٤٠ ڕۆژی ژیانی توێشوی زۆر و کڕینی بەهەشت لە



بڕیارێکی ئازایانەدا و لە ماوەیەکی کورت دا چ بازرگانییەکی گەورە و پڕ سوود و قازانجە، هەرگیز زەرەرمەند نابێت تێیدا.

بەهەرحاڵ سوپا گەیشتەوە شاری مەدینە و بەسەربەرزی و خۆشییەوە، لەناو ئەو سوپایەدا تەنها یەک موجاهید کۆچی دوایی کرد، ئەویش نەخۆش کەوت واتە بە نەخۆشی ئاسایی وەفاتی کرد، ئەو هاوەڵە بەڕێزە ناوی (عەبدوڵڵای کوڕی ذي البجادين)بوو، ئەوانیتر هەموو بە سەلامەتی گەڕانەوە بۆ ناو کەس و کاریان واتا لە ٣٠ هەزار کەس تەنها یەک کەس وەفاتی کرد.

کاتێک سوپاکە گەڕاوە مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بە خۆشحاڵییەوە بەدەوریانەوە هاتن و زانیان چەندە کاریگەری هەبووە، ئەوانەی کە نەڕۆشتبوون بۆ جیهاد و سەرپێچیان کرد، هاتن هەندێکیان عوزریان هێنایەوە، کۆمەڵێکیش هیچ عوزریان نەبوو واتە پێکهاتبوون لە دوو کۆمەڵە، لەوانە:

کۆمەڵەی یەکەم: کۆمەڵەی موسڵمانی ڕاستگۆ بوون، بەبێ هیچ عوزرێکی پێویست دوا کەوتن لە جیهاد و نەڕۆشتن و سەرپێچیان کرد، هەڵە و تاوانێکی زۆر گەورەیان کرد، پێغەمبەری خوا هیچ عوزرێکی لێ وەرنەگرن، چاوەڕێ بوون تا حوکمیان لەسەر دادەبەزێ بە وەحی، بەڵام تا وەحی هات کەس قسەی لەگەڵ نەکردن، تەنانەت خێزانەکانیشیان قسەیان لەگەڵدا نەکردن، ئەم کۆمەڵەیەش بریتی بوون لە سێ کەس (کەعبی کوڕی مالیک و هیلالی کوڕی ئومەییە و موراڕەی کوڕی ڕەبیع) بۆ ماوەی ٥٠ ڕۆژ لە ماڵی خۆیان خۆیان زیندانی کرد، تا خوای گەورە لێیان خۆشبوو دوای ئەوەی کە تەوبەیان کرد.

کۆمەڵەی دووەم: بریتیی بوون لە دووڕووەکان، جا ئەگەر مونافیقی ئەعراب بن یاخود شاری مەدینە، ئەمانە زۆر بوون هاتن هەر یەکە و درۆیەکی کرد و سوێندی درۆی خوارد، دەستیان کرد بە خۆبادان کە بۆ جاریتر و ساڵی داهاتوو لەگەڵیاندا دەردەچن، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانەی لا گرنگ نەبوو لە عوزرەکانیان خۆشبوو گوێی پێ نەدان، چونکە دەیزانی ئەمانە لە ڕووکەشدا قسەی زل دەکەن و لە کرداردا هیچ نین و مونافیقن و سوێندی درۆ ئەخۆن.

لە کۆتاییدا ڕووداوی تەبووک بۆ هەموو عەرەب سەلمێندرا کە هیچ کەس ناتوانێت ڕووبەڕووی دەوڵەتی ئیسلامی ببێتەوە.



هەموو لایەک بۆیان ئاشکرابوو کە ئەمە لە توانای خودی مرۆڤدا نییە، بەڵکو خوای گەورە دینی خۆی و پێغەمبەرەکەی سەردەخات، هیچ هێز و توانایەک ناتوانێت ڕووبەڕووی هێز و توانای خوای گەورە ببێتەوە.

هەر ئەو زاتە پاکەیە دەتوانێت لە ماوەی ١٠ ساڵ بۆ پێغەمبەرەکەی ئیمپراتۆرییەت دروست بکات، ئەو پڕۆژەیەش کۆتایی نەهاتووە، هەر کەس پڕۆژەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بگرێتە بەر کە قورئان و سوننەتە ئەوا خوای پەروەردگار بە دڵنیاییەوە سەری دەخات، پڕۆژەکەش بەردەوام ماوە و لەگەڵماندایە تا ڕۆژی قیامەت.

وجودی قورئان لەگەڵماندایە و نەفەوتاوە، سوننەتیش پارێزراوە و هەرکەس ڕێگاکەی بگرێت لە دونیا دەبێتە خاوەن عیزەت و لە قیامەتیش براوەیە.



# مزگەوتی مونافیقەکان ناسراو بە مزگەوتی (الضرار)

ماکوان: بە گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە تەبووک، مونافیقەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و وتیان مزگەوتێکمان دروست کردووە لە نزیک (قوباء)، بەڵکو بێیت نوێژی تێدا بکەیت.

ڕووداوی ئەم مزگەوتە دروستکردنی مێژووی زۆر گرنگە هەموو کەس ئاگاداری بێت، سەرۆکی مونافیقەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول، تەمەنی بەسەرچوو بوو نەخۆشکەوت و توانای چالاکی نەما بوو، بۆیە مونافیقەکان بڕیاریاندا بۆ ئەوەی چالاکیان بەردەوام بێت، پێش گەڕانەوەی لە فەتحی مەککەدا، لەگەڵ (ئەبی عامری فاسق)دا ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی مزگەوتێک دروست بکەن کە زیاتر لەوێوە جیاوازی و دووبەرەکی بخەنە ناو مسوڵمانان، (ئەبی عامری فاسق) پێشتر ئاماژەمان پێدا بوو باوکی هاوەڵی بەڕێز (حەنظەڵە)بوو کە لە جەنگی ئوحود شەهید بوو فریشتەکان شۆردیان، ئەم کەسە واتە ئەبی عامر بانگەشەی بۆ دینی حەنیفی دەکرد و لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَدا کەوتە گفتوگۆ و وتی: هەرکەس درۆبکات دەربەدەر دەبێت، ئەوەبو ڕایکرد لە شاری مەدینە و چوو بۆ شاری مەککە و کاتێک فەتحی شاری مەککە کرا، ئەبی عامر ڕایکرد بۆ شام، لە کاتی هەڵهاتنی لە دوای فەتحی مەککە لەگەڵ مونافیقەکانی شاری مەدینەدا ئەم پلانەیان داڕشت، ئەو چوو بۆ شام لە ڕۆشتنی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ تەبووک مونافیقەکان ئەو هەلەیان قۆستەوە مزگەوتەکەیان دروست کرد.

پلانەکەش بەم شێوەیە بوو، ئەبو عامر ڕایسپاردن کە نەچنە مزگەوتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و مزگەوتێکی تر دروست دەکات بۆ ئەوەی زۆرێک لە موسڵمانان ڕابکێشێت بۆ مزگەوتەکەیان و خەریکی دووبەرەکی و پارچە پارچەکردنی موسڵمانان بن، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەی بیروباوەڕی فاسد و خراپە بڵاوبکاتەوە لەو جێگایەوە.

هەرچەندە پێشتر لە کاتی چوونی بۆ تەبووک مزگەوتەکە تەواو نەبوبوو ویستیان شەرعییەت بدەن بە مزگەوتەکەیان هاتن بۆ لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کە لەو مزگەوتەدا نوێژیان بۆ



بکات، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێستا من لەسەر سەفەرم، زۆر سەرقاڵم کە گەڕامەوە هەموو بە یەکەوە لەوێ نوێژ دەکەین.[٦٥]

بەڵام وەحی دەستەکەیانی ئاشکرا کرد، کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە جارێکیتر چوونەوە خزمەتی داوایان لێکرد بڕوات نوێژیان بۆ بکات لە مزگەوتەکەیاندا.

بەڵام جوبرەئیل وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا و ئاگاداری کردەوە لە پلانە چەپەڵەکەیان خوای گەورە ناوی نا بە مزگەوتی (ضِرار) زەرەرمەند، بە چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆزەوە دەفەرمووێت:

﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ۝ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ۝﴾ [التوبة]

واتە: هەرگیز لەو مزگەوتەدا ڕامەوەستە بۆ نوێژ کردن (چونکە) بەڕاستی مزگەوتێک شایستەیە کە تۆ تیایدا بوەستیت بۆ نوێژ کردن تیایدا کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە لەسەر بنچینەی تەقوا و خواناسی دروست کراوە، (چونکە) لەو مزگەوتەدا چەند کەسانێکی مەردی تیادایە کە زۆر حەز دەکەن خۆیان خاوێن ڕابگرن (لە دەروون و ڕواڵەتدا)، خوایش بەردەوام ئەوانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاک ڕادەگرن.

هەر کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە هاتە خوارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە شوێن هەندێک لە هاوەڵان بەناوی مالیکی کوڕی دەخشەم و مەعنی کوڕی عودەی و عەمری کوڕی سەکەن و چەند هاوەڵێکی تر کە بڕۆن ئەو مزگەوتە بڕوخێنن، چونکە مزگەوتی زەرەرداره بۆ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٥] ـ (فَقَال لَهُم (صلى الله عليه وسلم)): إنِّی عَلَی سَفَر، وحال شغلٍ، فلو قدمنا لإتيناكم و صَلينا معَكم فيه).



موسڵمانان، هاوەڵان بەپەلە ڕۆیشتن و خێرا مزگەوتەکەیان ڕووخاند، بە وەحی خوای گەورە ئاشکرای کرد کە نییەتی مونافیقەکان چییە.

سوپاس بۆ خوا موسڵمانان توانیان لەم پلانە چەپەڵە و قەیرانەی دروستیان کردووە لێی دەرچن، ئەگەر وای نەکردایە پێغەمبەر ﷺ زۆر کاریگەری خراپی دەبوو لەسەر ئوممەتی ئیسلامی.

لەگەڵ ئەوەی مونافیقەکان ئەو فیتنە گەورەیەیان دروست کرد، پێغەمبەر ﷺ زۆر بە جددی و بە ڕەقی مامەڵەی کرد و توڕەبوونی زۆری پێوە دیاربوو، وەکو پیشەی هەمیشەیی مونافیقەکان هاتن داوای لێبوردن و لێخۆشبوونیان کرد و وتیان مەبەستمان خراپە نەبووە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە دوای ڕووخاندنی مزگەوتەکە، بێدەنگی لێ کرد، بەڵام زۆر ترسناک بوو ئەم مزگەوتە لەکارەکانی پێشووتریان.

مرۆڤ زۆر جار سەری سوڕدەمێنێت، لەکاتێکدا مونافیق مزگەوت دروست دەکەن و گۆڤار و ڕۆژنامە و تەنانەت ئامێری بینراو و بیستراو بەکار دەهێنن بۆ لەبەریەک هەڵوەشاندنەوەی ئوممەت و خەڵکی موسڵمان.

لە وڵاتی ئێمەدا زۆر لەو دووڕووانە دەبینرێت، بەناوی چاکسازی و ڕێکخراو...هتد، قسەی زل و بێ مانا دەکەن و جارێک دەڵێن (مەی حەڵاڵە و جارێک بە ناوی فتوای شاز و بێ بنەما حیجاب لابردن و باڵاپۆشی دەڵێن لە ئیسلامدا وجوودی نییە و هەندێک جار خەڵکی زۆر هیچ و پووچ و نەزان و لووتبەرز و جاهیل لەسەر کاروباری موسڵمانان لە کەناڵەکانەوە قسە دەکەن، بێجگە لە سەدان کەناڵی خوانەناس بەناوی زل و گەورە هاتونەتە مەیدان و سیمینار و کۆڕ و کتێب لەسەر ئەم ئیسلامە دەنووسن و زۆر جار ناوی مەلایەک کە زۆر گەمژەیە یاخود مەلایەکی مونافیق لەگەڵ خۆیاندا دادەنێن بۆ شەرعییەت پێدانی کارەکانیان و گاڵتە بە خودی قورئان و پێغەمبەر و مەلا و پیاو چاک و دروشمەکانی ئیسلام دەکەن.

کاری سەرەتا و کۆتایی بڵاوکردنەوەی شبوهات و گومان و شک خستنە ناو دڵی لاو و گەنج و پیر و جوانی ئەم ئوممەتە و بۆ سەرلێشێواندنیان و کار بۆ ڕۆژئاوای عەلمانی دەکەن و خۆشیان لە بەچکە موسڵمانەکانن، ناویان وەکو ناوی موسڵمانانە و لەم سەردەمەدا زۆرن، ئەوەش کاردانەوەی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە بەرامبەریاندا.



زۆر گرنگە مامۆستا و زانایانی ئایینی زۆر وریابن لە ئامانجی کاری مونافیق کە ئەنجامی ئەدەن زۆر گرنگە لە پلان و ڕێگا و مەکر و فێڵیان تێبگەین.

لەگەڵ نەخۆشی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەلول و ڕووخاندنی بەناو مزگەوتەکەیان کاریگەری زۆری لەسەر مونافیقەکان دروستکرد هەر لەماوەی دوو مانگ دوای ڕووخاندنی مزگەوتەکەیان سەرۆکەکەشیان مرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار، لە ماوەیەکی کەمدا سێ جار تووشی شکست بوون، شکستی یەکەم تەبووک بوو کە هەموویان ناسێندران و شکستی دووەم ڕووخاندنی مزگەوتی (ضیرار) بوو شکستی سێیەم مردنی سەرۆکەکەیان بوو.

بۆ ماوەی ٧ ساڵ سەرۆکایەتی بزووتنەوەی مونافیقەکانی کرد لە شاری مەدینە لە ساڵی ٢ کۆچی بۆ ٩ کۆچی بەردەوام بوو ئەم بزووتنەوەیە.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەلول مێژوویەکی زۆر ڕەشی هەیە لە ڕەش ڕەش ترە، خاوەنی زۆرترین فیتنە و ئاشووبە کە لە ناو موسڵماناندا دروستی کرد و ڕواندوویەتی، جا هەڵوێست بێت وەکو جەنگی ئوحود کە گەڕاوە بە ٣٥٠ کەسەوە، یان بە جەنگی ئەحزاب، یاخود کەبەنو (مصطلق) یان حودەیبیە و کۆتایی جەنگی تەبووک.

یاخود ئەو فیتنانەی دروستی کرد لەسەر شەرەفی موسڵمانان وەکو ڕووداوی ئیفک بۆ خاتوو عائیشە و یان وەلائی بۆ موشریک و جوولەکە، بەڕاستی مێژووی زۆر بۆگەنە بەڵام سوپاس بۆ خوا مردن هەیە و کۆتایی هەمووان گەڕانەوەیە بۆ لای خوای پەروەردگار، مونافیق دەمرێت موسڵمانیش دەمرێت، درۆزن و ڕاستگۆ، موجاهید و ترسنۆک، هەموو چین و توێژەکان لە پیشە و خاوەن سیفاتی جوان و ناشرین.

وا عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول مرد لە ژیانیدا پارە و کاتی بۆ دووڕوویی خەرج کرد بۆ ئەوەی ڕێگر بێت لە دینی خوای گەورە، بەڵام جەنگ کردن لەگەڵ خوای موتەعال دا گێلییە، ئەوان طەرەفی شەیتان بوون، زۆر خۆیان ماندوو کرد کۆتاییان بۆ گڵ بوو، خوای گەورە دەفەرمووێت:



﴿وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ [النساء]

واتە: لە بەرامبەر (لەشکری بێ باوەڕانەوە کە شەڕتان پێ دەفرۆشن یان بەربەستن لە ڕێگەی پێگەیاندنی بانگەوازی خوادا) سستی و کەمتەرخەمی مەکەن و بکەونە دوایان، چونکە ئەگەر ئێوە ئێش و ئازارو ماندوێتی و برینداریتان بۆ پێش بێت، بۆ ئەوانیش هەرپێش دێت، بەڵام ئەوەی ئێوە بەئومێد و بەتەمان لەلایەن خواوە دەستان بکەوێت (لە بەهەشتدا) ئەوان بە تەمای نین، خوا هەمیشە و بەردەوام زانا و دانایە.

لە ماوەی ٢٠ ڕۆژدا لە ناو جێگادا کەوت و پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کرد، لەکاتی نەخۆشییەکەیدا، هەر چەندە جێگای سەرسوڕمانە، چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی سەرۆکی مونافیقان دەکات لەسەرەمەرگیدا و لەماڵەکەی خۆیدا؟!

لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەحەتی و خراپەکارییەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی دەکات، ئەم پیاوە تەنها لە مونافیقەکان نییە، بەڵکو سەرۆکی مونافیقەکانە و خراپترینیانە بەڵام سەردانەکەی پێغەمبەر چەند ئامانجێکی لە پشتەوە بوو.

یەکەم: پێغەمبەری خوا ﷺ هیوا و ئومێدی ئەوەی هەیە لەسەرەمەرگیدا بگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە مەلەفی ڕەش و بۆگەنە، بەڵکو خوا ڕەحمی پێ بکات ئەگەر خۆی بیەوێت، لە کوفرەوە بۆ ئیمان و لە ئاگرەوە بۆ بەهەشت بڕوات.

بەڵکو لەوانە بێت کە چەند هەنگاوێکی ماوە بۆ دۆزەخ خوای گەورە بۆی بکات بە بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ جوانترین و باشترین نموونەیە بۆ بانگخوازەکان، لە دڵیدا هیچ جۆرە ڕق و کینەیەکی هەڵنەگرتووە، ئامانجی پێغەمبەر ﷺ هیدایەتدانە و شیفادانی خەڵکییە کەواتە ئامانجی سەرەکی و یەکەمی پێغەمبەر ﷺ بۆ هیدایەتدانی بوو کە چووە لای.

دووەم: ئامانجی ئەوەبوو کە قیمەت و بەهای کوڕەکەی بەرز بنرخێنێت، چونکە کوڕەکەی یەکێک بوو لە هاوەڵە بەڕێز و خواناس و چاکەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناوی عەبدوڵڵا، واتا (عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول)، کوڕەکەی ئەگەر چی کوڕێکی



زۆر باش و خزمەتکاری دەوڵەتی ئیسلامی بوو کە لە هەموو بچووکی و گەورەیی دەوڵەتەکەیدا بەشدار بوو، زۆر سەرزەنشتی باوکی دەکرد لەگەڵ ئەوەی هەموولا عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵایان باش دەناسی بەڵام بە هۆکاری باوکی هەمیشە لە قەیران و دڵەڕاوکێ دابوو.

بەم سەردانەی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی عەبدوڵڵای دایەوە و زیاتر بۆ بەرزکردنەوەی پێگەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ باش لە گوزەرانی تێگەیشتبوو دەیزانی بە هۆکاری باوکی تەنانەت نەدەچووە ناو مەجلیسی هاوەڵان، پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی ڕۆژەکانی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول دا چووە لای و بە غەمباری پێی فەرموو (چەند جارم پێوتی واز بهێنە لە خۆشەویستیت بۆ جوولەکە)[٦٦] مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو کە چیتر بیر لە نیفاق و دووڕوویی نەکاتەوە تەوبە بکات، چونکە بەردەوام لە مونافیقی دابوو!

کەچی بەوپەڕی بێ ئەدەبی لە حزوری پێغەمبەردا ﷺ وتی: لەوپەڕی عیناد و ئینکاری لە کۆتایی ژیانیدا وەڵامی زۆر بێحورمەتانە بوو وتی: ئەسعەدی کوڕی زرارە ڕقی لێیان بوو چی دەست کەوت؟![٦٧]

مەبەستی ئەوەبوو کە ئەسعەد هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆکاری ئەوەی جوولەکە ئازاری پێغەمبەر ﷺ نەدا ڕقی لێیان بوو، ئەویش لە دوای کۆچی پێغەمبەر ٤ مانگ پێچوو کۆچی دوایی کرد، ئەوەندە بێئەقڵ بوو نموونەی بە مەرگی مردوو دەهێنایەوە بیری لای ئەوە نەبوو کە پێغەمبەر مەبەستی نیفاق و وەلائیەتی بۆ جوولەکە و موشریک، کۆتا وتەی هەر کوفر و عینادی و ئینکاری بوو لە دینی خوا و پێغەمبەرەکەی ئینجا داوایەکی زۆر غەریب و سەرسوڕهێنەر لە پێغەمبەر دەکات و دەڵێت من کاتی مردنم نزیکە، ئەگەر مردم لە کاتی شۆردنمدا ئامادەبە و کراسەکەی خۆتم بدەرێ تا بیبێتە کفنم!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٦] ـ (قَدْ نَهيْتُك عَنْ حُبِّ اليَهُود).

[٦٧] (قد أبغضهم أسعد ابن زراره فما نفعه)



لەوە تێناگەم کە چی لە مێشکی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول بوو، ئەگەر بڵێین دەیەوێت تۆبە بکات و پەشیمان ببێتەوە ئەم ئەگەرە زۆر دوورە، نەک هەر دوورە بەڵکو شتی وا نییە و ئەستەمە.

چونکە گومان لە مونافیقی و کوفری نییە، چونکە ئایەتی لەسەر دابەزیوە ئایەتەکانیش هەمووی توندە و دابەزیوەتە سەری.

یەک گریمانە شک دەبەم ئەویش ئەوەیە کە ئەو کراسەی بۆ شەفاعەت وەرگرتووە بە گومانی بۆ ڕۆژی قیامەت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەوپەڕی ئەدەبەوە کراسەکەی بۆ داکەند و پێیدا، چونکە دوو کراسی لەبەر دابوو.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول وتی: کراسەکەی ژێرەوەم دەوێت کە بەرپێستت کەوتووە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە لە ماڵی خۆیدا کراسەکەی بۆ داکەند و دای بە عەبدوڵڵای کوڕی بیبات بۆ عەبدوڵڵای باوکی تا بیکاتە کفنی.

پرسیار ئەوە بۆچی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کراسەکەی خۆی دایە؟!

بۆ ڕازیکردنی دڵی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵا بوو، پاشان هەرکەس داوای لە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بکردایە کافر و موسڵمان دەستی نەئەدا بە ڕوویەوە، ئەوەی هەیبوایە دەیبەخشی.

باوکی داوای لە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کرد بە شەخسی بۆیە پێغەمبەر پێیدا، پاشان بۆ ڕازیکردنی دڵی هۆزەکەی خەزرەج بوو.



بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کراسەکەی من هیچ سوودێکی پێناگەیەنێت، مەبەستم تەنها ڕەزامەندی دڵی هۆز و کەسوکارەکەی بووە کە بەتەواوەتی موسڵمان بن.[٦٨]

چونکە لە دوای مردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول زۆرێک لە مونافیقەکانی خەزرەج زۆر بە باشی موسڵمان بوون.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی دایە بە هۆکاری ئەوەی کە لە جەنگی بەدردا عەباسی مامی بە دیل گیرا، جلوبەرگی کەسی بۆ نەدەبوو لەبەر ئەوەی عەباس کەسێکی کەڵەگەت و باڵا بەرزبوو تەنها جلی عەبدوڵڵای بۆ ئەبوو، ئەوکات عەبدوڵڵا جلی خۆی دا بە پێغەمبەر ﷺ تا بیبات بۆ عەباس، ئەمەش گەڕانەوەی ئەو کراسەبوو بۆ ئالوبەیتی پێغەمبەری خوا و پێغەمبەر ﷺ بۆی گەڕاندەوە.

لە دوای مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مردووی لەسەر کرد، بەڵام ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب پێغەمبەری خوای بانگکرد و جلەکانی گرت وتی؛ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن لەسەر ئەم کەسە نوێژ دەکەیت کە خوای گەورە ڕێگری کردووە لەسەر ئەم کافرانە نوێژ بکەیت، پاشان بۆ پاڵپشتی قسەکەی ئیمامی عومەر خوای گەورە ئایەتی دابەزاند، واتا جارێ ئایەت دانەبەزی بوو بەڵام خوای گەورە ئایەتی دابەزاند فەرمووی:

﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ﴾ [التوبة]

واتە: هیچ کات لەسەر هیچ کەس لەو دووڕووانە نوێژ نەکەی کە مرد، لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، چونکە بەڕاستی ئەوانە باوەڕیان بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی نەبوو و مردیشن لەکاتێکدا لە دین دەرچوو بوون.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٨] ـ (فَقَالَ عَلَيْهِ اَلصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ : "إِنَّ قَمِيصِي لَا يُغَنِّي عَنْهُ مِنْ اَللَّهِ شَيْئًا ، فَلَعَلَّ اَللَّهَ أَنْ يَدْخُلَ بِهِ أَلْفَا فِي اَلْإِسْلَامِ").



بەڵام وتەکەی ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب لەسەر بنەمای داوای لێخۆشبوون بوو کە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت:

﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ [التوبة]

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای لێخۆش بوون بۆ ئەو دووڕووانە بکەیت یان داوای لێخۆش بوونیان بۆ نەکەیت چوونیەکە، تەنانەت ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت، ئەوە خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێت، ئەوە چونکە بە ڕاستی ئەوان باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکەی نەبوو، خوایش هیدایەت و ڕێنموویی کەسانی گوناهکار و لە سنوور دەرچوو ناکات.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: من لە ٧٠ جارەکە زیاتر داوای لیخۆشبوون دەکەم ئەمەش هەڵوێستێکی (تەورییە) بوو زیاتر بۆ کەس و کارەکەی، ڕەحمەت و شەفەقەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم زیاتر دەردەخات.

(وَسَأزِيدُهُ عەلی سَبْعين)، بەڵام عومەر هەر وتی: ئەوە مونافیقە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕەحمەت بۆ کەسوکار و بەتایبەت کوڕەکەی نوێژی لەسەر کرد، بەڵام کە ئایەت دابەزی و وەحی ئاشکرای کرد کە مونافیقە ئەوکات حوکمە شەرعییەکە بەسەریدا سەپا، بەڵام پێغەمبەری خوا بە ڕووکەش لەگەڵیدا مامەڵەی کرد و ناخ بەجێ دێڵێت بۆ خاوەن ناخەکە چی تێدایە و عیلمی بەسەردا.

لە پاشاندا ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب لەسەر هەموو موسڵمانان نوێژی دەکرد، لەسەر ئەوانەش نوێژی دەکرد کە گومانیان لێیان هەبوو مونافیق بن.

تەنها (حوزەیفەی یەمانی) نوێژی لەسەر نەدەکردن، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەموو ناوەکانی دابوویە حوزیفە دەیزانی کامە کافرە و کامە مونافیقە.



بە مردنی عەبدوڵڵای  کوڕی ئەبی سەلول و ڕووخاندنی مزگەوتەکەیان بە تەواوەتی کۆتایی بە بزووتنەوەیان هات لە ساڵی ٩ کۆچی و ١٠ کۆچی، بەو پێیەی هیچ بوونێکیان نەما لە مێژوودا لە ماوەی ئەو دوو ساڵە دا و چالاکییەکانیان کۆتایی پێهات.

بە دڵنیاییەوە بوونی موونافیق هەردەمێنێت، بەڵام مەبەستم ئەمساڵ و نیوەیە لە دوای مردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول و ساڵی ١٠ کۆچی لە شانۆی ڕووداوەکاندا بوونیان نەما.



# کاریگەری جەنگی تەبووک

ماکوان: بە هۆکاری ئەو جەنگە و سوپا گەورەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەموو عەرەب لەوە تێگەیشتن کە ئیتر ناتوانن ڕووبەڕووی دەوڵەتی ئیسلامی ببنەوە.

قورەیش هەموو موسڵمان بوون مەککە و دەوروبەری لەژێر ڕکێفی موسڵماناندا بوو، هەوازن هەموو هاتنە ناو ئیسلام، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی سەرکردایەتی سوپایەک دەکات ٣٠ هەزار سەربازە ڕووبەڕووی گەورەترین هێزی جیهانی دەبێتەوە کە ڕۆمە.

ئەوانەی کە ڕووی دا لە ناو عەرەبدا، هیچ کات عەرەب نە خەونی پێوە بینیوە نە بە خەیاڵیدا هاتووە، لە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەبووک، هەموو عەرەب بە شێوەیەکی گشتی بڕیاری ئەوەیان دا کە نوێنەری خۆیان بنێرنە لای پێغەمبەر ﷺ و پەیوەندی لەگەڵ دروست بکەن، جا ئەو هۆز و گەلانە هەموو موسڵمان دەبوون بەویست و ئارەزووی خۆیان، هەبوو موسڵمان دەبوو لە ترسی هێزی دەوڵەتی ئیسلامی، هەبوو پەیوەندی دەبەست و جزییەی ئەدا، هەیانبوو دانوستانی دەکرد بۆ ئەوەی شتێکی دەست بکەوێت، بەم شێوەیە هەموو هاتنە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامی پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەم شێوەیە نوێنەر و وەفدی هەموو وڵاتان بەرەو شاری مەدینە دەهاتن، ئەم ڕووداوانەش لە کۆتاییساڵی ٩ کۆچی بەردەوام بوو تا سەرەتای ساڵی ١٠ کۆچی، ئەم ماوەیە بە ساڵی نوێنەر و وەفدەکان ناسرابوو لە سیرەی پێغەمبەری نازداردا ﷺ، وەفدەکان زۆر بوون تەنها بریتی نەبوون لە خەڵکی عەرەب و ناوچەکە، بەڵکو وەفدەکان هەندێکیان لە ناوچەی جیاواز وەکو کوردستان و ئازەربایجان و میسر و ئەفریقا بەگشتی و عەرەب و فارس...هتد.



# ساڵی هاتنی نوێنەرەکان (وفود)

ماکوان: لە هەموو لایەکەوە نوێنەر و گەورە پیاوانی جیهان بەگشتی عەرەب بەتایبەتی دەهاتن بۆ شاری مەدینە و بۆ بەستنی پەیوەندی توندوتۆڵ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و دەوڵەتەکەیدا، هەموو زیاتر بۆ هاتنە ناو ئایینی نوێ بوو، هەبوو تەنها بۆ پەیوەندی دبلۆماسی مانەوەی و ئەمارەتەکەی هاتبوو.

دوای گەڕانەوەی لە تەبووک ئەو ساڵە ناونرا بەساڵی نوێنەرانی ناوچەکە و جیهان بە گشتی لەوانەی کە هاتن لە عەرەبەکان بریتیی بوون لە: (بەنو عەبدولقەیس و بەنو حەنیفە و خەڵکی ناوچەی نەجران، نەجران خۆی کە هەموو نەسرانی بوون، وەفدی بەنو عامر و خەڵکی طائیف و خەڵکی یەمەن بە هەموو جۆرەکانی هۆز و تیرە و عەشیرەتەکان، وەفدی کیندە، نوێنەری بەجیلە، بەنو ئەسەد، بەنو عەبس، بەنو مورە، بەنو ثەعلەبە، بەنو کیلاب نوێنەری باهیلە...هتد.)

لە ناو ئەوانەشدا هۆزی سەقیف لە شاری طائیفەوە هاتن، هەموو نیوەدوورگەی عەرەبی بانگەوازی ئیسلامیان دەکرد و چاوی پێغەمبەری نازدار بەو هەموو خەڵکەدا شاد بوو کە موسڵمان بوون، ئەوەش ئومێد و هیوای پێغەمبەر ﷺ بوو، خەونی گەورەی ئەوە بوو واهاتە دی، بۆ ئەوە ژیا کە پەیامەککەی بگەیەنێت، ئەنجامیدا بە جوانترین شێوە و بێ کەلێن و کەموکورتی، خەڵکی لە کوفرەوە بەرەو ئیمان هاتن، توانی بەرووبوومی ماندوو بوونی خۆی ببینێت، ئەمەش ئامانجی پێغەمبەری خوا ﷺبوو، توانی سەرکەوێت و بەرەندەی یەکەم بێت و خاوەنی خەڵاتی گەورە بێت، ئەویش خۆشحاڵبوونییەتی بە موسڵمانبوونی هەموو خەڵکی ناوچەکە، نموونەیەک لە هاتنی نوێنەرەکان لەوانە:

ضەمامی کوڕی ثەعلەبەی سەعدی

ماکوان: ئەم پیاوەکە لە ئەعرابییەکان بوو، لە تیرەی هەوازن بوو لە عەشیرەتی بەنو سەعد، دیارە ئەم کۆمەڵە موسڵمان نەبوبوون، بەڵام خۆی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەگەر چی سرووشتی ئەعرابییەکان بەگشتی ڕەق و وشک و نەزان بوون، بەڵام ئەم کەسە زۆر



زیرەک و وریا و لێهاتوو بوو، لە ئاستێکی زۆر بەرزی تێگەیشتندا بوو هەروەها زۆر کەسێکی ئیجابی و خاوەن ڕەوشت بوو.

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: ڕێگریمان لێکرابوو کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکەین لەسەر بواری دینی لەسەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِنْ تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ [المائدة]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پرسیار مەکەن لە هەندێک شت، کە ئەگەر ئاشکرا بکرێت بۆتان سەغڵەتتان دەکات، خۆ ئەگەر پرسیار بکەن دەربارەیان لەکاتی دابەزاندنی قورئاندا ئەوە بۆتان ئاشکرا دەکرێت، خوا چاوپۆشی لێ کردوون و (باسی نەکردوون) خواش لێخۆشبوو و بەحیلم و حەوسەڵەیە.

ئێمەش لامان سەیر بوو کە کەسێکی دەشتەکی هات و دەستی کرد بە پرسیار کردن ئێمەش گوێمان گرتبوو.

هاوەڵان خۆیان لە پرسیار کردن زۆر لائەدا مەگەر شتێک زۆر پێویست بوایە بۆ ئەوەی وەکو بەنو ئیسرائیلیان لێ نەیەت و دین قورس بکرێت لەسەریان ئەم تێگەیشتنە تێگەیشتنێکی قورئانییە.

بەهەر حاڵ ضەمام نزیک بووە و پرسی کامە لە ئێوە محمدە؟!

ئەگەر ورد بینەوە ضەمامی کوڕی ثەعلەبەی سەعدی نازانێت کامە پێغەمبەرە، ئەمەش ئەوپەڕی تەوازوعی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەناو هاوەڵاندا، وەکو ئەوان ژیاوە و جلوبەرگی لەبەر دابوو، ئەنەس دەڵێت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ شانی دادابوو لەناوماندا هەموو دانیشتبوون، ئەو کەسەی کە هەموو نیوەدوورگەی عەرەبی خستە ژێر ڕکێفی و سوپای ڕۆمی ترساند، خەڵکی دەشتەکی نازانن کە ئەمە محمدە، لەبەر سادەیی و ساکاری ئەو پێغەمبەرە نازدارە.



جارێکی تر ضەمام وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب؟!

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: وا وەڵامم دایتەوە.

ضەمام چەند پرسیارێکم هەیە، پرسیارەکانم دەربارەی تۆیە کەسایەتی تۆیە؟!

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: بە ئارەزووی خۆت بپرسە.

ضەمام: ئەی محمد نوێنەرەکەت هاتە لامان ئەو پێی وتین تۆ وتوتە کە خوای پەروەردگار تۆی ناردووە؟!

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: ڕاستی وتووە.

ضەمام: کێ ئاسمانی دروست کردووە؟

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: الله.

ضەمامە: کێ شاخەکانی چەقاندووە؟

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: الله.

ضەمام: سوێندت ئەدەم بەوەی ئاسمان و زەوی و شاخی دروست کردووە، تۆ پێغەمبەری لای خواوە هاتووی؟

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: بەڵێ.

ضەمام: نوێنەرەکەت وتی: دەبێت لە ڕۆژێکدا ٥ نوێژ بکەین؟!

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: ڕاستی وتووە.

ضەمام: خوای گەورە بۆ ئەوە ناردوێتی و ئەمری پێکردوویت؟!

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: بەڵێ.



ضەمام: هەروەها نوێنەرەکەت فەرمانی پێ کردووین بەوەی زەکات بدەین، کە گوایە لە دەوڵەمەندی دەردەکەیت و ئەیدەیت بە هەژاران؟

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم: ڕاستی وتووە.

ضەمام: ئەمەش فەرمان و ئەمری خوایە بۆ ئەمە ناردوویتی؟!

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم: بەڵێ.

ضەمام: نوێنەرەکەت دەڵێت لە ساڵێکدا لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو بین؟

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕاستی وتووە.

ضەمام: هەروەها نوێنەرەکەت دەڵێت حەجمان لەسەر ئەوانەیە کە توانای هەبوو؟

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم: ڕاستە و بەڵێ.

ضەمام: ئیمانم هێناوە منیش نوێنەری هۆزێکم، ناوم ضەمامی کوڕی ثەعلەبەیە و لە برایانی بەنو سەعدی کوڕی بەکرم، پاشان ڕەت بوو و گەڕاوە وتی سوێند بەوەی ناردوویتی، لەوەی کە وتت زیادی ناکەم و کەمیشی ناکەم.

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: ئەگەر ڕاستت کرد دەچیتە بەهەشت.

ئەم فەرزانەی کە باس کرا ئەگەر مرۆڤ کردی بێ کەموکوڕی خوای گەورە دەیخاتە بەهەشت بەڵام سوننەتەکان و نوێژ و ڕۆژوی زیاد پلەی مرۆڤ لە ناو بەهەشت دا بەرز دەکاتەوە.

ئەمەش ئاسانی و جوانی ئیسلامە.

پاشان ضەمامی کوڕی ثەعلەبە گەڕایەوە بەو زانیارییە سادانەوە کە موسڵمان دەیزانن بەگشتی، چووە ناو هۆزەکەی و وتی خەڵکینە لە دەورم کۆ ببنەوە، هەموو لە دەوری کۆبوونەوە ئینجا وتی: ئەی خراپەت بەسەر بتی لات و عوزا.



خەڵکەکە هەموو وتیان: بترسە با تووشی کەچەڵی و گولی نەبیت، بترسە با بتەکان شێتت نەکەن.

ضەمام وتی: ئەی قوڕتان بەسەر سوێند بە خوا ئەوانە نە سوودیان هەیە نە زیان خوای گەورە پێغەمبەرێکی ناردووە، لەگەڵیدا کتێبێکی ناردووە بۆ ئەوەی بتانپارێزێت لەوەی پێشتر لەسەری بووین، من لە ئێستاوە شایەتومان دەهێنم بەوەی خوا تاک و تەنهایە و محمد بەندە و پێغەمبەری خوایە و من لای ئەوەوە هاتووم فەرمانتان پێ دەکەم و نەهیتان لێدەکەم واتا ڕێگای خراپەتان لێ دەگرم بەوەی ئەو فەرموویەتی.

عەبدوڵلای  کوڕی عەباس دەڵێت شەو و ڕۆژێکی نەبرد هەرچی پیاو و ژنی ناو هۆزەکەی بوون بە موسڵمان، تەنها بەو زانیارییە کەمانەی کە بەدەستی هێنابوو، خوای گەورە هیدایەتی ئەو هۆزەی دا و هەموو چووە سەر تەرازووی حەسەناتی ضەمامی کوڕی ثەعلەبە.

هەڵنەستا بەوەی بڵێت جا من حەقم چییە زانیاری تەواوم پێ نییە، نەخێر کەسێکی زۆر ئیجابی بوو بەو زانیارییە کەمەوە دەستی کرد بە بانگەواز، لە زۆر کەس باشتر بوو بە ئەندازەیەک ئین و عەباس دەڵێت: باشترین وەفد و نوێنەر بوون کە تائێستا بینیبێتم.



## نوێنەری نەساراکانی نەجران

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەری خۆی نارد بۆ ناو مەسیحییەکانی نەجران کە سێ هەڵبژاردەی پێدان موسڵمان بوون یاخود جزیەدان یان جەنگ کردن.

نەجران لە باشووری مەککە بوو وڵاتێکی سەربەخۆبوو لە نێوان مەککە و یەمەندایە، هەموو خەڵکەکەی مەسیحی بوون، لە دوای ناردنی نوێنەری پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانیش نوێنەری خۆیان ناردەوە کە پێکهاتبوون لە ٦٠ کەس، سەرۆکی وەفدەکە ناوی (عیقاب) بوو کە گوێی بۆ ڕادەگیرا، هەروەها سەرۆکی قافڵەکەیان ناوی (سەیر) بوو ئەویش ئیدارەی کاروانەکەی دەکرد، کەسێکی ئایینیان لەگەڵ بوو کە ئوسقوفیان بوو ناوی (أبا الحارث) بوو ئەم سێ کەسە بە تەواوەتی سەرۆکایەتی وەفدەکەی نەجرانیان دەکرد.

ئەم وەفدەی کە هاتن لە شێوەی پادشا و خەڵکێکی زۆر ڕەونەقداردا هاتن، هەموو جلوبەرگی ئاوریشم (حەریر) و ئاڵتونیان پۆشی بوو، هەموو پەنجەکانیان بە ئاڵتون بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامی کردبوو لەسەر پیاوان کە حەریر و ئاڵتون بەکاربهێنن، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش نەبوو بەو شێوەیە قسەیان لەگەڵدا بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ گفتوگۆکەی دواخست بۆ ڕۆژی دواتر، کە زانیان لەبەر جل و بەرگەکەیانە ئەوانیش جل و بەرگی ڕوهبانیان کردە بەریان و پاشان دەستیان کرد بە قسەکردن.

پێدەچێت بۆیە ئەم شێوە جل وبەرگی ئاڵتونیان بە کارهێنا، تا وەکو بزانن محمد پادشایە یاخود پێغەمبەر!

لە ڕاستیدا نوێنەری نەجران نییەتیان ئەوە نەبوو موسڵمان بن، بەڵکو زیاتر دەیانویست بزانن ڕاست دەکات پێغەمبەرە و وەڵامی ئەو نیشانانەیان دەست بکەوێت کە لە تەورات و ئینجیل دا هەیە، زیاتر ئەوان بۆ خۆ نواندن هاتبوون تەنانەت گفتوگۆ کردن لەگەڵیاندا جیاواز بوو وەکو وەفدەکانی تر نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوان ڕاستەوخۆ ڕەتیان کردەوە وتیان ئێمە زۆر پێش ئێوە موسڵمان بووین.



لە ڕاستیدا قسەکەیان تەواو بوو، ئەگەر پەرتوکەکانیان نە گۆڕیبایە و دەستکاریان نەکردایە خوای گەورە دەفەرمووێت کە ئەوان موسڵمانن ئەگەر لەسەر دینی حەقی عیسای کوڕی مەریەم بن.

﴿وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ۝﴾ [القصص]

واتە: کاتێکیش قورئان دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا دەڵێن: ئێمە باوەڕمان پێ هێناوە چونکە بەڕاستی ئەمە حەقیقەت و ڕاستەقینەیە لەلایەن پەروەردگارمانەوە پێمان ڕاگەیەنراوە بێگومان ئێمە پێشتر هەر موسڵمان و فەرمانبەردار بووین.

لە ڕاستیدا وەکو ئاماژەم پێدا ئەگەر ڕاستگۆبن لەگەڵ کتێبەکەیاندا کە ئینجیلە هەموو سیفاتی پێغەمبەری لەناو باسکراوە و مژدەی هاتنی پێغەمبەری داوە، هەر بۆیە ناونراوە بە ئینجیل، موژدەی سەرەکی هاتنی محمد پێغەمبەرە وشەی ئینجیل واتا مژدە و مزگێنی.

زاناکانیان لە بەنو ئیسرائیل ئەوە باش دەزانن

﴿أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ۝﴾ [الشعراء]

واتە: ئایا لەوەدا بەڵگە و نیشانە نەبوو بۆ ئەو خەڵکە کە زاناکانی نەوەی ئیسرائیل دەربارەی پێغەمبەر و قورئان، گەلێ شت دەزانن.

بەهەرحاڵ هەموو باش دەزانن نیشانەکان چییە و لە تەورات و ئینجیل دا باسکراوە، بەڵام ئەوان دەیشارنەوە، ماناکانی وەردەگێڕن بۆ مانای تر.

هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی ئەوەی کە وتیان ئێمە موسڵمانین، فەرمووی ئێوە موسڵمان نین بەڵکو نەسرانین، لەبەر ئەوەی مانای ئیسلام تەسلیم بوونە بەخوای پەروەردگار، بە یاسا و تەشریعەکانی، مرۆڤ ناکرێت تەسلیم بێت بە هەوا و ئارەزووەکانی، یاخود بەرژەوەندییە تایبەتەکانی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دووپاتی کردەوە فەرمووی: سێ شت ڕێگری لە ئێوە کردووە تا موسڵمان بن.

١- بەندایەتی بۆ خاچ دەکەن.



٢- گۆشتی بەراز دەخۆن.

٣- پاشان دەڵێن خوا كوڕی هەیە( پەنابەخوا). [٦٩]

جا لەبەر ئەوە ئێوە تەسلیم نەبوون بە خوای گەورەی جیهانیان، هەر لەبەر ئەوە ناشێ بە خۆتان بڵێن موسڵمان، دەبێت واز لەو بیروباوەڕە گەندەڵە بهێنن، بەداخەوە ئەوە باوەڕی زۆری مەسیحییەكانی جیهانە.

هەر ئەوەشە ڕێگریان لێدەكات بێنە ناو ئیسلام، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: لە گەڕانەوەی عیسای كوڕی مەریەم لە پێش هاتنی قیامەتدا كاری سەرەكی بریتییە لە شكاندنی خاچ و كوشتنی بەراز و وەرگرتنی جزیە لە كافران تا سەروەت و سامان ئەوەندە زۆر دەبێت لە سەردەمی حوكومڕانیدا تا ڕادەیەک كە كەس پێویستی بە پارە نییە. [٧٠]

وەفدی نەجران خاچ بە بەشێک لە دین نازانن، بەڵكو هەموو مەبەسەتەكان خاچپەرستی بە دین دەزانن، هەر بۆیە كاری یەكەمی حەزرەتی عیسا كە دەگەڕێتە خوارەوە شكاندنی خاچ و دەستكردی نەسارایە، هەربەم هۆكارە نەجرانییەكان ڕەتیان كردەوە موسڵمان بن، مەبدەئی ئیسلامیان بە هیچ شێوەیەک قبوڵ نەبوو بەهەرحاڵ نەیاندەویست موسڵمان بن، هەر لەبەر ئەوە زیاتر خەریكی موجادەلە كردن بوون، شوبوهاتیان زۆر دروست دەكرد, پێغەمبەر ﷺ وەڵامی ئەدانەوە بە خێرایی, لەو گومانانە بە پێغەمبەریان وت بۆ قسە بە هاوەڵەكەمان دەڵێیت مەبەستیان حەزرەتی عیسای كوڕی مەریەم بوو دەڵێیت بەندەی خوایە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٩] ـ (مَنَعَكُمْ مِنْ اسْلَام ثَلَاثَة قَوْلُكُمْ اِتَّخَذَ الله وَلَدًا وَأَكَلَكُمْ اَلْخَنْزِير وَسُجُودَكُمْ لَلْصَلْيب).

[٧٠] ـ (وَالَّذِي نَفْسِيٌ بِيَدِهِ لِيُوشِكَنَ أَنَّ يَنْزِلُ فِيكُمْ اِبْنْ مَرْيَمْ حُكْمًا مُقْسِطًا فَيَكْسِرُ اَلصَّلِيبُ وَيَقْتُلُ اَلْخِنْزِيرُ وَيَضَعُ اَلْجِزْيَةَ وَيَفِيضُ اَلْمَالُ حَتَّى لاَ يَقْبِلُهُ أَحَدٌ) روى أحْمَد وابن حَبَان.



پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر بە ڕاشکاوانە فەرمووی: بەڵێ من دەڵێم بەندەی خوایە و بەهەمان شێوە پێغەمبەری خوایە، ئەو کەلیمەیە کە خوای گەورە بەخشی بە مەریەمی پاک و بێگەرد.[71]

لە ڕاستیدا ئەوە قسە پێوتن نییە، بەڵکو حەقی ڕاستی و ڕێزی حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەمە، باشترین شەرەف بۆ مرۆڤ عەبدایەتی و بەندایەتییە بۆ خوای پەروەردگار، پێغەمبەرە و لە ئولوعەزمە واتە لە پێنج پێغەمبەرە گەورەکەیە، ئەو کەلیمە واتا ئەو ئەمرو ڕۆحەیە خوای گەورە بە کون فەیەکونێکدا فەرمووی ببە دەبێت بە خاتوو مەریەمەی دایکی کە ئافرەتێکی بەڕێز و پاک بوو.

بەڵام نەساراکان لە سنووری خۆیان دەرچوون و کردوویانە بە خوا، لە ڕاستیدا ئەمە ڕێز نییە، بەڵکو دەرکردنە لە سرووشتی خۆی، زۆر جار دەڵێین خوایە، یان کوڕی خوایە، یان دەڵێن سێ دانە خوایە (ثالث ثلاثة) هەموو ئەمانە زیادە ڕۆییە و هیچی ڕاست نییە، بەڵکو بیروباوەڕێکی خراپ و گەندەڵە، لە سنووری ڕاستی خۆی زۆر دەرکراوە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە قەبرەکەی نەکرێتە مزگەوت، نەیدەهێشت موسڵمانان خۆشەویستیان لە سنوور دەرباز بکات و جەختی لەسەر مرۆڤ بوونی خۆی دەکردەوە، وای نیشان ئەدا ئەویش وەکو هەموو مرۆڤێک دەمرێت و کۆتایی بە ژیانی دێت.

تەنانەت لەسەرە مەرگیدا فەرمووی: لەعنەتی خوا لە یەهوود و نەسارا کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکەنە مزگەوت.[72]

بەڵام دیار بوو وەفدی نەجران هەر تەنازولیان لە بیروباوەڕیان نەدەکرد, تورە بوون لەوەی وەسفی عیسای کوڕی مەریەم بە عەبد و پێغەمبەری خوا وەسف کرد، زۆر بە تورەیی بە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[71] ـ (قَالَ لَهُمْ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " أَجَلْ ، إِنَّهُ عَبْدُ اَللَّهْ وَرَسُولِهِ ، وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمْ اَلْعَذْرَاءْ ، اَلْبَتُولُ ").

[72] ـ (لَعَنَ اَللَّهُ اَلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى اِتَّخَذُوا قُبُورُ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِد).



پێغەمبەریان ﷺ وت ئایا لە ژیانتدا مرۆڤێکت بینیوە بێ باوک لە دایک بێت نموونەیەکمان بدەرێ؟![73]

ئەوەندە سەرەڕۆبوون بە پێغەمبەری خوایان فەرموو ئەگەر ڕاست دەکەیت نموونەیەکمان بدەرێ لەوەی کە مرۆڤ بێ باوک دروست دەبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە هێواشی و هێمنی فەرمووی (ئادەم) چونکە لە ناو ئینجیل دا بڕوایان بە حەزرەتی ئادەم هەیە بێ باوک و دایک دروست بووە، ئینجا ئەو ئایەتەی بۆ خوێندنەوە.

﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ۝﴾ [آل عمران]

واتە: حەقیقەت و ڕاستی هەر ئەوەیە لەلایەن پەروەردگارتەوەیە، کەواتە نەکەیت بچیتە ڕیزی ئەوانەی کە گومان کاریگەری هەیە لەسەریان.

ئەگەر بڕواتان بە ئادەم هەیە خۆ هەر مرۆڤە و پێغەمبەرە خوای پەورەردگار بێ دایک و باوک دروستی کردووە.

هەروەها ناکرێت و ئەقڵ قبوڵی ناکات مرۆڤێک ببێتە خوا و پێداویستی هەبێت و بخوات و بخەوێت و منداڵ بێت و توانای هیچی نەبێت پاشان ببێتە منداڵی گەورە و هەرزەکار و پاشان پیاو، لەسەرووی هەموو ئەمانەوە ئەم خوایە بەدەست مرۆڤ بکوژرێت و لەناو بچێت و لە خاچ بدرێت!

لە کاتێکدا ئێمەی موسڵمان ڕێز و حورمەتی حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم (عەلیەالسلام) دەگرین و دەڵێین لە خاچ نەدراوە بەڵکو بەرزکراوەتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار.

---

[73] ـ (فَغَضِبُوا، وَقَالُوا: هَلْ رَأَيْتُ إِنْسَانًا قَطُّ بِلَا أَبٍ؟! فَنْ كُنْتَ صَادِقًا فَأَرِنَا مَثَلَهُ).



﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا﴾ [النساء]

واتە: بەهۆی ئەو قسەیەشیان کە دەیانوت بە ڕاستی ئێمە مەسیح پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مەریەممان کوشتووە، کەچی لەڕاستیدا نەکوشتوویانە و نە لە قەنارە و خاچیانداوە، بەڵکو لێیان تێکچووە و (کەسێکی تریان کوشتووە لە بری ئەو)، بەڕاستی ئەوانەی کە بیرو بۆچوونی جیاوازیان لەو کێشەیەدا هەیە، خۆشیان لە گوماندان تیایدا و ئەوانە هیچ زانستیەکی ڕاستیان نییە لەو بارەیەوە، جگە لە شوێنکەوتنی گومان نەبێت و بەدڵنیاییەوە (دەڵێین) کە نەیانکوشتووە و بۆیان نەکوژراوە.

ناکرێت خوا ئەوەندە لاواز بێت و بەو شێوەیە ناسوتی سەرزەوی بانگ بکرێت، بە خوای ئاسمانیش.

موسڵمانان بە گشتی بە پێغەمبەر و موعجیزەی خوای گەورەی دەزانن و لە خاچ نەدراوە لای موسڵمانان خۆی و دایکی گەورە و جێگای ڕێزن.

بەهەرحاڵ نوێنەری نەجران توانای قسە و باسیان نەما و داوای ئەوەیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد با (موباهەلە) بکەین واتا (لەعنەت) لە یەکتر بکەین هەرکەس درۆی کرد خوای گەورە لەعنەتی خۆی بکاتە بەری و بەر کەسوکاری، ئامادەیت؟!

خوای گەورە فەرمووی:

﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ [آل عمران]

واتە: (دوای ئەوەی کە هەموو ئەو ڕاستییانەت پێگەیشت دەربارەی عیسا)، جا ئەگەر کەسانێک هەر موجادەلەیان کردوو لەسەری ڕۆیشتن و شتی ناڕەوایان دەربارەی عیسا وت، تۆیش پێیان بڵێ: وەرن با کوڕانی ئێمە و کوڕانی ئێوە، ئافرەتانی ئێمە و ئافرەتانی ئێوە، خۆمان



و خۆشتان بانگ بکەین و ئامادەبین (لە شوێنێکی تایبەتدا)، پاشان لە خوا بپاڕێنەوە و ئینجا داوا بکەین نەفرین و لەعنەتی خوا داببارێتە سەر درۆزنەکان.

یاخود دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردووە، بەهەرحاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەیی دەربڕی بۆ بەیانی فاطیمەی کچی و حەسەن و حوسێن و ئیمامی عەلی لەگەڵ خۆی برد بۆ موباهەلە کردن، چونکە دەبوو هەردوولا کەس و کاری خۆیان کۆ بکەنەوە لە بەرامبەر یەکتردا و بوەستن بۆ موباهەلە کردن، پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە بوو، چونکە ڕاستگۆبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ هات و دەستی حەسەن و حوسێنی گرتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بە نوێنەرەکانی وت: هەردوو لامان هەر دوعایەکمان کرد ئەبێت بڵێین ئامین؟!

کاتێک نەسارەکان بینیان پێغەمبەر زۆر جدییە، ترسان لە نەعلەتی کردنەکە، وتیان؛ هەر گەلو هۆزێک موباهەلە لەگەڵ پێغەمبەردا بکەن ئەوا لە ناوچوون، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەوان تووشی گومان و دڵەڕاوکێ بوون، دڵنیابوون لە ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام ئینکاری کوێری کردبوون شوێن هەوا و نەفەسی خۆیان کەوتن، لە کۆتاییدا دابەزین بۆ ڕای پێغمبەری خوا ﷺ و وتیان چۆن پێت خۆشە فەرمانڕەواییمان بکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ صوڵحی کرد لەگەڵیان بە دانی جزیە.

کاتێک ویستیان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کەسێکی ڕاستگۆ و ڕاستیان لەگەڵ بنێرێت بۆ کۆکردنەوەی جزیە، داواکەیان ئەوە بوو کە کەسێکی ڕاستگۆ و ئەمین بێت.



پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەمینی ئەمینەکانتان لەگەڵ دەنێرم، فەرمووی ئەی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح هەڵسە و لەگەڵیاندا بڕۆ، کە ئەبوعوبەیدە هەڵسا فەرمووی ئەم کەسە ئەمینی ئەم ئومەتەیە.[٧٤]

لە کاتی گەڕانەوەیان کەسێک لە نوێنەری وەفدەکە پرسی ئەگەر دەزانن دینەکەتان ڕاستە بۆ جزیە ئەدەن، خۆ ئەگەر دینی محمد ڕاستە با ئیمان بهێنین، سوێند بە خوا من دەگەڕێمەوە و ئیمان دەهێنم.

بەڵام ئەوانی تر بە گشتی حەقیان بینی و شوێنی نەکەوتن و ئینکاربوون، هەروەکو خوای پەروەردگار فەرمووی:

﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴿١٤﴾﴾ [النمل]

واتە: جا ئەوانەی هەر ڕق ئەستووریيان کرد و باوەڕیان پێی نەبوو، بە زۆرداری و خۆبەزلزانی، لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتەو ڕاستە، دە تەماشا بکە و سەرنج بدە بزانە سەرەنجامی تاوانباران و گوناهکاران چۆن بوو (چۆن تۆڵەمان لێ سەندن).

ئەمەش زیاتر متمانەی بەخشی بە موسڵمانان، بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ڕوون بوویەوە کە لە ڕاستیدا دینی ئیسلام ڕاستە و لە ناخی خۆیاندا دانی پێدا دەنێن، بەڵام حەزیان بە موجادەلە و موناقەشەیە و شوێن هەوا و ئارەزووەکانیان کەوتوون ئەوان ناتوانن پێغەمبەر ﷺ بە درۆبخەنەوە، بەڵکو ئینکارن و حەزیان بە دەمەدەمێیە، خوای گەورە لە حەقیاندا دەفەرمووێت:

---

[٧٤] ـ (أَنَّ اَلنَّبِيَّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ لِأَهْلِ نَجْرَانِ : لَأَبْعَثَنَّ إِلَيْكُمْ رَجُلاً أَمِينًا حَقَّ أَمِينٍ ، فَاسْتَشْرَفَ لَهَا أَصْحَابُ اَلنَّبِيِّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ).



﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ۝﴾ [الأنعام]

واتە: بەڕاستی چاک دەزانین کە گوفتاری نادروستی خوانەناسان غەم و پەژارەت بۆ پێش دەهێنێت، چونکە بەڕاستی ئەوانە وەنەبێت تۆ بەدرۆزن بزانن، بەڵکو ستەمکاران هەر داننانێن و ئینکاری ئایەت و فەرمانەکانی خوا دەکەن.

ئەمەش ڕاستی ژیانی بێباوەڕانە لەم ژیانەدا و کۆتایی دەبێت بەرپرسیارێتی بگرنە ئەستۆ.



# وەفدی گەلی کورد

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرێک لە وەفد و نوێنەرەکانی بینی، نوێنەرەکەی گەلی کورد هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ٩ کۆچی سەرۆکی وەفدەکە کەسێک بوو بە ناوی (جابانی کوردی) لەگەڵ خۆیاندا دەستێک جلی کوردییان بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بردبوو کە ناسراوە بە (بخمي الكوردي) پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لێکرد و کردیە بەری، فەزلی جلی کوردی دا بە سەر جلوبەرگی یەمەنیدا.[٧٥]

ئەم وەفدەی کوردییە دەمێک بوو لە کوردستانەوە کە ناسرابوو بە وڵاتی (شاخ) (بلاد الجبل) هەوڵی بیستنی پێغەمبەریان پێ درابوو لە لایان زانای گەورەی مەجوس (پیر شالیار)، هاتن و هەواڵی خۆشەویستی و چاوەڕوانیان دایە پێغەمبەری خوا ﷺ و لە سەردەمی ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب دا کورد بە هۆکاری ئەو نوێنەرە بوونە موسڵمان و بە خۆشەویستی و بێ جەنگ باوەشیان بۆ ئیسلام کردەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٧٥ ـ عَنْ عَائِشَةَ ، قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلَامٌ ، فَقَالَ : شَغَلَتْنِي أَعْلَامُ هَذِهِ ، اذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِي جَهْمٍ ، وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّتِهِ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُعَاذٍ ، حَدَّثَنَا أَبِي ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَعْنِي ابْنَ أَبِي الزِّنَادِ ، قَالَ : سَمِعْتُ هِشَامًا ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ عَائِشَةَ ، بِهَذَا الْخَبَرِ ، قَالَ: وَأَخَذَ كُرْدِيًّا كَانَ لِأَبِي جَهْمٍ ، فَقِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ الْخَمِيصَةُ كَانَتْ خَيْرًا مِنَ (الكُرْدِيِّ)/البخاري ومسلم



# كۆتایی ساڵی ٩ كۆچی و وەفدەكان

ماكوان: وەفدەكان نوێنەری هەموو لاكان زۆر بوون، لە ڕاستیدا باسی وەفدەكان پێویستە كاتێكی تایبەتی بۆ تەرخان بكرێت چونكە ڕووداوەكان زۆرن، هەربەردەوام نەبوو لە ساڵی ٩ كۆچی بەڵكو تا ساڵی ١٠ كۆچیش بەردەوام بوو هەموویان گرنگ بوون زۆرێكیان موسڵمان بوونیان لە ژێر دەستی پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند، ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی موسڵمانان و قەڵەمڕەوی پێغەمبەری خوا ﷺ فراوانتر دەبوو تا لە كۆتایی ساڵی ١٠ كۆچی گەیشتە ١٣٠ هەزار هاوەڵ كە تەنها لە حەجی ماڵاوایی لەگەڵ پێغەمبەردا بوون بێجگە لە ناوچەكانی تر، ئەو ژمارەیە تەنها لە شاری مەككە كۆبوبوویەوە، هۆز و گەلی وا هەبوون كە دەهاتنە ناو ئیسلام ژمارەیان لە سەروو ١٠٠ هەزار كەسەوە بوو، گومانی تێدا نییە ئەم ڕەوەندە نوێیە وەكو سەرەتاییەكان پەروەردە نەبوبوون، جا ئەم وتەیەم تەفسیری ئەوە دەكات كە لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵگەڕانەوە لە دین ڕوو ئەدات.

ئەمەش مانای ئەوە نییە كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی پەروەردەكردنی نەداون، بەڵكو زۆرترین توانا و هێزی بۆ پێگەیاندنی ئەو خەڵكە بەكارهێنا و بۆ هەموو ناوچەكان هاوەڵی دەنارد وەكو نموونەی موعاذی كوڕی جەبەل و ئەبوموسای ئەشعەری...هتد، هەموو ڕێنماییەكان گرنگ بوون كە وەریان دەگرت بۆ پێگەیاندنی خەڵكی و تێگەیشتنیان لە ئیسلام.



# بانگەواز لە کاتی حەج دا کە موشریک چیتر بۆی نییە حەج بکات

ماکوان: لە کۆتایی ساڵی ٩ کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ قافڵەی حەجی ڕێکخست، بەڵام خۆی تەشریفی نەبرد، بەڵکو ئیمامی ئەبوبەکری صدیقی کردە سەرۆکی قافڵەکە و ئەمری کرد بە موسڵمانان ئیمامی ئەبوبەکری صدیق ئەمیریان دەبێت، هۆکاری نەچوونی جەنابیان لەم ساڵەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە حەج کراوە بوو بۆ موسڵمانان و موشریک چونکە کۆمەڵێک جێگا لە چواردەوری مەککە و نیوەدوورگەی عەرەبیدا لە هۆزەکان بەردەوام لەسەر شیرک بوون و بتپەرست بوون، بە دڵنیاییەوە کۆمەڵێکی زۆر لەو موشریکانە دەڕۆشتن بۆ حەج، هاوەڵان بە پێغەمبەریان فەرموو ئەمساڵ کۆمەڵێک لە موشریک بۆ حەج ئامادە دەبن و بە ڕووتی طەواف دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی من پێمخۆش نییە حەج بکەم و ئەم موشریکانە بە ڕووتی ببینم، حەج ناکەم تا کۆتایی بەوە نەیەت.[٧٦]

لە کاتی دەرچوونی کاروانی حاجیانی موسڵمان بە سەرۆکایەتی ئەبوبەکری صدیق، واتا کاروانەکە کەوتە ڕێ و مەککەی جێهێشت، سەرەتای سورەتی (التوبة)دا کە هەموو تەشریع و یاسا و پرسیار بوو بۆ حەج و موشریکەکان کە چیتر بۆیان نییە ڕووبکەنە ماڵی خوا، لە کاتی حەجدا و لە ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی جەژن ئەم ئایەتانە بخوێندرێتەوە، ئیتر موشریک بۆ ساڵی ئایندە مافی حەجکردنیان نابێت لە ماڵی خوا شیرک بڵاو بکەنەوە، ئیتر ئەم جێگایە تا ڕۆژی قیامەت جێگای یەکتاپەرستییە، ناکرێت خوای پەروەردگار پێغەمبەری ناردووە بۆ ئەوەی تەوحید بڵاو بکاتەوە، بەردەوام موشریک لە کەعبەدا بە فیکە لێدان و ڕووت و قووتی جاهیلی هاوار لە لات و عوزا بکەن، ئەگەر چی بوونیشیان نەماوە، ئەو جێگایە پاکە و دەبێت بە پاکی ڕابگیرێت و خوێنی چەندین هاوەڵی بەڕێز لە پێناوی یەکتاپەرستیدا ڕژاوە، ٢٢ ساڵە پێغەمبەر ﷺ لەم پێناوەدا جیهاد و خەبات و کۆشش دەکات، دەبێت ئەم ساڵ بانگەوازی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٦] ـ (قَالَ الصَحَابَة الرَّسُول الله(ﷺ): أنَّ الْمُشْرِكُونَ يَحْضُرُونَ وَيَطوفُونَ بِالْبَيْت عراةً فَقَالَ النَّبي (ﷺ) لا أحِبُّ أنْ أحُجَّ حَتَّى لا يَكُونَ ذلِك).



بکرێت و ساڵی داهاتوو موشریک لە چواردەوری مەککە و مەدینە نابێت بمێنێت و دەبێت بەڕائەت لە موشریک بکرێت، بەڵام ئەمساڵ بانگ ئەدرێت بە گوێی هەموو لایەک تا بیانوو و هەنجەت لای کەس نەمێنێت.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەم کارە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبی ڕاسپارد تا هاوکاری ئیمامی ئەبوبەکر بێت، چونکە ئیمامی ئەبوبەکر سەرۆکە و خەڵکی فێری چۆنیەتی حەجکردن دەکات، نایەوێت سەرقاڵ بێت بە بانگەوازی بەرائەتکردن لە موشریکەکان و ئیمامی عەلی بەو کارە هەڵدەستێت و دەبێت لە کاتی حەج کردندا ئایەتەکان بدات بە گوێی خەڵکیدا.

چونکە لە کۆندا وابوو هەرهۆزێک ئەگەر پەیمانی شکاند یاخود جەنگی بکردایە لە کاتی حەجدا بە ئاشکرا سەرۆک هۆزەکان مەبەستی خۆیان ڕادەگەیاند، یان کەسێکیان لە ئالوبەیتی هۆزەکە دەنارد بۆ ئەوەی بانگەوازەکە ڕابگەیەنێت.

هەر بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کوڕی مامی خۆی ڕاسپارد کە خەڵکی کارەکە بە جدی وەربگرێت کاری ئیمامی عەلی تەنها گەیاندنی پەیامی قورئانە و کە چیتر موشریک بۆی نییە بڕواتە حەج و لە نیوەدوورگەی عەرەب دا بمێنیتەوە، یان جەنگ یان موسڵمان بوون.

هەر بۆیە کاتێک ئیمامی عەلی گەیشت بە کاروانەکەی ئیمامی ئەبوبەکر، باسەکەی بۆ کرد کە بەیانی بەرائەتی موشریکی نییە، ئیمامی ئەبوبەکر ڕاستەوخۆ وتی ئەگەر ئەمیری با خێرا ئەمانەتەکەت بۆ بەجێ بهێڵم؟!

ئیمامی عەلی فەرمووی: نەخێر تۆ ئەمیریت و منیش مەئمورم، واتا ڕاسپێدراوم بۆ کارێکی تایبەت و لە ژێر ئەمری تۆ دام.

کاروانەکە ڕێگای بڕی و گەیشتە شاری مەککەی پیرۆز، مەراسیمی حەج دەستی پێکرد، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئیمامی ئەبوبەکری فێرکردبوو چۆن مەراسیمەکان ئەنجام بدات، بەهەمان شێوەش ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستی کرد بە خوێندنەوەی بەیان و بەلاغی خوای بۆ ئەوەی خەڵکی لە تەشریعاتی نوێ شارەزابن.

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب دەستی کرد بە خوێندنەوەی سەرەتای سورەتەکە



﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ١﴾

واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت و کاول بوونی بوونەوەر کارەساتێکی زۆر گەورەیە و ڕووداوێکی سامناکە.

﴿يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ٢﴾

واتە: لەو ڕۆژەدا کە کارەساتەکە دەبینن، هەموو شیردەرێك لە شیرخۆرەکەی بێئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەموو سك پڕو دوو گیانێکش کۆرپەلەکەی دادەنێت، خەڵکی دەبینیت، وەکو سەرخۆشن، لە ڕاستیدا سەرخۆشیش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکە و سەری لێ شێواندوون.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَـٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَـٰنٍ مَّرِيدٍ ٣﴾

واتە: هەندێ لە خەڵکی دەبینیت بەبێ هیچ زانستی و زانیارییەك دەربارەی (گەورەیی و دەسەڵاتی) خوای پەروەردگار موجادەلە دەکەن و باس و خواس دەکەن و شوێن هەموو شەیتانێکی یاخی و سەرکەش دەکەون.

﴿كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ٤﴾

واتە: لەسەر شەیتان بڕیاردراوە، بێگومان ئەوەی شوێنی بکەوێت و بەگوێی بکات، ئەوە بەڕاستی گومڕای دەکات و ڕێگەی بۆ خۆش دەکات تا بەرەو سزای دۆزەخ بیبات.



﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ۝٥﴾

واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندوو بوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن کە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا (نەوەکان) لە نوتفەیەك (پەیدا بوون)، پاشان نوتفەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێك لەناو منداڵداندا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەکی تەواو و سەرو سیمادار، یان ناتەواو، (هەموو ئەم شتانە دەهێنینەوە یادتان) تا بۆتان ڕوون بکەینەوە کە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروستکدووە و دووبارە دروستکردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین، تا کاتێکی دیاریکراو، لەوەودوا بەساوایی و بەبچووکی دەرتاندەهێنین (لە سکی دایکتان) دوایی بۆ ئەوەی گەورە بین و بگەنە ئەوپەڕی هێز و تواناتان، هەتانە دەمرێنرێت بەگەنجی، هەشتانە دەگەڕێنرێتەوە بۆ پەرپووترین تەمەنەکان، بۆ ئەوەی هیچ شتێك نەزانێت دوای ئەوەی جاران دەیزانی، (بەڵگەیەکی تریش لەسەر زیندووبوونەوە ئەوەیە کە ئەی ئینسان) تۆ زەویش دەبینیت وشك و برنگە، جا کاتێك ئاوی بارانمان بەسەردا باراند، دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و ڕەگ و چڵ دەردەکەن و دەڕوێن، ئەوسا لە هەموو جۆرە گژوگیاو گوڵ و گوڵزارێکی جوان جووت دەڕوێنێت.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝٦﴾

واتە: (ئەم شتانەی کە باسکران) بۆ ئەوەیە کە دڵنیابن هەر خوا زاتێکی حەق و ڕاستە، بێگومان هەر ئەویش بەئاسانی مردووان زیندوو دەکاتەوە و بەڕاستی ئەو پەروەردگارە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.



﴿وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي ٱلْقُبُورِ۝٧﴾

واتە: بێگومان قیامەتیش هەر بەرپا دەبێت و پێش دێت و هیچ گومانی تێدا نیە و بەڕاستی ئەو خوایە هەر هەموو ئەوانەی کە لەناو گۆڕدان زیندوویان دەکاتەوە و دەیانهێنێتە دەرەوە.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ۝٨﴾ [الحج]

واتە: هەندێك خەڵكی هەن موجادەلە دەربارەی زاتی خوا و سیفاتە پیرۆزەكانی دەكەن دوور لە هەموو زانست و زانیاری بۆچوون و كتێب و سەرچاوەیەكی ڕوون و ئاشكرا.

ئایەتەكان بەم شێوە ئەسەفە (پەرۆشی) دەخوێندەوە كە هەموو تەشریعاتی نوێ و یاسای نوێ بوو لەوپەڕی گرنگی دا، لە دوای خوێندنەوەی ئایەتەكان ئیمامی عەلی فەرمووی ئەی خەڵكینە یاساكان داوای چوار شت دەكەن:

١- ئەوەی ئیماندار نەبێت ناڕواتە بەهەشت.

٢- كەس بۆی نییە بە ڕووت و قووتی طەواف بكات.

٣- لە نێوان هەر لایەک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ هەر عەهد و پەیمانێک هەیە تاكاتی خۆی كاری پێدەكرێت.

٤- هیچ موشریكێک لە دوای ئەم ساڵەوە بۆی نییە بێت بۆ حەج.

ئەم چوار خاڵە و بەگشتی ئایەتەكان لێكۆڵینەوە و لێوردبوونەوە هەڵدەگرێت

یەكەم: ئەم بانگەوازە ڕاستەوخۆ بۆ موشریكە لە دوای كۆتایی هاتنی پەیماننامەككەیان كە چوار مانگ یاخود بە گوێرەی پەیمانەكەیان لەگەڵ پێغەمبەر كە زۆربەی ناگات بە ٧ مانگ، لە دوای ئەوە لە ناوچەی (نجد) واتا چواردەوری مەككە و مەدینە، نابێت هیچ موشریكێک بمێنێت دوو هەڵبژاردەی هەیە، یان جەنگ یاخود موسڵمان بوون، لەوانەیە پرسیارێک بێت بە مێشكماندا، ئایا مەبەستی موشریكی شاری مەككەیە، یاخود موشریكی نیوەدوورگەی عەرەبییە لە ئایەتەكاندا لە سورەتی البراءة (التوبة)؟



لە نێوان زانایاندا ڕای جیاواز هەیە لەسەری، بەڵام ڕای تەواو و ڕاست لای ئەوانەیە کە دەڵێن مەبەست لە هەموو نیوەدوورگەی عەرەبە کە چواردەوری مەککە و مەدینەیە، یان ناسراوە بە خاکی (نجد).

لەبەر ئەوەی بە درێژایی ٢٠ ساڵ موشریکەکانی نیوەدوورگەی عەرەبی موسڵمانانیان دەکوشت و جەنگیان لەگەڵ دەکردن، بەهێزی کۆمەڵ و ئەحزابەوە کۆدەبوونەوە و جەنگی موسڵمانانیان دەکرد، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ٣٦﴾ [التوبة:٣٦]

واتە: بێگومان ژمارەی مانگەکان لای خوا دوانزە مانگە، لەکتێبی خوادا لە (لوح المحفوظ) دا دیاریکراوە، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چوار مانگی بە حەرام داناوە (واتە جەنگ تیایدا نابێت بەرپا ببێت)، هەر ئەوەیە ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروست، کەوابوو لەو مانگانەدا ستەم لە خۆتان مەکەن و جەنگ بەرپا مەکەن، بەڵکو تەنها دژی موشریکانی (شەڕەنگێز) هەمووتان بجەنگن بە گشتی, هەروەکو ئەوان دژی ئێوە دەجەنگن بەگشتی، ئینجا بشزانن کە خوا یارو یاوەری ئەو کەسانەیە کە لێی دەترسن و پارێزکارن.

بۆیە خوای پەروەردگار گشتاندنی بەکار هێناوە بۆ موشریک، لەبەر ئەوەی ئەوانیش واتا موشریک موسڵمانانیان بەگشتی دەکوشت دەستیان نەدەپاراست.

لێرەدا بە مانای ئەوە نایەت موسڵمانان وەکو موشریکەکان، بکەونە چەتەیی و تاڵانی و دەست درێژی بۆسەر نامووسی خەڵک، بەڵکو بە واتای لابردنی زوڵم و زۆری موشریک لەسەر خەڵکی بە گشتی و لەناوبردنی بیروباوەڕی خورافات و جاهیلی، جەنگ لێرەدا لە پێناوی دین و خودایە، نەک لە پێناو هەوا و ئارەزو و نەفسی هۆزگەرایی، ئەمەش مانای ئەوەنییە لە دونیادا ئەوەی موشریک بوو دەبێت بکوژرێت، ئەمە شتێکی زۆر ناواقعییە، بەڵکو تەنها و تەنها مەبەستی ناوچەکەیە، ئەویش ناوچەی (نەجد)، چونکە خوای گەورە لە هەمان سورەتدا چۆنیەتی جەنگ لەگەڵ موشریک ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێت:



﴿أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣﴾ [التوبة]

واتە: باشە، ئایا ئێوە ناجەنگن دژی کەسانێک کە بەڵێن و پەیمانەکانیان هەڵوەشاندەوە و هەوڵیشیاندا کە پێغەمبەر دەرکەن لە شاری (مەککە) و هەر ئەوانیش یەکەمجار دەستیان کرد بە دژایەتیتان، ئایا لەوان دەترسن؟ جا خۆ هەر خوا شایستەیە کە لێی بترسن ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

لێرەدا باسی ئەو موشریکانە دەکەین کە پێشتر خەریکی جەنگ و پیلانگێڕان و کوشتنی موسڵمانان بوون، بەڵام ئەوانەی کە هیچ پەیوەندییان بە موسڵمانانەوە نەبووە، کەواتە بەرخورد یان ئازادبوونیان لەوەی یان جەنگ یان جزیە، یاخود موسڵمان بوون، بەڵام لە بەرامبەر ئەوانەی شەڕەنگێز بوون، بە دڵنیایەوە هەڵبژاردەی سێیەم واتا دانی جزیە نایانگرێتەوە.

لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشدیندا، هاوەڵان باش لەم ئایەتە و ئەحکامەکانی تێگەیشتوون، خۆ لەکاتی فتوحاتیاندا لە عێراق و شام و ئازەربایجان و ئەرمینیا و کوردستان و ئەفغانستان و هیندستان موشریکیان نەکوشت!

ئەوانەی موشریک بوون وازیان لێهێنان بۆ ئەوەی بە ئازادی یان ئیسلام هەڵبژێرن یاخود لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە.

لە فتوحاتی ئیسلامیدا یەک کەس نەکوژراوە لەسەر ئەوەی کە موشریک بووە، لە فەرموودەیەکیدا دەفەرمووێت کە فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکی بجەنگم هەتاوەکو شایەتومان دەهێنن، هەموو زانایان بە گشتی، لەسەر ئەوە کۆکن کە مەبەست لە موشریکی نیوەدوورگەی عەرەبییە، موشریکەکانی تری جیهان هەموو جزیەیان لێ وەردەگیرێت، بە ڕای زانایان وەکو مالیک و ئەوزاعی و شافعی و حەنەفی و زانایانی تری شام.

پێغەمبەری خوا ﷺ جزیەی لە مەجوس وەرگرتووە کە موشریک بوون، هەر بۆیە (ابن قیم) دەڵێت ئەمەش بەسەر هەموو موشریکێکدا دەسەپێت کە جزیە بدات، بێجگە لە نەجد و ئەوانەی دەڵێن بۆ شاری مەککەیە لە ڕاستیدا شاری مەککە هەموو موسڵمان بوون ئیتر بۆچی ئەو ئایەتانە بۆ ئەوان دادەبەزێت!



دووەم: لەوانەیە هەندێک بڵێن ئەم ئەحکامە لەگەڵ ئەو ئایەتەدا یەک ناگرێتەوە کە دەفەرموێت:

﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...﴾ [البقرة]

واتە: دین بە زۆر بەسەر خەڵکیدا نادرێت

ئەم حوکمە کە لەم ئایەتەدا هەیە بۆ هەموو مرۆڤی سەرزەوییە، جگە لە موشریکی عەرەب کە جەنگیان دژی موسڵمانان ئەنجامداوە، نەک لەبەر ئەوەی عەرەبن نا بەڵکو بە درێژایی ٢٠ساڵ جەنگیان دژی ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ کردووە، ئەوان داوای ئاشتیان نەکردووە بەڵکو شکستیان خواردووە لە جەنگدا، بە واتای ئەوەی تا ئێستاش جەنگ بەردەوامە، ئەگەر موسڵمان بوون ئەوا ژیان و سەر وماڵیان وەکو باقی خەڵکی ترە و ئازادن، یان فەرموون با جەنگ بکەین.

لە ڕاستیدا ئەم داوایەی موسڵمانان داوایەکی زۆر بە ڕەحمانەیە (بە بەزەییە)، خۆ ئەمەش داوایەکی دنیایی نییە، ئەگەر موسڵمانان لەبەر پارە و سەروەت و و سامان بۆ خۆیان و دەوڵەتەکەیان بجەنگن، ئەوا لە ڕووی ئەقڵ و مەنطیقەوە لە سوودیان نییە موشریک موسڵمان نابێت، چونکە غەنیمەت و دەستکەوت زۆر لەدەست ئەدەن، بەڵام جەنگ لە ئیسلامدا چەتەیی و پراغماتیکی و سەرمایەداری نییە، جەنگ لە پێناوی خۆشگوزەرانی خەڵکە لە دونیا و قیامەتدا، خۆ ئەگەر موسڵمان بوون دەبێت دەوڵەتی ئیسلامی هاوکارییان بکات بۆ ڕاکێشانی دڵیان و جێگیرکردنیان لەسەر ئیسلامەتی و ئیمان و خواناسی، ئەمەش مانای لێخۆشبوونی دەوڵەتی ئیسلامییە کە قەڵەمڕەویی هەموو ناوچەی نیوەدوورگەی عەرەبی لە ژێر ڕکێفی دایە.

سێیەم: دیسان لەوانەیە کەسێک بپرسێت، ئەی بۆچی جزیە لە موشریکی عەرەب وەرناگیرێت وەکو هەموو موشریکەکانی جیهان؟!

لە وەڵامدا دەڵێم: لێیان قبوڵ ناکرێت، چونکە لە بنەڕەتدا ئەوان دەبێت بکوژرێن، خاوەنی مێژووی ٢١ ساڵ جەنگ و دەربەدەرکردنی موسڵمانانن لە ڕووی شەرعییەوە دەبێت بکوژرێن، چونکە هەموو بۆ کوشتنی موسڵمانان ئامادە بوون و درێخییان نەکردووە، نەچوونیان بۆ مەرگ موسڵمانبوونیانە، ئەمە خۆی مانای گەورەیی ئیسلامە واتا دەسەڵاتی تەواوی هەیە بکوژێت،



بەڵام لێتخۆشدەبێت بە مەرجێک موسڵمان بیت، هەر لەبەر ئەوەیە ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرمووێت: لە عەرەب قبوڵ ناکرێت یان ئیسلام بوون یان شمشێر.

پرسیارێکی تر دێتە ئاراوە، باشە بۆ ئەم هاوکێشە تەنها بۆ نیوەدوورگەی عەرەبییە و لە جیهاندا پیادە ناکرێت؟!

لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئیرادە و ویستی وایە لەو جێگایەدا جگە لە مەنهەجی ئیسلامی هیچ جۆرە مەنهەج و ئایینێکی تری تێدا نەمێنێت، بۆ ئەوەی ئەو جێگایە تایبەت بێت بە موسڵمان و ئیسلام، هەر وەکو لە دنیادا چۆن جێگا هەیە تایبەت بە مەسیحییەکان، نموونەی ڤاتیکان و بوذییەکان لە ناوچەی (تبت)...هتد.

هەر لەبەر ئەوەیە ئەو ناوچەیە دەبێت پاک بێت لە هەموو بیروبۆچونێک لە تێکەڵاوی بیروباوڕی موسڵمانان لە هەموو جیهاندا، بە پاکی بیروباوڕی ئیسلامی ڕابگرێت.

زانراویشە زۆر جار وڵاتانی دونیا لە ڕێگای داگیرکردنی دانیشتوان دەتوانن دیموگرافی بگۆڕن، وەکو نموونەی تەعریب، یان بە تورک کردنیان و بە فارس کردنیان، یاخود وەکو ئیسرائیل لە هەموو دونیاوە جوولەکەی بانگ کرد بۆ وڵاتی فەلەستین تا توانی دیموگرافییەکەی بگۆڕێت، نموونەی ئەندەلوس هەموو خەڵکەکەی ڕاوەدوونرا و کوژران، خەڵکی ئیسپانی خرایە جێگا...هتد نموونەی تر زۆرن وەکو ئەمریکا و ئوسترالیا و کەنەدا ...هتد.

ئەم پاکتاوییە لە ئیسلامدا پەیوەندی نییە بە ڕەگەزی مرۆڤەوە، بەڵکو پەیوەندی بە بیروباوڕەوە هەیە، تەشریعی ئیسلامی وادەخوازێت ئەو جێگایە بێجگە لە موسڵمان هیچ جۆرە ئایینێکی تری تێدا نەبێت، تاکە هۆکاریش بە پاک ڕاگرتنی بیروباوڕی ئیسلامییە لە هەموو شیرک و بیدعە و کاری خراپ و زۆر شت، دەستکاریکردن و گۆڕینی...هتد.

بۆ نموونە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنانەت ڕازی نەبوو بە مانەوەی یەهود و نەسارا لە ناوچەکە و بۆیە دەستی کرد لە دوای ئەوەی موسڵمانان توانای ئیدارەی ناوچەکەیان هەبوو دەبێت هەردووک ئایینە ئاسمانییەکان ئەوانیش لە ناوچەکە دوور بخرێنەوە، بۆیە



پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: دەبێت یەهوود و نەسارا دەربکرێن لە نیوەدوورگەی عەرەبدا. [٧٧]

هەموو هەریەک واتای هەیە واتە لە ناو ئەوخاکەدا نابێت هیچ جۆرە بیروباوەڕێکی تر بوونی بمێنێت.

چوارەم: لەوانەیە پرسیارێکی تر بکرێت بڵێین ئیسلام خەڵکی ناوچەی نیوەدوورگەی عەرەبی مەحروم کرد لە بیروباوەڕی ئازاد و ئازادی ڕادەربڕین؟

لە ڕاستیدا ئیسلام ڕای ئازادی قەدەغە نەکرد بەڵکو بتپەرستی قەدەغە کرد، بتپەرستی و وەسەنیەت و بیروباوەڕ نییە، بەڵکو جاهیلیەت و خورافیاتە، ئیسلام هۆکاری دروستبوونی ئیجتیهاد و ڕاوبۆچوونە، زانایان مەزهەب و قوتابخانەی فیکریان دروست کردووە بە درێژایی مێژوو.

بە پێچەوانەوە ئەگەر بە چاوی زانستی و واقیعی ئەمڕۆ تەماشا بکەین، ئیسلام خەڵکی فێری شارستانیەت و ژیان و پێشکەوتن دەکات.

بێجگە لەوەی خەڵکێکی نەخوێندەوار و جاهیل لە ژێر سفرە بۆ گۆڕانکاری لە هەموو جیهاندا، زۆر جار کۆمەڵگەکان توانای ئەوەیان نییە بزانن چی چاکە و چی خراپە، پێویستیان بە فریادڕەسێک هەیە تا گۆڕانکاری پێبکات، ئەوەی ئەوانی دواخستووە جاهیلیەت و بتپەرستی بوو، نەک ئازادی ڕادەربڕین، بەڵکو ئیسلام بە لەناوبردنی بت و جەهالەت ئەوانی کردە پێشەنگ لە جیهاندا، بەڵکو گەلانی تریش بە ئیسلامەوە عەزیز و سەربەرز بوون.

ئیتر بۆ لۆمەی ئیسلام دەکەن، ئێستا ئەوەی لە جیهاندا دیموکراسی نەبێت، یان دەڵێن ئیرهابییە، یان وەکو کۆمەنیستەکانی ئیتاڵیا زیندانی دەکرێن...هتد.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٧] ـ (لِأَنْ عِشْتُ إِنْ شَاءَ اَللَّهُ لَأُخْرِجَنَ اَلْيَهُودُ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ اَلْعَرَبِ).



پێنجەم: ئەم یاسای لە ناوبردنی بتپەرستی جاهیلییە تەنها و تەنها تایبەت بوو بە نیوەدوورگەی عەرەبی، هیچ پەیوەندی نەبوو بە جیهانی ئیسلامی وەکو عێراق و کوردستان و ئێران و شام و لە شەرقەوە بۆ غەرب.

بەڵکو خاوەنی ئایینەکانی تر هەموو بە ئازادی خۆیان خواپەرستیان دەکرد لە نەسرانی و یەهوود و زەردەشت و صائیبی و بوزی، هەزارەها جۆری تری بتپەرستی لە نیوە کیشوەری هیندی دا لەسەر بنەمای ئایەتی (لَكُمْ دِينُكُم وَلِي دِين)

ئەوە واقعی مێژووی دینی ئیسلامە، کە لە هەموو قۆناغێکدا پیادە دەکرێت.

شەشەم: هەروەها ئەو یاسا و تەشریعە ئەوەی قەدەغە نەکرد کە ناتوانرێت موشریک و بێدین و ئەهلی کیتاب بێنە ناو جەزیرەی عەرەبی بۆ بازرگانی و نوێنەرایەتی، تەنها مەککە و مەدینە لەوان قەدەغە کراوە، چونکە ئەو دوو جێگایە پاکە و کافر و موشریکییش پیسن، نەک لە ڕووی ڕووکەش، بەڵکو لە ڕووی بیروباوەڕەوە تەنها ئیماندار دەچێتە ناوی، مانای وانییە کە ئەگەر کەسێکی بێدین، چووە ناوی ئەوا ئیسلام هەڵوەشاوەتەوە، نا بەو مانایەی ئەگەر موسڵمانان، بزانن ڕێگری لەو کەسانە دەکەن بۆ ئەو دووشارە، بەڵام بۆ جێگاکانی تر پێویستە ڕێزیان بگیرێت و مافیان پارێزراو بێت و ئەمن و ئاساییشیان پارێزراو بێت، ئەمەش جەوهەری ئیسلامە.

حەوتەم: ئاشکرابوونی ئایینەکان و دانانی ماوە و ئاگادارکردنەوەی خەڵکی و ئەوپەڕی ژیان و شارستانییەتە، کە ئەهلی سەر ئەم زەوییە هیچی نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە، بەڵکو کاتژمێری سفر بۆ دژایەتی یەکتری دادەنێن و تا یەکتر بسڕنەوە لەسەر زەویدا، بەم شێوەیە نەغەدر کرا نەخیانەت و نەخوێن ڕژا، بەڵکو بەئاگادارییەک هەل و چانس و کات زۆر درا بەخەڵک، ئەگەر جەنگ ئەکەن ئەتوانن خۆیان ئامادە بکەن، ئەگەر بیردەکەنەوە بەهەمان شێوە کات زۆرە بۆ بیرکردنەوە.

جەنگی ئیسلام ڕەحمەتە، خیانەتکار و ناحەزانە جەنگ ناکەن چونکە پیاوی ئازا و پێغەمبەر ﷺ یاسای بۆ داناوە لە لایەن خواوە بە وەحی ئاڕاستە کراوە، هەموو لەسەر بنەمای ڕەحمەتە.



بەڵام جەنگی ئەوانە کە بانگەشەی مافی مرۆڤ و دیموکراسی دەکەن، هەموو گیانیان خیانەتە، شکاندنی پەیمان و عەهدە، خەنجەردانە لە پشت، تەماشای ئیتاڵیا بکەن چی خیانەتی کرد لە لیبیا و عومەر موختار و لەئەثیوبیا و سۆماڵ.

هەروەها ئینگلیز، خیانەت کاربوو لە بەرامبەر کورد و فەڵەستین و شام و عێراق و هیندستان، بەرامبەر بە چین جەنگی ئەفیون، پاشان فەڕەنسا بەرامبەر بە کوشتنی یەک ملیۆن خەڵکی سڤیل و لە جەزائیر و سووریا و وڵاتانی ئەفریقا بەگشتی، یان خیانەت و غەدری یەهوود بۆ فەڵەستین، یاخود هیند بەرامبەر بە کشمیر، یان عەلمانی ئێرانی شیعەنشین و تورکیای ئەتاتورکی و سووریای بەعسی بەرامبەر بە گەلی کورد، یان ڕووسیا بەرانبەر بە چیچان و داغستان و تەتەرستان...هتد.

ئایا ئەمانە دەبیندرێت لە ناو شارستانییەتی ئیسلامی و قوتابخانەکانیدا؟!

لە دونیادا کام دەوڵەت کات ئەدات بە دوژمنەکەی دەڵێت خۆت ئامادە بکە بۆ جەنگ و هەل و ماوەی ئەداتێ!؟

کام دەوڵەت لەم جیهانەدا کە پەیمانێک بپچڕێنێت و ئاگاداری بکاتەوە ماوەی بداتی خۆی ئامادە بکات بۆ جەنگ؟!

خوای گەورە فێرمان دەکات خیانەت لە کافریش نەکەین:

﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾ [الأنفال]

واتە: خۆ ئەگەر بێگومان ترسایت لە دەستەیەک (کە پەیمانت لەگەڵدا بەستوون) پەیمانەکە هەڵوەشێننەوە و خیانەتت لێ بکەن ئەوە تۆیش لەم کاتەدا پەیمانەکە بدەرەوە بەڕوویاندا بەشێوەیەکی ڕێک و ڕاست، (پێیان بڵێ کە) پەیمانەکەیان نرخی نەماوە، چونکە بەڕاستی خوا کەسانی پەیمان شکێن و ناپاکی خۆش ناوێت.

ئەمە تەنها و تەنها لە یاسا و ڕێسای ئیسلامیدا هەیە لە هیچ وڵاتێک لە کۆن و نوێدا و لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکوور و باشووریش شتی وانییە و دەست ناکەوێت، تا ئەم چرکە ساتەی لەگەڵتاندا دەدوێم لەم زیندانی طاغوت و نەساراکانەوە.



ئەوەش دادپەروەردی ئیسلام و ڕاستی و حەقی لەم ئایینەیە.

هەشتەم: جیاوازی لە نێوان ماوەکاندا ئەوانەی کە هیچ ماوەیەک پەیمانیان لەگەڵ موسڵمانان نەبوو، ڕۆژیان دەنێ، ئەوانەشی کە پەیمانیان هەبوو پەیمانەکەی خۆیان و چوار مانگ زیاتر چووە سەر پەیماننامەککە، دەبێت هەموو کۆتایی پێبێت لە مانگی (ذي الحجة) ساڵی ٩ کۆچی، بەڵام ئەوانەی کە پەیماننامەیان هەبوو ئەوانە بۆیان زیاد دەکرێت.

هەروەکو ئاماژەم پێدا ئەوانەی هیچ پەیمانێک لەگەڵیاندا نییە تەنها ٥٠ ڕۆژ ماوە، خوای گەروە دەفەرمووێت:

﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾﴾

واتە: جا کاتێک مانگە حەرامەکان بەسەرچوون (کە بریتیە لە: ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم، رجب) ئەوە هاوەڵگەرانی پەیمان شکێن بکوژن لەهەر کوێ دەستان لێیان گیر بوو، یاخود بەدیل بیانگرن، سنوور دانێن بۆ چالاکییان، هەروەها کەمین و بۆسەیان لە هەموو شوێنێکی لەباردا بۆ دانێن، جا ئەگەر (پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ) تەوبەیان کرد و وازیان هێنا لەو کارەیان و نوێژیان کرد و زەکاتیان دا، ئەوە وازیان لێبهێنن و ڕێیان بۆ چۆڵ بکەن، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و دلۆڤانە (ئەگەر ڕاست بکەن، خۆ ئەگەر بە ڕاستیشیان نەبێت ئێوە حسابی ڕواڵەت بکەن).

ناوچەکان بە گشتی هەموو موسڵمان بوون.

ئەوانەش کە دوور بوون پێغەمبەری خوا ﷺ چەند سریە و سوپای بۆ ڕێکخستن هەموو موسڵمان بوون.

نۆیەم: لە هەموو سەرنج ڕاکێشتر، ئەگەر کۆمەڵێک هاتن داوایان کرد لە ئیسلام فێربن، دەبێت قورئانیان بۆ باسبکرێت و بۆیان بخوێنرێتەوە، باسی ورد و درشتی ئیسلامیان بۆ بکرێت، ئەگەر موسڵمان بوون ئەوا باشە، ئەگەریش موسڵمان نەبوون، وتیان جەنگ دەکەین، موسڵمانان



دەبێت دالّدەیان بدەن تا دەیانگەیەنەوە جێگای خۆیان و یان ئەو کۆمەڵەی بڕیاری جەنگیان داوە، ئەوان دەبێت ئاسایشیان پارێزراو بێت لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ [التوبة]

واتە: خۆ ئەگەر کەسێک لە هاوەڵگەران داوای پەنای لێ کردیت (ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار)، ئەوە تۆیش پەنای بدە هەتا گوێی لە فەرموودەکەی خوا (قورئان) دەبێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت و (ماڵ و گیان و ژیانی) تیایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانییە لەبەر ئەوەیە ئەوانە کەسانێکن نازانن (خواناسی چییە).

ئاخر لە کام یاسا و دەوڵەتێکدا هەیە کە دەوڵەتی دوژمن داوای ئەوە بکات لە دینەکەت بکۆڵێتەوە و ئەمن و ئاسایشی بپارێزیت، ئەگەر ڕازیش نەبوو لەسەرت واجب دەبێت بیگەڕێنیتەوە بۆ ئەو سەنگەرەی کە دوژمنەکەت جەنگت لەگەڵدا دەکات!

لە ڕاستی دا ئەگەر تەماشای واقیعی سەرزەوی بکەین، دەبینین ڕاقیترین و بەرزترین و بە ڕەوشترین یاسا و تەشریع لە ناو ئیسلامدایە، لە هیچ یاسا و ڕێسایەکی تردا دەست ناکەوێت.

دەیەم: خوای پەروەردگار لەو بەرائەتەی کە دایبەزاند، بەو پەڕی هێز و تواناوە کە موسڵمانان دەبێت جەنگ بکەن، بەڵام جەنگ کردن لە ئیسلامدا بۆ بەدەست هێنانی سەروەت و سامان نییە، یان بۆ فراوان کردنی خاک و وەرگرتنی زەوی و باج نییە، یان بۆ خەزێنەی خاوەندارێتی و دەسەڵات و پاشا و ئیمپراتۆریەت نییە بەڵکو ئامانجی سەرەکی بانگەوازی ئیمانە بۆ خوای پەروەردگار، ئەگەر ئیمان لای هەرکەس و هۆز و گەل و وڵاتێک دروست بوو، خێرا جەنگ کۆتایی دێت یاخود ئۆتۆماتیکی دوژمنەکەت دەبێت بەیەکێک لە خودی خۆت، هیچ جیاوازی نابێت.

لە ڕووی ئازایەتی و عەزم و جەنگەوە قورئان زۆر بە توندی هانی موسڵمانان دەدات بۆ جەنگی موشریکەکان، بەڵام ئەگەر ڕاستەوخۆ هات ئیمانی هێنا، ڕێک موسڵمانان دوژمانیەتی



چەند ساڵە خێرا لەبیر دەکەن و لە یلدگە (میمۆری) مێشکیاندا دەیسڕنەوە، لە بیریان دەچێتەوە پیلان و شەڕەنگێزی...هتد.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝﴾ [التوبة]

واتە: جا کاتێک مانگە حەرامەکان بەسەرچوون (کە بریتیە لە: ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم، رجب) ئەوە هاوەڵگەرانی پەیمان شکێن بکوژن لەهەر کوێ دەستان لێیان گیر بوو، یاخود بەدیل بیانگرن، سنوور دانێن بۆ چالاکیان، هەروەها کەمین و بۆسەیان لە هەموو شوێنێکی لەباردا بۆ دانێن، جا ئەگەر (پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ) تەوبەیان کردو وازیان هێنا لەو کارەیان و نوێژیان کرد و زەکاتیاندا، ئەوە وازیان لێبهێنن و ڕێیان بۆ چۆڵ بکەن، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو دلۆڤانە (ئەگەر ڕاست بکەن، خۆ ئەگەر بە ڕاستیشیان نەبێت ئێوە حسابی ڕواڵەت بکەن).

تەنانەت لە جەنگی موشریکدا کەسایەتی و ڕەحم و پەیمان و عورفیان لا گرنگ نییە ژیانیان لەسەر زوڵم و دەستدرێژی بونیات ناوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَا يَرۡقُبُونَ فِي مُؤۡمِنٍ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُعۡتَدُونَ ۝﴾ [التوبة]

واتە: ئەوانە دەربارەی هیچ ئیماندارێک سنووری خزمایەتی و پەیمان ڕەچاو ناکەن و ناپارێزن، هەر ئا ئەوانەشن دەستدرێژکارن.

لەگەڵ ئەو هەموو کردارەیاندا و مێژووی ڕەشیاندا ئەم ئایەتە چەند بە ڕەحم دەبێت لەگەڵیاندا و دەفەرمووێت:



﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ وَنُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾ [التوبة]

واتە: جا ئەگەر تەوبە بکەن و پەشیمانی دەربڕن و نوێژەکانیان ئەنجام بدەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەرکەن، ئەوە برای دینی ئێوەن، ئێمەیش ئایەت و فەرمانەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ کەسانێک کە دەیزانن.

لەگەڵ مێژووی پڕخیانەت و هەوڵی بەردەوامی دوژمنکارانە، خێرا بزووتنەوەیەکی گۆڕانکاری دروست دەبێت، بە موسڵمان بوونیان، بۆ برا بوونیان و ئەمە مەنهەجی ڕەحمەت و پڕ بەرەکەتی ئیسلامە.

بەم دە خاڵە زیاتر ئەوەی گومانی گوماندااران بوو تا ڕادەیەک وەڵامدرانەوە.



# هاتنی نوێنەری سەقیف بۆ مەدینە

ماکوان: سەقیف زانیان چواردەوریان بە موسڵمانان دەورە دراوە، هەوازن گەمارۆی داون لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە هەمووی گرنگتر موسڵمانبوونی (عروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی) بوو، یەکێک بوو لە پیاوە گەورەکانی عەرەب، لە قورئاندا خوای گەورە لەسەر زمانی قوڕەیش باسی کردووە، کاتێک لە پەیمانی حودەیبیەدا قوڕەیش ناردی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وەکو وەفدی دانوستان، ئەو وەفدە زۆر سەرسام بوون بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە قوڕەیش و وتی: کە چووەتە دیوانی کیسرا و ڕۆم و پادشایان، ئەوەندەی هاوەڵەکانی محمد هیچ کەسم نەدیوە ئەوەندە ڕێز لە گەورەکانیان بگرن، بۆیە ئەو لە دوای گەڕانەوەی لە طائیف هات موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، پاشان پێغەمبەری ﷺ ناردییەوە بۆ ناو سەقیف کە بانگەوازیان بکات، کاتێک گەڕایەوە طائیف بانگی کردن بۆ ئیسلامەتی، بەڵام سەقیف تیربارانیان کرد و سەرۆکەکەی خۆیان بە تیرباران کوشت.

لە کۆتاییدا و لەساڵی ٩ کۆچیدا بۆیان دەرکەت، کە توانایان نییە چیتر بەرگری بکەن بۆیە ناچار شاندێکیان پێکهێنا و کە بریتی بوون لە ٦ کەس، بە سەرۆکی گەورەی طائیف (عەبد یالیل کوڕی عەمر) کە هۆزی بەنو ئوممەیەیان کردە نێوەندگیر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دانیشتن و ئەمانیان پێبەخشین.

پێغەمبەری خوا ﷺ هیوا و ئاواتی ئەوەبوو سەقیف موسڵمان بێت، بە ئەندازەیەک هاوەڵان کە زانیان وەفدی سەقیف هاتووە پەلەیان بوو بۆئەوەی زوو موژدە بدەنە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێشبڕکێ کەوتە نێوان موغیرە و ئەبوبەکر کە زوو هەواڵەکە بگەیەنە پێغەمبەر ﷺ لە کۆتاییدا موغیرە موژدەکەی وازلێهێنا بۆ ئەبوبەکر، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر خۆشحاڵبوو بە هاتنی وەفدەکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو مزگەوتەکەی خۆیدا دەواری بۆ هەڵدان و ڕێز و حورمەتی گرتن و بەخێرهاتنی کردن، تەنانەت خودی مێواندارییەکەیان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺبوو، هەموو ڕۆژێک بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیشتن.



پێوەرێک! کاتێک پێغەمبەر ﷺ چووە ناوماڵیان و داوای داڵدەدانی کرد کەچی ئەوان بەردبارانیان کرد بە جنێو و قسەی ناشرین دەریان کردە دەرەوە، سەر و قاچی موبارەکی خوێناوی کرا و زەیدی کوڕی حارث بریندار بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لەوپەڕی دەسەڵات و هێزدایە و سەقیف زەلیل و زەبوونە، کەچی ڕێزیان دەگرێت، چونکە پێغەمبەرەکەمان خۆی بەڕێزە و ڕەوشتی بەرز و هەموو کردار و گوفتاری لایەقی پێغەمبەرێتییە.

سەرۆکی کاروانەکەی سەقیف ناوی (عوسمانی کوڕی ئەبی عاص) بوو، گەنجێکی بە ڕێز و حەزی بە وەرگرتنی زانست بوو، خۆی جیاکردەوە لە سەرۆکی وەفدەکەیان کەناوی عەبد یالیل بوو، زیاتر گرنگی ئەدا بە وەرگرتنی قورئان و لە یەکەم ڕۆژەوە موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، بە ئەندازەیەک پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سەرسام بوو، پرسیاری زۆری دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر پێغەمبەری دەستنەکەوتایە دەڕۆیشتە لای هاوەڵەکانی جارێک ئیمامی ئەبوبەکر خەوتبوو بە پێوە وەستا تا لە خەو هەڵسا و پرسیاری لێکرد، پاشان ئەو ئیسلامەتی و خواناسییەی لە وەفدەکەی خۆی شاردەوە، هەرکات پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ بکردایە بە ئەدەبەوە بە پێوە دەوەستا و پرسیاری دەکرد، ڕەنگە هەر ئەو هۆکارە بووبێت سەرەنجی پێغەمبەری ﷺ بۆ لای خۆی ڕاکێشا بێت.

بۆ ماوەی ٢٥ ڕۆژ لە خزمەت پێغەمبەردا مانەوە، بانگەواز دەکران بۆ ئیسلام، پاشان لە ڕۆژەکانی کۆتاییدا عەبد یالیل وتی: ئایا تۆ پارێزەرمان دەبیت، تا دەگەڕێینەوە ناو کەسوکار و هۆزەکەمان؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ من پارێزەرتان دەبم بەو مەرجەی بڕیاری ئیسلامەتی بدەن، ئەو کات منیش بڕیاری پاراستنتان ئەدەم، ئەگەر وانەبێت هیچ سوڵح و پەیمانێک لە نێوانمان دا نییە.

ئینجا عەبد یالیل وتی: ئەی ئەگەر زینا بکەین؟ چونکە هۆزی ئێمە بۆ بازرگانی دوور دەڕۆین و هەر دەبێت ئەو کارە ئەنجام بدەین، ئێمە ناتوانین ئارام بگرین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حەرام و قەدەغە کراوە لەلایەن خواوە بۆ موسڵمانان، ئینجا ئایەتی بۆ خوێندنەوە



﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ٣٢﴾ [الإسراء]

واتە: هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهو تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە.

ئینجا عەبد یالیل وتی: ئەی ئەگەر ڕیبامان خوارد (ڕیبا حەرامە)، ئێمە هەموو سەروەتەکەمان بریتییە لە ڕیبا؟!

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ فەرمووی: دەست بگرن بە سەرمایەکەتانەوە، ڕیبا حەرامە و خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٢٧٨﴾ [البقرة]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزکارو خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن.

پاشان عەبد یالیل وتی: ئەی دەربارەی شەراب و مەی، چونکە ئەوەمان هەردەبێت هەبێت بێ شەراب ناژین و شەربەتی ترێ و ڕەزەکانمانە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ فەرمووی: خوای گەورە حەرامی کردووە..

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾ [المائدة]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەق و قومار و گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی کە خەڵک بەپیرۆزی داناوە نەک ئیسلام، بورج حەرام و حەڵاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەرپیسن و لەکاروکردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بهێنن (لە هەردوو جیهاندا).

لە دوای تەواو بوونی قسەکانیان وەفدەکەی سەقیف هەڵسان و بەیەکەوە کۆبوونەوە.



عەبد یالیل وتی: بەتەماین بڕۆینەوە بۆ شاری طائیف و بڵێین محمد ئەو سێ شتەی لێ قەدەغە کردووین، سوێند بەخوا خەڵکی ئێمە ئارامگر نین لەسەر شەراب و زینا و ڕیبا! دەبێت هەر هەیانبێت.

پاشان یەکێک لە ناو وەفدەکە کە ناوی (ئەبو سوفیانی کوڕی عەبدوڵا) بوو وتی: تۆ بۆ وا پەشۆکاوی ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت و خێری بۆ ئێمە بوێت خەڵکی ئارامگر دەبێت لەسەری، تەماشا بکەن ئەوانەی ئێستا لەگەڵ محمد دان هەموو پێشتر زیناکەر و شەراب خۆر بوون خوای گەورە هیدایەتی داون!

سوێند بەخوا ئەم پیاوە (مەبەستی پێغەمبەر) بوو هەموو زەوی خستۆتە ژێر دەستی چواردەورمان گیراوە، خۆ ئەگەر هاتوو ئەمجارە جەنگمان لەگەڵدا بکات بەشی دانگێک ناکەین، هەموو دەمرین لە برساندا جا باشترە موسڵمان ببین و لەو ڕێگایە زیاترمان نییە و با وەکو شاری مەککەمان لێنەکەن (واتا فەتحی بکەن).

ئەو کەسەی کە کتێب و نووسینی لە نێوان پێغەمبەر و وەفدەکەی دەنووسی ناوی (خالیدی کوڕی سەعدی کوڕی عاص) بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێگای ئەوەوە خواردنی بۆ دەناردن، نەیاندەخوارد هەتا وەکو پێغەمبەر لە خواردنەکەی نەخواردایە تا ئەو کاتەی موسڵمان بوون، دەترسان چونکە خۆیان خیانەتکاربوون و بیریان لای خیانەت بوو وایاندەزانی موسڵمانانیش وەکو موشریکن!

بەهەرحاڵ کۆتا وەرەقەی خۆیان خستە ڕوو بریتیی بوو لە دوو داواکاری تر، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەهیچ ڕازی نەبوو، داوای یەکەم بریتیی بوو لە: نەڕووخاندنی بتی (ڕەببە)، عەبد یالیل وتی چۆن دەتوانین بیڕوخێنین و دەترسین شتێکمان لێ بێت؟!

ئیمامی عومەر کوڕی خەطاب فەرمووی: ئەی ماڵوێران ئەوە تەنها بەردێکە و هیچی تر.

عبد یالیل وتی: عومەر ئێمە نەهاتووین لای تۆ موسڵمان بین، داوا لە پێغەمبەر دەکەین، با سێ ساڵ مۆڵەتمان بدات، پێغەمبەر ڕازی نەبوو، داوای دوو ساڵی کرد پێغەمبەر هەر ڕازی نەبوو، یەک ساڵ نا یەک مانگ، بە هیچ ڕازی نەبوو پێغەمبەر ﷺ لە کۆتاییدا عەبد یالیل



وتی: تۆ وەفدێکمان لەگەڵ بنێرە بۆ ڕووخاندنی بتەکەمان نەکا خراپ بەسەر ماڵ و منداڵ و کەسوکارمان دا بهێنێت!

پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە ڕازی بوو، مەفرەزەیەکی نارد بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید، ئەوانەی کە لەو مەفرەزەیە دابوون، ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و شوعبەی کوڕی موغیرە و چەندین هاوەڵی بەڕێزی تر.

پاشان داواکاری کۆتاییان ئەوەبوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ عەفویان بکات لە نوێژکردن، توانای نوێژکردنیان نییە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (دینێک ئەگەر نوێژی تێدا نەبێت کەی دینە و خێری لە کوێدایە؟)

داواکارییان زۆر بوو لەسەر ئەوەی لە حەڵاڵیان بۆ حەرام بکرێت، بە پێچەوانەوە حەرامیان بۆ حەڵاڵ بکرێت، وەکو زینا و شەراب و ڕیبا، بەڵام لە کۆتاییدا ملکەچ بوون بۆ فەرمانی ئیسلام و پێغەمبەری خوا.

لەکاتی ڕووخاندنی بتی ڕەببەدا، موغیرەی کوڕی شوعبە پیاوێکی قسەخۆش حەزی بە گاڵتە و گەپ بوو، بە هاوەڵانی فەرموو حەزدەکەن تۆزێک بتانخەمە پێکەنین تۆزێک بە سەقیف پێبکەنین؟!

ئەو ڕۆژەی کە سوپاکەی خالید گەیشتە طائیف هەموو خەڵکی ئەوشارە لە دەوری ئەو بتەدا کۆبوونەوە، موغیرە یەکەم تەشوێی وەشاند، بە گاڵتەوە هاواری کرد و ڕایکرد!

خەڵکی طائیف هەموو دڵیان خۆش بوو، وتیان ڕەببە بەرگری لە خۆی دەکات پاشان خەڵکی طائیف چوون بۆ لای سوپاکەی خالید وتیان دەی ئەگەر ڕاست دەکەن نزیک ببنەوە لە ڕەببە هەمووتان دەکوژێت، سوێند بەخوا ناتوانن تێکی بدەن؟!

موغیرە بە پێکەنینەوە گەڕایەوە وتی: ئەحمەقترین هۆز ئێوەن من گاڵتەم پێکردن، بتەکەیان تێکوپێک شکاند و ئینجا سەقیف باوەڕی کرد کە چەندین ساڵە لە جەهالەت و سەرلێشێواویدا بوون.



بەمەش کۆتایی هات بە لەناوچوونی هەموو بتە طاغوتەکان و پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو زیو و ئاڵتوونەی بۆ بتەکە دانرابوو هەمووی بەخشییە سوپاکەی خالیدی کوڕی وەلید.

لە کۆتاییدا بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ عوسمانی کوڕی سەعید کوڕی عاصی کردە ئەمیر و لێپرسراوی شاری طائیف، فەرمانی پێکرد کە مزگەوتێک لە جێگای بتی ڕەببە دروست بکات، بەڕاستی و پاکی خواناسی و بەندایەتی بکەن بەمەش کۆتاییهات بە کێشەی طائیف، طائیف موسڵمان بوون و تەنانەت خۆشەویستییان بۆ ئیسلام لە هەموو ناوچەکانی تر بەهێزتر بوو.



## تووڕەبوونی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە خێزانەکانی

**ماکوان: لە دوای ئەوەی کە هەموو نیوەدوورگەی کەوتە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، لە هەموو لاکانەوە سەروەت و سامان دەهات بۆ موسڵمانان، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بیلالی حەبەشی کردبووە وەزیری ئابووری و چاودێری ماڵی دەوڵەت، خەڵکی بەگشتی کەوتبوونە خۆشی و شادی بازرگانی و ئابووری و ئەمن و ئاسایش لە ناوچەکەدا بەرقەرار بوو، زۆربەی خەڵکی پێداویستی نەمابوو، هەژارترین کەس لەناو دەوڵەتەکەدا ماڵی پێغەمبەری نازدار بوو!**

**پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوجەی لەسەر خومس بوو کە هەموو خەڵک موسڵمان بوون و جیهاد کۆتاییهات لەو ماوەیەدا، پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خاوەن سەروەت نەبوو، ڕاستە دەوڵەت دەوڵەمەند بوو، بەڵام خودی سەرۆکی دەوڵەت وەکو هەموو کەسێکی تر دەژیا.**

**خێزانەکانی زۆر داوای نەفەقە و پارە و خەرجییان لە پێغەمبەر دەکرد، وایان کرد کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر تووڕە بکەن، ئەویش سوێندی خوارد ماوەی یەک مانگ نەچووە لای خێزانە بەڕێزەکانی.**

**لە دوای ئەو ماوەیە خوای گەورە ئایەتی بۆ دابەزاند کە هەڵبژاردەی دایە، کە دەتوانێت خێزانەکانی طەڵاق بدات، ئەوانەی کە حەزیان بە ژیانی دونیایە، هەروەها ئازادە لە هێشتنەوەیان، خوای گەورە دەفەرمووێت:**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ۝ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ۝﴾ [الأحزاب]

**واتە: ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دنیا و ڕازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارە و سامانتان پێ ببەخشم لەوەودوا بە جوانترین شێوە دەستبەرداتان ببم، خۆ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی قیامەتان دەوێت،**



ئەوە دڵنیا بن کە خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێ ئەندازەی ئامادەکردووە (پێغەمبەر هەموو هاوسەرانی یەك یەك تاقی کردەوە هەموانیان خوا و پێغەمبەر و پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد).

کە ئەو ئایەتە دابەزی ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر چوونە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم زۆر خەمبار بوو، لەبەر ئەوەی دەیویست خێزانەکانی لەوە تێبگەن کە ئەم پێغەمبەرە و سەرۆکی وڵاتی دنیایی و پادشا و ئیمپراتۆر نییە، ماڵی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەمووی ژوورێکی بچووک بوو بە تەنیشت مزگەوتەکەوە، ماڵی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هیچ چرا و ڕۆشنایی تێدا نەبوو، ماڵەکەی لە قوڕ دروست کرابوو، سەقف و بنمیچی هەموو گەڵای داری خورما بوو، جێگای خەوی حەسیری قەڕەم بوو، جێگای گەرم و نەرمی نەبوو، تەنانەت لە کاتی نوێژکردنی سونەتیدا زۆر جار چاوی نەیدەبینی بەقاچی بەخێزانەکانی دەکەوت ژوورەکانی زۆر بچووک بوو، کە لەخەو هەڵدەستا ڕوومەتی موبارەکی خۆڵی سەرزەوی بوو سەرینی نەبوو.

ئەو ڕۆژەی کە ئایەت دابەزی هەموو خێزانەکانی لە دەوری کۆبوونەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بە بێدەنگی دانیشتبوو ، ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر کە هاتن زانییان پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم خەمبارە ئیمامی ئەبوبەکر وتی: ئێستا دەیخەمە پێکەنین، دیاربوو یادگاری هەبوو لەگەڵ ئیمامی ئەبوبەکردا لە ڕووداوێکدا، بەهەرحاڵ کەوتە پێکەنین و پاشان ئیمامی ئەبوبەکر بە عائیشەی کچی وت: ئەگەر پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەڵدەبژێریت و تا قیامەت و ئاخیرەت ژیانی ئاوایە، عائیشە ڕازیبوو بە ژیانی پێغەمبەر و پاشان هەموو خێزانەکانی بەو شێوەیە ڕازیبوون و پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەموویانی هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆی.



**ماکوان: لە ساڵی ١٠ی کۆچیدا حەج فەرز بوو لەسەر موسڵمانان، یاخود لە کۆتایی ساڵی ٩ کۆچی دا فەرز بووە، بە هاتنی ئایەتی** ﴿... وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ... ﴿٩٧﴾﴾ [آل عمران]**، لە ئیسلامدا ئەم حەجەی پێغەمبەر** صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ **ناسراوە بە حەجی بەلاغ، یان حەجی ئیسلام، یاخود حەجی ماڵئاوایی.**

**هەروەها لەو ساڵەدا ئایەتی (٣ی سورەتی المائدة)**

﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣﴾﴾ [المائدة]

**واتە: لەسەرتان حەرام کراوە خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، خوێن، گۆشتی بەراز، هەروەها ئەو ماڵاتەش کە سەر دەبڕدرێن و ناوی غەیری خوای لەسەر دەبرێت و ماڵاتی خنکاویش، ئەوەش کە بە ئازارو لێدان مردار بۆتەوە، ئەوەش کە دەکەوێتە خوارەوە، ئەوەش کە بەلێدانی ماڵاتێکی تر مردار بوو بێتەوە، ئەوانەش کە دڕندە پەلاماری دابن و لێی خواردبن مەگەر فریای چەقۆ کەوتبن، (هەر حاڵەتێک لەوانەی باسکرا ئەگەر بە چەقۆدا بگات حەڵاڵە)، هەروەها حەرام کراوە خواردنی گۆشتی ئەو ماڵاتانەی لەو شوێنانەدا سەر دەبڕدرێن کە هانا و هاواری بۆ غەیری خوا تێدا دەبرێت، هەروەها حەرامە لەسەرتان داوا کردنی چارەنووستان بەهۆی (الأزلام) وە، وەکو ئەو شتانەی کە لە ڕێگەی هەڵدانی زارەوە دەست بکەوێت و فاڵگرتنەوە، بورجەکان، قاوە گرتنەوە...هتد) ئەو جۆرە کردارو ڕەفتارانەتان سەرپێچی و دەرچوونە لە (فەرمانی خوا)، جا ئەمڕۆ (کە ڕۆژی عەرەفەیە) کافران نائومێد بوون لە دین و ئایینی ئێوە (ئیتر ناتوانن زاڵ بن بەسەرتانداو هەرگیز نووری خوایان بۆ ناکوژێتەوە) کەواتە لەوانە مەترسن، بەڵکو هەر لە من**



بترسن، ئەمڕۆ ئایین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاند و ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامە و دین و ئایینتان (جا لەگەڵ بڕیاردانی ئەو شتانەدا کە حەرامامان کردووە) هەر کەس ناچار کرا لە گرانیی و برسێتیدا (مەترسی ئەوەی هەبوو بمرێت) دەتوانێت لەو شتانە بخوات کە حەرامامان کردووە (بەمەرجێک دەست درێژکار نەبێت و بەئارەزوو ژەمی زۆری لێ نەخوات) و خۆی تووشی گوناهو تاوان نەکات، ئەوە بەڕاستی خوا لێخۆشبووە و میهرەبانە (بۆ ئەو جۆرە حاڵەتانە).

دابەزی و هاوەڵان زۆرێکیان دەستیان کرد بە گریان، لەوانە ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب وتیان ئەجەلی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیک بۆتەوە.

لە ساڵی ڕابردوودا کە ئیمامی ئەبوبەکر حەجی موسڵمانانی کرد، بەلاغی بەرائەت و کۆتایی بە جاهیلییەت هات و موشریک ئیتر بۆی نەبوو حەج بکات، ماڵی خوای گەورە پاک کرایەوە لە هەموو جۆرە شیرک و خورافاتێک، عەرەب هاتنە ناو ئیسلام، وا مەککە بەخێرهاتنی باشترین مرۆڤی سەرزەوی دەکات، یەکەم حەج و کۆتا حەجی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لەم ساڵەدا خەڵکێکی بێشومار کۆبوونەوە هەموو ئیماندار و خواناس بوون، موشریک لەگەڵیاندا نییە، ئەمەش دوای هەزاران ساڵ کە مەککە تووشی پەرستنی بت بوبوون، وا ئەو ڕۆژە هات مەککە بێ موشریکە و طەواف ڕووت و قووتی لێ نییە.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو دروشم و ئەحکامەکانی فێری خەڵکی کرد و کۆتایی هات بە دابەزینی وەحی، وەحی تەواو کامڵ بوو و حەج فەرزکرا، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵئاوایی لەم ژیانە بکات و بگەڕێتەوە لای خوای پەروەردگاری.

ئەم فەرزەی حەج کۆتایی سڕینەوەی تاوانی مرۆڤ و پاککردنەوەیەتی لە هەموو تاوانێک و لەمەولا نووری تەوحید بەرزکراوە، تەنها و تەنها بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار دەکرێت، پاککراوە لە هەرچی بت و پەیکەر و طاغوت بوو.

ئیتر ئەم حەجە واتە وەسیەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ ئوممەتەکەی، کۆتا پەیوەندی نێوان هاوەڵانی و ڕەسول الله.



لە وەسەتەکەیدا بۆ ئوممەتەکەی لە وتاری حەج دا پوختەی ئەحکام و دروشم و یاساکانی خستەوە بیری ئوممەتەکەی، وتاری بۆ هاوەڵان و ڕەوەند دوای ڕەوەند و جیلەکانی تا ڕۆژی قیامەت، لە دوای ئەوەی کە خۆی بە جوانترین و باشترین شێوە ئەمانەتی ئیسلامی گەیاند و ئامۆژگاری ئوممەتەکەی کرد لە بواری ژیان و دنیادا.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کەوتە ڕێ بەرەو حەج، ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی ڕاسپارد کە بڕوات بۆ یەمەن ڕای جیاواز کەوتۆتە نێوانیان بۆ وەرگرتنی زەکات و لەوێوە وشترەکان و قافڵەی حەج ڕێک بخات، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ گەیشتە شاری مەککە بە پۆڵێ باشترین خەڵکی سەر زەوی بۆ جێگایەک باشترین و پاکترین جێگای سەرزەوییە، خۆی باشترین و چاکترین مرۆڤی سەر زەوییە، پەیامەککەی باشترین و چاکترین پەیامی سەر زەوییە، باشترین فریشتە هاتۆتە لای خوای کردگاری ئەم بوونە.

خۆشترین و جوانترین چرکەساتەکانی ژیانی پێغەمبەرە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەوەی کە فەرمووێتی هەمووی وەحی بووە

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ [النجم].

واتە: ئەمەی کە رای دەگەیەنێت تەنها نیگا و وەحی خواییە.

یەکەم لە عەرەفەدا و کردنەوەی هەناسە و وەحی موبارەکی بە وشەیەک، هەموو بێدەنگ دەکات و خۆی دەفەرمووێت: ئەی خەڵکینە باش گوێبگرن لەوانەیە ساڵێکی تر من نەبیننەوە.[٧٨]

هەموو جیهان بێدەنگە بۆ ئەوەی گوێبیستی وتەی پێغەمبەری خوابن صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەوەی پوختەی ئیسلام پێشکەش بکات کە مەبدەئی ڕەحمەت و خۆشەویستییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، کە ئاشتی و هێمنی و برایەتی خۆشەویستییە بۆ هەموو لایەک مەبدەئی هاوکاری و پێکەوە ژیانە، ژیانی هاوبەشە لەگەڵ هەموو مرۆڤەکانی سەر زەویدا، مەبدەئی لابردنی زوڵم

---

[٧٨] ـ ( أَيُّهَا ٱلنَّاسُ اِسْمَعُوا قَوْلِي ، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لِعَلِي لَا أَلْقَاكُمْ بَعْدَ عَامَيْ هَذَا بِهَذَا ٱلْمَوْقِفِ أَبَدًا).



و زۆردارییە لەسەر هەموو خەڵکی سەر زەوی لابردنی زوڵمی برای مرۆڤە لەگەڵ براکەی تریدا، ئەوەی کە پێشکەشت دەکات لە ڕاستی مەبدەئی ئینسانییە.

وتاری کۆتاییبیان وتاری ماڵئاوایی چەند وەسیەت نامەیەکە کە گرنگترینی نەهێشتنی خوێن ڕێژی و لەناوبردنی یەکترییە لە زوڵم.



## یەکەم پرەنسیپی وتاری ماڵاوایی

ماکوان: حەرامکردنی خوێنڕێژی بە ناحەق، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەی خەڵکینە، خوێن و سامان و ماڵتان لەسەر یەکی تری حەرامە، تا ئەو ڕۆژەی هەموو دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان، هەر وەکو ئەمڕۆ، کە ڕۆژی عەرەفەیە لەم جێگایەدا هەموو شتێک حەرامە تەنها عیبادەتکردن نەبێت، هەروەکو مانگە حەرامکراوەکان. [٧٩]

کوا ئوممەتی ئیسلامی لە پیادەکردنی ئەم پرەنسیپەدا، بە داخەوە لە ئێستادا تەنها لە ناو ئوممەتی ئیسلامیدا کەوتوونەتە کوشتن و لە ناوبردنی یەکتری، بە ناوی جۆراوجۆر ئەوەی چەپڵە لێئەدات بۆیان دوژمنانی خوا و موسڵمانانن، گەیشتوونەتە حاڵ و گوزەرانێک تەنها خوێنی یەکترمان لا هەرزانە لە برای موسڵمانت، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جەختی کردەوە لەسەر یەکەم مەبدەئی موسڵمان کە برای یەکترن و موسڵمانن هەموو بران، بۆیان نییە لە چاکە زیاتر بکەن لەگەڵ یەکتریدا، کەواتە زوڵم لە خۆتان و براکانتان مەککەن. [٨٠]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٩] ـ ( فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ، وَأَمْوَالَكُمْ، وَأَعْرَاضَكُمْ، عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا ، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا...).

[٨٠] ـ (تَعَلَمْنَ أنْ كل مسْلِم أَخ للْمُسْلم، وَأنَ الْمُسْلِمِنَ أُخْوَة، فَلا يَحِلُّ لامْرئٍ مِنْ أخيهِ الاَّ مَا أَعْطَاهُ عَنْ طَيْب مِنْهُ، فلا تَظْلِمْنَ أَنْفُسَكُمْ...).



## دووەم پرەنسیپی وتاری ماڵاوایی

**ماکوان: کۆتایی هات بەهەموو عورف و عادات و خوێنرێژی و جاهیلی و کارە قێزەونەکانیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەموو شتێکی جاهیلی لە ژێر پێم دایە و کۆتایی هات بە خوێنرێژی و تۆڵەسەندنەوەی جاهیلی و ڕیا و هەموو کارە قێزەونەکان.**

**لەولا شارستانیەتی نوێ هاتە ئاراوە و خۆشەویستی و پێکەوەژیان و یەکبوون و یەکهەڵوێست و وەحدەتی فیکری و بیروباوەڕی پێشەنگە.** [٨١]

## سێیەم پرەنسیپی وتاری ماڵاوایی

**ماکوان: ئەم وەسیەتە پەیوەستە و تایبەتە تەنها بە پیاو و ژن ( ژن و مێرد)، بەڵام جوانترین و باشترین وەسیەتە، کە لە ئێستادا هەردوو لا وەزیفە و کاری خۆیان خەریکە وەکو سەردەمی جاهیلی لەناو موسڵماناندا ون دەبێت.**

**ئەویش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: لەگەڵ ئافرەتان باش بن بە واتای ئەوەی کەرامەت و مافیان لاتان پارێزراو بێت بە هۆکاری لاوازیان مەیانچەوسێننەوە.** [٨٢]

**بۆ ئەوەی مافی ئافرەت پێشێل نەکرێت, پێویستە ئافرەتان باش بزانن ماف و ئەرکیان چییە.**

**ئیسلام تەماشای هەردوو ڕەگەز دەکات لە ڕەگەزی نێر و مێ وەکو مرۆڤ بەڵام هەرگیز یەکسانیان ناکات، چونکە یەکسانبوونی ئەم دوو ڕەگەزە واتە نادادپەروەری، بەڵام ئیسلام هەر یەکە و مافی خۆی ئەداتێ تا وەزیفەی خۆی ون نەکات و کەرامەتی لەدەست نەدات.**

**بە داخەوە لە سایەی کلتوری نێرینەی و پاشان ڕازی نەبوونی ئافرەت لە پیاوان مەودایەکی دوور و درێژی خستۆتە نێوانیان، بە ڕادەیەک کە خەریکە هەردوولا متمانە لەدەست ئەدەن،**

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨١] ـ (أَلَا إِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ اَلْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمِي مَوْضُوعٌ ، وَدِمَاءُ اَلْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ).

[٨٢] ـ (اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا).



بەڵام ئەگەر پیاوان ماف و ئەرکی خۆیان زانی لە بەرامبەر ئافرەتاندا، ئەوا پێویستە ئافرەتانیش ملکەچی هەمان ئەرکی خۆیان بن لە هەمبەر پیاواندا، بەو مەرجەی پیاو هێزی فیزیکی بەکار نەهێنیت بۆ چەوساندنەوەی دایک و خوشک و هاوسەر و کچیدا ئەمەش ئەو مەبدەئی ئاگا لێبوونە لە ئافرەت لەلایەن پیاوانەوە.



## پڕەسنیپی کۆتایی وتاری ماڵاوایی

ماکوان: گرنگترین مەبدەئی وتاری پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ یە کە دەفەرمووێت: لە دوای خۆم لە ناوتاندا بەجێ دەهێڵم دوو سەرچاوەن، قورئان و سوننەتە، ئەگەر دەستی پێوە بگرن هەرگیز سەرلێ شێواو نابن، چاکسازی لە ناو ئەم ئوممەتەدا ناکریت، تەنها بە دوو سەرچاوە نەبێت.[٨٣]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨٣] ـ (تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا : كِتَابُ ٱللَّهِ عَزَّ وَ جَلَّ ، وَسُنَّةُ نَبِيِّهِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).



# کۆی گشتی وەسیەتنامەکە لە حەجی ماڵاوایی

ماکوان: لە سەرەتاوە مەبدەئو پرەنسیپەکانی ئەم وەسیەتنامەیەم کورت کردۆتەوە لە چوار پرەنسیپدا بەڵام دەمەوێت زیاتر قوڵبینەوە لەم باسەدا چونکە زۆر گرنگە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە گرنگترین سەربازگەکانی بوو، ئەم هەڵوێستە و وتاردانەی لە کۆتایی حەجی ماڵاواییدا بوو، هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دابوون لەماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا، ئەم حەجە تەنها و تەنها بەجێهێنانی فەرمانێک نەبوو، بەڵکو دانانی پایەی بنەڕەتی بونیاتنانی ئەم ئوممەتە بوو، هەموو بنەماکانی پاراستنی تەمکینی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، کە چۆن ئەو هێز و دەسەڵات و تەمکینە نەفەوتێت وەکو خۆی بمێنێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجەکەیدا سێ وتاری دا، لەسێ جێگای جیاواز دا، یەکەمیان لەسەر عەرەفە لە ڕۆژی عەرەفەدا، دووەمیان لە ڕۆژی قوربانی و یەکەم ڕۆژی جەژن لە مینا، سێیەم ڕۆژ لە ڕۆژەکانی تەشریق و جەژن لە مینا.

ئەم سێ وتارە چاوکردنەوەی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ بوو لەوەی کە چۆن موسڵمانان تەمکین و دەسەڵات و دەوڵەتیان بپارێزن، بۆ ئەوەی زیاتر قوڵ بینەوە لە باسەکاندا با گوێبگرین بۆ ئامۆژگاری و وتارەکەی پێغەمبەری خواﷺ، ئەگەر چی وتارەکان زۆر کورتە بەڵام مانا و مەدلولی زۆر قووڵی لەخۆ گرتووە، بە کۆمەڵێک وشەی زۆر کەم دنیایەک مانا و واتای پڕ بەهای داویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ژمارە نایەت حیکمەت و سوود و ئامۆژگارییەکانی، ئەوەش موعجیزەی پێغەمبەرە ﷺ کە بە وشەیەکی کەم مانایەکی زۆری ئەداتێ کە ناسراوە بە موعجیزەی (جوامع الکلم).

ئەم سێ وتارەی کە دای جیاوازتربوو لە هەموو وتارەکانی ڕابردووی، ئەم سێ وتارە ئاراستەی ئوممەتی ئیسلامی بوو، لە هەموو جیهاندا، پاشان ئاراستەی هەموو مرۆڤایەتی بوو، پێشتر وتارەکانی ئاراستەی تاک یان سوپا یان شارێک بوو بەگشتی، یان باسی مەزلوم و لاوازەکان بوو لەسەر زەوی، یان باسی بێ دەرامەتەکان و هەژارەکان بوو، یان باسی جەنگ و جەنگاوەر و جیهاد و کوشتار بوو، یان باسی بانگەواز بوو، یان وتارەکانی باسی تاوان و گوناهی کردووە، بەڵام



وتاری ئەم جارە باسی ئەوانە دەکات کە بوونەتە خاوەن تەمکین، باسی ئەوەیان بۆ دەکات هەنگاوی بەردەوامی لە تەمکین و فراوانی لە قەلەمڕەوی دەکات، ئاگاداریان دەکاتەوە کە ئاگاداری ئەوەبن لە دەستیان دەرنەچێت دەوڵەت و تەمکین و هێزتان، شیکاری ئەدات بەڕوون و ئاشکرا لەسەر ڕۆڵی دەوڵەتی ئیسلامی خاوەن تەمکین لەسەر زەویدا، وتارەکەی بۆ ئوممەتێکی سەرکەوتوو و سەربەرزە، نەک فاشل، شەریعەت و یاساکان گەیشتە لوتکە، هەموو تەشریع کامل بوو، هەر لەو حەجەدا هەموو یاسا و ڕێساکان دارێژران لە لایەن خواوە بۆ مرۆڤەکان، شارستانیەت و بنەماکانی گەیشتە لوتکە، ڕۆشن و ئاکارگە گەیشتە لوتکە، هەموو کامل و تەواو بوون، ئینجا بناغەی بونیاتی ئوممەت دادەنرێت، بەم بناغە بونیات دەنرێت هەرگیز دانابەزێت.

پوختەی ئەو سێ وتارەی پێغەمبەر باسدەکەم، ئەگەرچی بۆ شیکاری پێویستی زۆری بە کات و کاغەز و قەڵەمە، بە پشتیوانی خوای پەروەردگار بەڵام پوختەکەی لە بەردەمی ئێوەدا دادەنێین، ئەم کۆمەڵە وەسیەتەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێویستە لەگەڵیدا بژین بۆ ئەوەی بتوانین بونیادی ئوممەت و وڵات و کۆمەڵگە و تاکە کەسی لەسەر بونیاد بنێین کە دە خاڵە:

وەسیەتی یەکەم: دەست گرتن بە قورئان و سونەتەوە.

فەرمووی: لە ناو ئێوەدا لە دوای مردنم ئەوەی بە جێم هێشتووە دەستی پێوە بگرن هەرگیز سەرلێشێواو نابن لە دوای من، ئەویش قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەتانە. [٨٤]

هەموو شتێک لە دوای پێغەمبەری خوا ڕوون و ئاشکرایە، ئەمەش پەیمان و فەرموودەی پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆمان ئەگەر دەست بە قورئانەوە بگرین لەگەڵ کردار و فەرمان و ڕەفتاری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کەواتای سونەتە، ئەوە هەرگیز و هەرگیز تووشی دۆڕان و سەرلێشێواو و خراپەکاری نابین، بۆیە گەلانی موسڵمان تووشی سەرلێشێواوی بوون، وازیان لە قورئان و سوننەت هێناوە، خۆ ئەگەر وازیشیان لە هەمووی نەهێنایە نیوەیان وەلا ناوە، ئەمەش هۆکاری سەرلێشێوانی ئەم ئوممەتی پێغەمبەرەیە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٨٤ ـ (تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا : كِتَابُ اَللَّهِ جَلَّ وَعَزَّ ، وَسُنَّةُ نَبِيِّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).



خوای گەورە فەزڵی پێغەمبەر و ئوممەتەکەی بۆ پاراستوون تا ڕۆژی قیامەت، لەوانەیە جێگای سەرنج بێت زەوی و جیهان بە گشتی و ئوممەتی موسڵمان ڕۆژانە چەندە خەسارەتمەندن بە نەبوونی شەریعەتی خوا و پیادە نەکردنی!

زۆرێک لە موسڵمانان تووشی فیتنە و ئاشوب بوون، بە هۆکاری بیروباوەڕی دەستکردی مرۆڤ کە بەئارەزووی خۆیان یاسا دادەڕێژن، جارێک مەفتون دەبێت بە شوعییەت و جارێک بە سەرمایەداری و جارێک بە لیبراڵیی و عەلمانی و ...هتد.

لە بیریان چۆتەوە خاوەنی مەنهەجی خوای هەق و ڕاست و دروست و تەندروستی، مەنهەجی خوای پەروەردگار هیچ هەڵە و خێچ و خواری تێدا نییە لەلایەن حەکیم و شەرعی ئیسلام زۆر بە وردی سەرنج و شیکاری لەلایەن خواوە داڕێژراوە، بۆ هەموو سەردەم و جێگا و شوێنێکدا دەگونجێت، واقیعیە و لە کاتی جێبەجێ کردنیدا گونجاوە لاکان هەموو ڕازی دەکات و تاوانباریش مافی خۆی تێدا بەدی دەکات، یاسایەکی شامل و کاملە گەورە و بچووکی جێنەهێشتوە چواردەوری هەموو شتێکی داوە، هیچ دەوڵەتێک بەناوی ئیسلامەوە دانانرێت ئەگەر پیادەی شەریعەت نەکات لە سیاسەت و ئابووریدا و لە جەنگ و پەیماننامەیدا، لە مەنهەجیدا، لە هەموو بوارەکاندا، دەستوورێکی ڕێک و پێک سیستەمێکی تەواوە بۆ ژیان و هەموو شتێک تێیداڕوونە.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ [النحل]

واتە: ڕۆژێك دێت لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێك دەنێرین لە خۆیان بۆ سەریان، تۆشمان هێناوە (ئەی محمد صلی الله عەلیە وسلم) کە شایەت بیت لەسەر ئەو خەڵکە، قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، هیدایەت بەخش و ڕەحمەتەو مزگێنیشە بۆ موسوڵمانان.



سوێند بە خوای پەروەردگار زۆر تاوانە مرۆڤ خاوەنی ئاڵتوون بێت کەچی حەز بە خاک و خۆڵ بکات، تاوانە مرۆڤ خاوەنی قورئان و سوننەت بێت، بڕوات بۆلای دیموکراسی و لیبراڵی و سەرمایەداری و عەولەمە (گلۆباڵیزەیشن).

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانیدا جەختی لەسەر ئەم باسە دەکردەوە بە ڕوونی و ئاشکرایی هاوەڵان دەڵێن؛ کاتێک وتاری بۆ ئەدایین و ئامۆژگاری دەکردین چاومان زەق ببوو بە دیاریەوە، دڵمان لای بوو (عیرباضی کوڕی ساریە) دەڵێت وتمان یا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئامۆژگارییە لە ئامۆژگاری کۆتایی ماڵاوایی دەچێت، وەسیەتت چییە بۆمان؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس لە ئێوە بژی (واتا دوای مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ) ڕاجیاوازی و دووبەرەکی زۆر گەورە دەبێت، جا دەست بگرن بە سوننەتی منەوە و هەروەها سوننەتی خەلیفەکانی پێگەیشتووی ڕاشدین لەدوای من، ددانی پێدا بکەن و بەری مەدەن. [85]

ئەمە گرنگترین وەسیەتنامەی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە حەجی ماڵئاویدا، چونکە بەڕاستی ڕزگاربوونی تەواوەتی لە قورئان و سوننەت دایە، هەرچی وەسیەتی تر هەیە سەرچاوەکەی قورئان و سوننەتە، یاخود بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دوو سەرچاوەیە، ئەمەش وەسیەتێکی پوخت و شامل و کاملە خێری دونیا و قیامەتی تێدایە.

هەر یاسایەک پێچەوانەی یاسای ئیسلام بوو یاخود دژایەتی ئیسلامی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردۆتەوە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات هەر یاسایەک دژی ئیسلام بوو یاسای جاهیلییە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[85] ـ (إِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ مِنْ بَعْدِي تَمَسَّكُوا بِهَا وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ).



پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: هەموو شتێکی جاهیلی لە یاسا و ڕێساکانی سەردەمی نەفامی لە ژێر پێمدایە و کۆتایی هاتووە خوێنڕێژی و تۆڵە سەندنەوە لە جاهیلەتدا کۆتایی هات و بڕاوەتەوە.[86]

هەروەها ڕیبا و هەوڵدان بۆ کوشتن و تۆڵەسندنەوە کۆتای پێ هات لەبەر ئەوە دژی شەریعەتی ئیسلامە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[86] ـ (أَلَا إِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ ٱلْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمِي مَوْضُوعٌ ، وَدِمَاءُ ٱلْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ).



## وەسییەتنامەی دووەم برایەتی و خۆشەویستی

ماکوان: ئەم وەسیەتە ڕاستەوخۆ دوای دەستگرتن بە قورئان و سوننەت دێت، چونکە وەحدەتی موسڵمانانی تێدایە، هەرچەندە وەسیەتی تر زۆر زۆرە لە بارەی برایەتی و وەحدەتی برایەتی پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ کاری لەسەر کردووە، چەندین ئاڕاستە و باسی تری لەسەرەتاوە لەسەر برایەتی جەخت کردنەوە لەسەر ئەو پرسە گرنگە کردووە پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە گرنگە کە بونیادی ئوممەتی ئیسلامی، تەنانەت قیامەتیش.

هەرگیزاو هەرگیز ئوممەتی جیا و پارچە پارچە توانای هەڵسانەوەی نییە، هەرگیز خەڵکێک کە دووبەرەکی و پارچە پارچەیی لە ناویاندا بێت خوای گەورە سەریان ناخات لە وتاری حەجی ماڵاواییدا دەفەرمووێت:

دەبێت هەمووتان ئەوە باش بزانن کە موسڵمان برای موسڵمانە، لە نێوان موسڵماناندا برایەتی هەیە.[٨٧]

پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە جەختی لەسەر برایەتی موسڵمانان کردۆتەوە و لەسەرەتای قۆناغی مەککەدا کە لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم و تەنانەت کۆیلەکانیش کە ئازاد دەکران دەبوون بە برایان لە شاری مەککەدا، پاشان لە قۆناغی مەدینەدا برایەتی خستە نێوان موهاجیر و ئەنسار بەیەکەوە، پەیمان و میساقی شەرەفی ئیمانی لە نێوانی ئەوس و خەزرەج لەسەر برایەتی، چونکە سیمای دەوڵەتی ئیسلامی برایەتییە.

هەموو برابوون لەو دەوڵەتەدا حاکم و مەحکوم، سەرباز و سەرکردە، گەورە و بچووک برایەتییەکی ڕاستەقینە، تەنانەت کار گەیشتە دابەشکردنی میرات لە نێوانیاندا لە سەرەتای قۆناغی مەدینەدا و دوایی نەسخ کراوە، هەموو برابوون لەسەر بنەمای دین.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٨٧ ـ (تَعْلَمُنَّ أَنَّ كُلَّ مُسْلِمٍ أَخٌ لِلْمُسْلِمِ وَأَنَّ الْمُسْلِمِينَ إِخْوَةٌ .)



لە وتاری ماڵاویدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر پرسی برایەتی، بەرگێکی نوێی کرد بە بەریدا.

زۆر بە ڕوون و ئاشکرا باسی برایەتی کرد، کە تایبەت نییە بە ڕەگەز و نەتەوەوە یاخود بە هۆز و نەسەب و عەشیرەتەوە، یان بە توخمی دەوڵەتەوە، بەڵکو یەکسانی تەواوەتی هەیە لەنێوان موسڵماناندا بەگشتی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵکینە، هەمووتان خاوەنی یەک خوای پەروەردگارن هەروەها خاوەنی یەک باوکن، دەبێت باش بزانین جیاوازی لە نێوان عەرەب و عەجەمدا نییە، یان بە پێچەوانەوە جیاوازی لە نێوان عەجەم و عەرەبدا نییە، جیاوازی لە نێوان سوور پێست و ڕەش پێست دانییە، بە پێچەوانەوە جیاوازی لە نێوان ڕەش پێست و سوور پێست دانییە، تەنها بە خۆپارێزی و تەقوا نەبێت. [٨٨]

ئایا لە هەموو جیهاند هاوشێوەی ئەم وتەیە هەیە؟!

هەرچی ڕێکخراو  و مافی مرۆڤ هەیە و هەرچی فەیلەسوفی فەلسەفەی سرووشت هەیە و هەرچی زانای بەتوانا هەیە، تا ئەم چرکەساتە توانای دارشتنی یاسای وایان نییە، کە لە مەیداندا ١٠٠٪ پیادە کرابێت.

لە ئێستادا هەموو لاکان و ئەرکەکانی دەوڵەتە بەهێز و زلهێزەکانی دونیا و جیهانگیری لە سەدەی٢١ دا باسی ئەوە دەکەن کە سەرۆک کۆمارێک ڕەش پێستێک یان سپی پێست یان پرتەقاڵی وەکو دۆناڵد ترامپ!

لە ئێستادا لە ئەمریکا، فرەنسا، ئینگلیز، ڕووسیا، ئەڵمانیا و...هتد، ئێستا سپی و ڕەش جیاوازن و هەریەکە بە چاوی سووک و پلە دوو تەماشای ڕەش پێست دەکەن.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٨٨ ـ (لَا فَضْل لِعَرَبِيٌّ عَلَى عَجَمِيّ، وَلَا لِعَجَمِيٌّ عَلَى عَرَبِيٌّ، وَلَا لِأَبْيَضِ عَلَى أَسْوَدَ، وَلَا لِأُسْودِ عَلَى أَبْيَضِ: إِلَّا بِالتَّقْوَى، اَلنَّاسُ مِنْ آدَمْ، وَآدَمْ مِنْ تُرَابِ).



لە ئیسلامدا فەقیر و دەوڵەمەند بران، هەژار و وەزیر بران، ڕەش و سپی بران فارس و حەبەشی بران، عەرەب و تورک بران، بەڵام لە هەموو بیروباوەڕەکانی تردا هەژار و دەوڵەمەند دەوڵەمەند و سپی پێست و سپی پێست، ڕەش پێست و ڕەش پێست، چۆن و کێ دەتوانێت بڵێت بران!

سەرمایەداری خەڵکی ئەرستۆکراتی دروست دەکات و شوعی پڕۆلیتاری و دیموکراسی خەڵکی مشەخۆر و بوزی و یەهوودی و سیخ خەڵکی ئەنانی، تەنها ئیسلامە برایەتی دروست دەکات.

تەنها ئیسلامە لەسەر بنەمای بیروباوڕ بێ گوێدانە بە ڕەگەز برایەتی بونیاد دەنێت.

هەرکاتێک ئوممەتی ئیسلامی گۆڕانکاری کرد لە ئوممەتەوە بۆ هۆز و نەتەوە، ئەوە بە دڵنیاییەوە لە ناودەچێت و دەڕووخێت، چونکە هەموو پایە و توخمەکانی لەناو چوون.

لە ماوەیەکی کورتدا فارس و کورد و ئەفغان و تورک هەموو فەتح کران و موسڵمان بوون و توانەوە لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی و هەزاران پیاوی وەکو (ئەلب ئەرسەلان و سەڵاحەددین و محمد فاتیح و نیزام مولک و نەجمەدین ئەیووب، سولەیمان قانونی...هتد) لە ناویاندا دروست بوون.

پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ لە وتاری حەجی ماڵاوایدا جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کەواز لە وەحدەتی عەرەبی و یاخود نەتەویی بهێنن.

واز لە هەموو ئەو نەتەوەگەرانە بهێنن، عەرەب و بەربەر و تورک و هەموو جۆرەکانی نەتەوەیی ناوی نا بە بۆگەن و پیس و جاهیلەت.

فەرمووی: خوای پەروەردگار لە ناوتاندا لای بردووە هەرچی داب و نەریتی جاهیلییە بەواتای فەخر و خۆبەزل زانین بە باوک و کەسوکار، خەڵکی دوو جۆرن یان ئیمانداری خۆپارێز و لە خوا ترسن یان خراپەکار و سەرەڕۆ، ئێوە هەمووتان لە نەوەی ئادەمن ئادەمیش لە خۆڵە، زۆرێک بانگەشە بۆ هۆزێک یان نەتەوەیەک دەکات لە زۆرینەیان کە ئاگردان و بوونەتە خەڵوزی



جەهەنەم، ئەوەی شانازی بە کەسوکار و نەتەوە و هۆزەوە بکات باشترە لای خوای گەورە، کە مرۆڤ شانازی بە لاکە تۆپیوێکی بۆگەن بکات، کە بۆگەنیوەکەی بە لووتیدا دەڕوات.

هەموو شتێکی جاهیلی کۆتایی هات و لە ژێر پێمدایە.[89]

---

[89] إنّ الله قد أذهب عنكم فَخْر الجاهليّة وتكبّرها وتعاظُمَها بآبائها، فالنّاس رَجُلان: الأول: مؤمنٌ تقيٌّ، فهو الخيِّر الفاضل الكريم على الله، وإلم يكن حسِيبًا في قومه، وهو الذي يجب أن يُحبَّ ويُحترَم، والثاني: فاجرٌ شقيّ ذليلٌ عند الله، فهو الدَّنيّ وإن كان في أهله شريفًا رفيعًا، وهو الذي يجب أن يُبغض ويُتبرّأ منه، والنّاس بنو آدَم، وخَلَق اللهُ آدمَ مِن تراب، فلا يليق بمن أصلُه التّراب النُّخوة والكِبْر، ثمّ تلا عليه الصلاة والسلام الآية التي تدلّ على أنّ المعيار الصَّحيح للتفاضل بين البشر هو التَّقوى، وأنّ الكريم عند الله هو التَّقيّ



# وەسییەتنامەی سێیەم زوڵم کردن

زوڵم کردن بەتایبەت بۆ دەوڵەتێکی خاوەن تەمکین، با قسە ڕۆشتوو بێت لە ناو موسڵمان هێزی زۆر بێت، با چەکی زۆر پێشکەوتووی هەبێت کە زوڵمی کرد خوای گەورە لە ناوی دەبات، ئەگەر هەموو زەویشی بەدەستەوە بێت.

زوڵم کارەساتی مرۆییە، زوڵم لە تاریکی دایە لە ڕۆژی قیامەتدا، هەش (قوڕ) بەسەر ئەو کەسەی زوڵم دەکات، زوڵم لە ناوبەری هەموو گەلێکی زاڵمە.

خوای گەورە دەفەرموویت لە قورئاندا:

﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴾ [الأنبياء]

واتە: چەندەها شارو شارۆچکەمان کاول کرد کە خەڵکەکەی ستەمکار بوون و بەدوایاندا گەلانی ترمان هێناوەتە مەیدانەوە.

ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بۆ ئوممەتێکی دادپەروەر زۆر ئاشکرا و ڕاشکاوانە بوو لە وتارەکەیدا فەرمووی:

خوێن و ماڵ و سەروەت و سامانتان حەرامە لەسەرتان تا دەگەنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار وەکو ئەمڕۆ کە ڕۆژێکی حەرامە و تەنها عیبادەت تێیدا دروستە، وەکو مانگە حەرامەکان، ئەم جێگایە مەککەیە هەموو شتێکی تێدا حەرام کراوە وەکو( ڕاو، داربڕین، کڕین و فرۆشتن لە کاتی ئیحرامدا و...هتد).[٩٠]

پێغەمبەری صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕێگری کرد لە هەموو خوێن ڕێژییەکی بە ناحەق ، یاخود دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانی خەڵکیدا و بەهەدەر بردن و زەوتکردنی، بەهەموو جۆرێک

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩٠] ـ (أَيُّهَا النَّاس، إِنَّ دِمَاءَكُمْ، وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلَا هَلْ بَلَغْتُ. مُتَّفَقٍ عَلَيْهِ...).



سەروەت و ماڵی خەڵکی خواردن بە هەرجۆرێک بێت حەرامە، جا دەوڵەت بێت یاخود کۆمەڵ و تاکە کەس، هەر بۆیە شێخ و لئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت:

خوای گەورە دەوڵەتێکی عادل و دادپەروەری کافر سەردەخات، بەڵام شکست دەهێنێت بەسەر دەوڵەتێکی زاڵمی موسڵمان، یاخود هەر دەوڵەتێکی زاڵم ئەگەر موسڵمانیش بێت.[٩١]

پێغەمبەری خوا ﷺ جەختی لەسەر دادپەروەری دەکردەوە لە ژیانی موسڵماناندا و دەوڵەتەکەیاندا، دادپەروەری تەنها لە چوارچێوەی مامەڵەی دەوڵەت و سنووری خەڵکیدا مەبەست نییە، بەڵکو دادپەروەری لە هەموو بوارەکاندایە، تەنانەت لە چوارچێوەی خێزانێکیش بەگشتی، لەگەڵ کەسە نزیکەکانیدا، زوڵم بە هیچ شێوەیەک لە ئیسلامدا جێگای قبوڵ نییە، پاشان وەسیەتەکە هاتە چوارچێوەی ئافرەت کە زوڵم لە ئافرەت نەکرێت، دەشێت زۆر جار بە هێز بە هۆکاری هێزی زوڵم لە لاواز بکات، زۆرجار هاوسەر زوڵم لە هاوژینەکەی دەکات، یان کچەکەی یاخود خوشکەکەی، زوڵم لە جۆری مامەڵەدا یاخود میرات دا یان ئینفاق دا یاخود هەر شێوەیەک لە شێوەکانی زوڵم بەرامبەر بەئافرەت، وەسیەتەکە ئافرەتانی لەخۆگرت چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە وەحی ئاڕاستە دەکرێت دەزانێت زوڵم لەکوێوە دێت، بۆیە بە شێوەیەکی پارسەنگ وەسیەتەکەی داڕشت و فەرمووی:

ئەی خەڵکینە بەڕاستی مافی ئافرەتانتان لەسەرە، هەروەها ئافرەتان ئێوەش مافی دادپەروەری بەرامبەر بە پیاوان لەسەر شانتانە.[٩٢]

دەبێت هەردوو طەرەف (لا) ماف و ئەرکی خۆیان باش بزانن و زوڵم نەکەن.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩١] ـ (إِنَّ ٱللَّهَ يَنْصُرُ ٱلدَّوْلَةَ ٱلْعَادِلَةَ وَإِنْ كَانَ كَافِرَةً، وَلَا يَنْصُرُ ٱلدَّوْلَةَ ٱلظَّالِمَةَ وَإِنْ كَانَتْ مُؤْمِنَةً).

[٩٢] ـ (ايُّهَا النَّاسُ إِنَّ لَكُم عَلَى النِّساءِ حَقًّا، وَلَهُم عَلَيْكُم حَقًّا).



## وەسییەتنامەی چوارەم ئاگاداربوون لە شەیتان و نەکردنی تاوان

هەروەها لە وەسیەتێکی تری دا دەفەرموویێت: کە ئاگاداری تاوان و گوناهەکانتان بن بە بچووک تەماشای مەککەن، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئاگادارمان دەکاتەوە لە شەیتان کە بێ ئومێد بوو لە کافربوونمان بەڵام لە ڕێگەی تاوانەوە مرۆڤەکان هەڵدەخەڵەتێنێت، ئەویش لە ڕێگەی گوناهی بچووکەوە کە مرۆڤ زۆر بە چاوی کەم تەماشای دەکات.

دەفەرموویێت: بەڕاستی شەیتان نا ئومێد بوو لەوەی ئیتر خەڵکی لەم خاکەدا بیپەرستن بەڵام ئومێدی ئەوەی ماوە کە تاوان بکەن و بەچاوی کەم تەماشای تاوانەکانتان بکەن، ئەو بەو تاوانە کەمانەش ڕازییە، ئاگاداری دینەکەتان بن و لەتاوان و لە شەیتان. [٩٣]

جەنگ لە نێوان شەیتان و مرۆڤدا بێ پایانە تا ئەو ڕۆژەی شەیتان لە ناو دەچێت، خوای گەورە زۆر بە وردی دەفەرموویێت دوژمنە و بە دوژمن بیناسن:

﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ۝٦﴾

[فاطر]

واتە: چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنتانە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان بانگی تاقم و داروودەستەی خۆی دەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ.

هەرگیز شەیتان کاری خۆی لەبیرناکات، کار و فەرمانی ئەوەیە سەرگەردانی منداڵ و نەوەی ئادەم بکات بەگشتی، سەرکردایەتیان دەکات بۆ جەهەنەم، بۆ ئەم مەبەستە هەرچی جۆرە ڕێگایەک هەیە دەیگرێتە بەر بە هەموو شێوەکان، ئەگەر تاوانێکی زۆر بچوکیش بێت، ئەمانە هەموو پیلان و هەنگاوەکانی شەیتانە بۆیە خوای گەورە دەفەرموویێت:

---

٩٣ ـ (فقالَ إنَّ الشَّيطانَ قَد يَئسَ أن يُعبَدَ بأرضِكُم ولكنْ رضِيَ أن يطاعَ فيما سِوى ذلكَ مما تَحاقَرون من أعمالِكُم فاحذَروا إنِّي قد ترَكْتُ فيكم ما إنِ اعتصمتُمْ بِهِ فلن تضلُّوا أبدًا كتابَ اللَّهِ وسنَّةَ نبيِّهِ).



﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِى ٱلْأَرْضِ حَلَـٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾﴾ [البقرة]

واتە: ئەی خەڵکینە! لە ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵ و پاکی زەوی بخۆن (توخنی قەدەغە کراوەکان مەکەون) و شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە.

شەیتان بە تاوانکردن بە مرۆڤەکان هانیان ئەدات بۆ دۆزەخ..

﴿أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَـٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٦﴾﴾ [الأنعام]

واتە: ئایا نەیانبینیووە و نەیانزانیووە (بەهۆی شوێنەوارەوە) چەندەها نەوەمان پێش ئەمان لەناو بردووە کە پایەدارمان کردبوون لە زەویدا، بەشێوەیەک ئێوەمان ئاوا پایەدار نەکردووە و بارانی زۆرمان بەردەوام بۆ دەباراندن (کە دەبووە هۆی پێگەیشتنی جۆرەها ڕوەک و بەروبووم)، چەندەها جۆگە و ڕووباریشمان لەناو کێڵگە و باخ و شارەکانیاندا بۆ ڕەخساندبوون، خوڕەمی دەکرد بەنێو درەخت و کۆشک و تەلاریاندا، بەڵام بەهۆی لادان و گوناهو تاوانیانەوە لەناومان بردن و نەوەی ترمان لە دوای ئەوان هێنایە کایەوە.

﴿وَمَآ أَصَـٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾﴾ [الشورى]

واتە: هەر بەڵاو نەهامەتیەکتان بەسەر هاتبێت، ئەوە دەرئەنجامی ئەو کارو کردەوانەیە کە بە ئارەزووی خۆتان دەتانکرد، (بەڵام ئەوەندە خوایەکی میهرەبانە) لە زۆربەی زۆری گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت.

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾﴾ [الأعراف].

واتە: خۆ ئەگەر خەڵکی شارەکان بەڕاستی باوەڕیان بهێنایە و خۆیان بپاراستایە، ئەوا بێگومان ئێمە دەرگای فەڕو بەرەکەتی ئاسمان و زەوییان لەسەر دەکردنەوە، بەڵام ئەوان کە پەیام و



پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆ زانی، جا ئێمەش بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد گرتمانن و لەناومان بردن.

﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِۦ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ۝﴾ [العنكبوت]

واتە: ئێمە هەر یەکێك یان هەر دەستەیەك لە وانەمان بە سزای تاوانی خۆی گەیاند، جا هەیان بوو بەرد بارانمان کرد، هەیان بوو دەنگ و سەدای بە هێز لەناوی بردن، هەیان بوو بە ناخی زەویدا بردمانە خوارەوە، هەشیان بوو نوقمی دەریامان کرد، جا وەنەبێت خوا ستەمی لێ کردبن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان دە کرد.

﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ۝﴾ [البقرة]

واتە: کەچی ئەوانەی ستەمیان کردبوو یەکسەر گوفتارەکەیان گۆڕی بەشتێك بێجگە لەوەی پێیان وترا بوو (واتە بە لووتبەرزییەوە چوونە ژوورەوە)، جا ئێمەش لە ئاسمانەوە سزایەکمان دابەزاندە سەر ئەوانەی ستەمیان کرد بەهۆی ئەوەی لە فەرمانی خوا دەردەچوون.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ۝﴾ [آل عمران]

واتە: بێگومان هیچ شتێک لە خوا ون نابێت نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا.

قورئان زۆری باس کردووە لەم نموونانە کە مرۆڤی ئیماندار بە هۆکاری تاوانکردن سەرگەردان دەبێت و ماڵوێران دەبێت، هەروەها سوننەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ڕێنمایی زۆری کردین لەم بارەیەوە.



هەروەها پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: ئاگاداربن بە چاوی کەم تەماشای تاوان مەککەن، کە تواناى زۆرتان کرد لەسەر مرۆڤ کۆدەبێتەوە بە هەلاکەت و ماڵوێرانی دەبات.[٩٤]

ئەم وەسیەتە گرنگە لەمەڕ شەیتان و بەکەم تەماشاکردنی تاوانە.

مەبەستی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەیەک چاو تەماشای تاوان و گوناهی گەورە و بچووک بکەن، دەبێت مرۆڤ بزانێت تاوان بەرامبەر خودا دەکات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٩٤ ـ إيَّاكُم ومُحقَّراتِ الذُّنوبِ ، فإنَّهنَّ يجتمِعنَ على الرَّجلِ حتَّى يُهْلِكْنَهُ. إمام أحمد والطبراني



## وەسییەتنامەی پێنجەم وازهێنان لە ڕیبا

لە ناو ئەم تاوانانەدا پێغەمبەری خوا ﷺ تاوانێک بۆ ئوممەتەکەی هەڵدەبژێرێت کە ترسناکترین تاوانە، لە وەسیەت نامەککەیدا داوا لە هەموو ئوممەتەکەی دەکات خۆیان بپارێزن، ئەو تاوانەش خواردن و بەکارهێنانی ڕیبایە، فەرمووی:

ڕیبا کۆتایی هات چونکە مامەڵەیەکی جاهیلییە خوای گەورە فەرمانی کرد کە چیتر ڕیبا بەکارنەهێنن. [٩٥]

یاخود لە فەرموودەیەکی تریدا فەرمووی: [٩٦]

هەر دەوڵەتێک بنەمای ئابوورییەکەی لەسەر ڕیبا بوو، ئەوا جەنگ لەگەڵ خوا دەکات و پاشان پێغەمبەرەکەی.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ۝٢٧٨ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ۝٢٧٩﴾ [البقرة]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزکارو خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن.

واتە: خۆ ئەگەر وانەکەن، ئەوە جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ڕابگەیەنن (کە سەرئەنجامەکەی زۆر سامناکە)، خۆ ئەگەر تەوبە بکەن و (لە سووخۆری واز بهێنن) ئەوە تەنها

---

٩٥ ـ (.وَإِنَّ رَبًّا ٱلْجَاهِلِيَّةَ مَوْضُوع).
٩٦ ـ (وَقَضَى اللَّهُ أَنَّهُ لَا رَبًّا).



سەرمایەکانتان بۆ هەیە وەری بگرنەوە، نە ستەم دەکەن (لە قەرزارەکان) نە ستەمتان لێ دەکرێت.

داخۆ لەم بوونەدا کەس هەیە توانای جەنگی هەبێت لەگەڵ خوای پەروەردگاردا؟

بە دڵنیاییەوە خوای پەروەردگار سەربازی خۆی بۆ دەنێرێت و ماندووی دەکات و لەناوی دەبات، جا چۆنە سەربازەکانی و لەچ ڕێگایەکەوەیە ئێمەی مرۆڤ خوێندنەوەیەکی تەواومان بۆی نییە.

زۆر جار سەربازەکە لە شێوەی کارەساتی سرووشتی دێت، یاخود زەمین لەرزە یان ناردنی کولە، ئەنفلۆنزا، کۆڕۆنا، وشکە ساڵی، سەرما و سۆڵە، نغرۆبوونی کەشتییە گەورەکانیان، سووتانی شەمەندەفەر، دابەزینی ئابووری وڵات و پارەکانیان و ژین و بەفیرۆدانی ملیۆنان و ملیارەها پارە، شکستی پرۆژەکانیان، زۆرجار لە ناوچوونی خۆشەویستی و دۆستان، یان خوای گەورە کافر بەسەریاندا سەردەخات یاخود یەهوود، یان مەجوس، هەموو ئەمانە هۆکاری تاوانن، جا بۆیە ڕیبا جەنگ کردنە لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەی.



## وەسییەت نامەی شەشەم بانگەواز و گەیاندن

پێغەمبەری خوا ﷺ جەختی لەسەر گەیاندنی و بڵاوکردنەوە کە ئەرکی سەرشانی وەکو کەسایەتی پێغەمبەرە ﷺ، پاشان ئەرکی ئوممەتەکەی دیاری کرد لە دوای جۆری و شێوەی ئەو بانگەوازە و بەلاغە بە خەڵکی تردا، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە هیدایەتی خەڵکی ئەرکی ئێمەی موسڵمان بێت، بەڵکو ئەرکی سەرشانمان گەیاندنی ئایینەکەیە وەکو خۆی، هیدایەت بەدەست خوای پەروەردگارە، بەڵام کاری گرنگی تێگەیاندنی ئەم بانگەوازەیە بەخەڵکی، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾﴾ [النور]

واتە: پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خواو فەرمانبەرداری پێغەمبەر بن، خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە ئەو تەنها گەیاندنی پەیامی خوای لەسەر شانە، ئێوەش سەرپێچی و یاخی بوونەکەتان لەسەرتان دەکەوێت، خۆ ئەگەر فەرمانبەرداری بن و گوێڕایەڵ و ملکەچ بن بە ڕاستی ئەوە هیدایەت وەردەگرن، دڵنیاش بن کە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر صلی الله عەلیە وسلم تەنها گەیاندنێکی ڕوون و ئاشکرایە و هیچی تر نییە.

﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾﴾ [القصص]

بەڕاستی ئەی پێغەمبەر -صلی الله عەلیە وسلم- تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ئیمانی پێدەبەخشێت، خوایش ئاگادارە بەوانەی کە ڕێبازی هیدایەتیان گرتۆتە بەر

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەی لە حەجی ماڵاوایدا جەختی کردەوە، فەرمووی:



خەڵکینە شاهید بن ئەوەی لامە گەیاندم.[٩٧]

پاشان موسڵمانانی فێرکرد کە ئەرکیان چییە پێی ڕاگەیاندن و فەرمووی: ئەوەی لێرە ئامادەیە پێویستە بیگەیەنێت، بەوانەی کە لێرە نین، بانگەواز بدەن بە گوێی ئەوانەی کە بیستوتانە و یاخود تێیان بگەیەنن.[٩٨]

بە کورتی و پوختی واتا ئەوەی بە گوێی کەوتووە لە خوا و پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم بیگەیەنێت، ئەگەر زانیاری کەمیش بێت، بەم شێوەیە بازنەی خێر و چاکە هەمیشە بەردەوامە جیل لە دوای جیل، تا خەڵکی لە خۆشی ئیمان تێبگات و فێر بێت، ئەوەش گەورەی ئیسلامە کە هۆکارێکی زنجیرەییە بۆ گەیاندن و بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکە، لە ئیسلامدا کەسێکی تایبەت نییە بە گەیاندن و بانگەواز، ئەرکی سەرشانی هەموو خەڵکییە بە ژن و پیاوەوە، هەموو موسڵمانان بانگەواز بکەن بۆ دینی خوا و پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت: لەمنەوە بیگەیەنن ئەگەر ئایەتێکیش بوو.[٩٩]

جا هەرکەسێک شاهیدە و زانیاری پێگەیشت ئەگەر عالمە یان فەقیهە، بیگەیەنێتە خەڵکی تریش.

هاوەڵان زۆر باش لەم حەجە تێگەیشتوون، تێگەیشتنێک کە لە لوتکە دابوو هاوەڵان هەموو لە شاری زێدی خۆیان دەرچوون بۆ بانگەواز و گەیاندن تا توانیان ئەم ئیسلامە بە من و تۆ بگەیەنن.

ئەگەر تێگەیشتنی خالید و قەعقاع و موسای کوڕی نوصیر و محەمەد قاسم و هەزاران شێرە پیاوی تر نەبوایە ئێستا زۆربەی ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقا لە دۆزەخ دابوون، ئەوان ڕۆشتن بە شار و وڵاتاندا خەڵکیان ئازاد کرد لە پەرستنی ئاگر و دار و بەرد و سەرلێشێواوی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٩٧ ـ (أَلَا هَلْ بَلَغَتْ اَللَّهُمَّ فَاشْهَدْ)..

٩٨ ـ (فَلْيَبْلغ الشاهِد الغَائِب، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أوعى مِنَ السّامِعِ).

٩٩ ـ (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَو آيَةً).



خوا جەزای خێریان بداتەوە کە دینیان پێگەیاندین، ئێمەش سەرلێشێواو و گومڕانەبووین و کۆتاییمان ئاگری دۆزەخ بێت.

پێویستە سەرەتا لە خۆمان بپرسین، ئایا چیمان کردووە بۆ وەرگرتنی زانیاری و ئایا بە گوێرەی پێویست هەڵساوین بە گەیاندنی ئەم بانگەوازە و بەلاغە؟

- چەند ئاگاداری ئایەت و ئەحکامین، ئەگەر شارەزایت هەروا ئاسان نییە بێ دەنگ بی و دانیشیت دەبێت بزانیت ئەرکی سەرشانت بەلاغ و گەیاندن و فەرمانی خۆشەویستمان پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

- چەندین کەس لەم کوردستانەدا نازانێت دەستنوێژ بگرێت، تۆ فێرت کردووە؟!

- چەندین کەس لەم وڵات و نیشتیمانەدا زیکری خوا ناکات تۆ چیت کردووە؟!

- چەندین کەس ناتوانێت بە باشی قورئان بخوێنێتەوە، خۆت لەکامەیانی؟!

- چەندین کەس نازانێت لە چاکە و مافی دایک و باوک، چەندت فێرکردوون؟!

- چەندین کەس لە وڵاتەکەماندا نازانێت سیلەی ڕەحم چییە؟!

- ئایە دینی خوامان گەیاندووە؟!

- چەندین کەس لەم شار و وڵاتەماندا هەر نازانن ئیسلام چییە، تۆ چیت ئەنجام داوە؟!

بۆ ئێوە وادەزانن کە خەڵکانێک دژی ئیسلامن و قورئان دەسووتێنن، هیچ شارەزاییان هەیە؟!

تەنها لە ڕێگەی ڕاگەیاندن و گوێبیستنی لە ئیسلام شتێکیان پێگەیشتووە، ڕاگەیاندنێکی مونافیقانە و نەفسییەتە مونحەریفەکان و ئەوانەی کە هەموو ژیانیان بەساختە و تەزویر کردنەوە سەرقاڵ کردووە بۆ پێکێکی شەوانیان،

خەڵکی لەوانە شت فێردەبن بەداخەوە.

لە جیهاندا ملیارێک مولحید هەیە کە هەر بڕوای بە وجودی خوا نییە.



له جیهاندا ملیارێک مانگا دەپەرستن کردوێتی بە هاوبەشی خوا.

له جیهاندا ملیارێک مرۆڤ دەپەرستن بێجگه له خودا.

له جیهاندا ملیارێکی تر خەریکی پەرستنی دار و بەرد و ئەستێره و ئاگره.

ئەی کوا بانگەواز و بەلاغی موسڵمانان؟!

کەواته پێویسته لەسەر موسڵمانان که بانگەواز و بەلاغی ئیسلامەتی له هەموو شار و وڵات و بازاڕ و کوچه و کۆڵانێک دا بگەیەنێت، هەوڵ بدەن له تۆڕه کۆمەڵایەتییەکان، هەر ڕۆژه و فەرموودەیەک یان چەند وتەی زانایان بڵاو بکەنەوه، بۆ ئەوەی له ئەهلی بەلاغ و بانگەواز بیت، خوای گەوره لەوان هەژمارمان بکات.



## وەسییەتی حەوتەم ئاسانکاری و قورس نەکردن

لەگەڵ ئەوەی پێغەمەری خوا ﷺ لەکاتی حەجدا هەموو مەراسیمەکان و دروشمەکانی بە ڕێکوپێکی ڕێکخست، چەند جار دووبارەی کردەوە و فەرمووی: دروشمەکانتان لە من وەرگرن (خُذوا عَنِّي مَناسِكَكُم) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری ئاسانکاری بۆ خەڵک دا و لە ڕۆژی قوربانی جەژندا، هەر پرسیارێکیان لێبکردایە، دەیفەرموو بیکەن و کێشەی نییە (إفْعَل وَلا حَرَج، افْعَل ولَا حَرج).

خۆزگە بە گشتی موسڵمان لە سرووشتی ئەم دینە تێبگەیشتنایە، ڕاستی و دروستی و سرووشتی ئەم دینە ئاسان کرایە، پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: ئەم دینە ئاسانە، هەرکەس دین لەسەر خۆی قورس بکات، شکست دەخوات.[100]

هیچ کەسێک لە پێغەمبەری خوا ﷺ خواناستر و شارەزاتر نەبووە لەسەر زەویدا، هیچ کەس ئەوەندەی جەنابیان جەختی لەسەر دینداریش نەکردۆتەوە، هیچ کەس ئەوەندەی ئەو حەزی بە دینداری نەبووە، بەڵام لە تێگەیشتنی قووڵدا فێرمان دەکات، کە ئایین بە قورسی نەگرین و لەسەر خۆمان ئاسانکاری تێدا بکەین، هەموو بنەماکانی ئەم دینە ئاسانە هەموو خەڵکی بە گشتی دەتوانێت بیکات، بۆ بەهێز و لاوازە، بۆ زانا و نەخوێندەوارە، بۆ ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر و هاوەڵانە، هەروەها بۆ داپیر و باپیرەکانیشمانە.

ئەمەش مانای ئاسانکاری ئایینە، نەک وازهێنان لە نوێژ و ڕۆژوو و ئەحکامەکان بە ناوی ئاسانکاری.

مەبەستیش زیاتر ئەوەیە لە چوارچێوەی ئیسلام دەرچوو خەڵکی ڕادەکەن لە دەستی وەکو ئەم جۆرە خەوارجانەی سەردەم خەڵکی بە ئارەزووی هەوا و نەفسی خۆیان کافر دەکەن.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[100] ـ (إنَّ هَذَا الدِّينِ يَسْرٌ ، وَلَنْ يُشَادَ الدِّينُ أَحَد إلَّا غَلَبَهُ).



ئەوانە شوێنی مەنهەجی ڕاست نەکەوتوون، مەنهەجی ڕاست ڕێگای پێغەمبەری خوایە.





# وەسییەتنامەی هەشتەم گوێڕایەڵی ئەمیرەکەت بە

گوێڕایەڵی ئەمیر و سەرکردە و وەلی ئەمر کارێکی شەرعی و فەرمانێکی خوای و پێغەمبەرەکەتی بەڵام گوێڕایەڵی بۆ ئەمیر و سەرکردەی ناو سیستەمی ئیسلامی نەک عەلمانی و خوانەناسی دوور لە دینی خوا بە وەلی ئەمر و سەرکردەی ئیسلامەتی بزانێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین کە گوێڕایەڵی ئەمیرەکەمان بین ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی بێت، مادام لە ناوتاندا بە قورئان حوکم دەکات.[101]

ئەم وەسیەتە زۆر گرنگە، بەتایبەت لە ناو کۆمەڵگەی عەرەبی لەو سەردەمە جێگای قبوڵکردن نەبوو بەندە فەرمانڕەوایی ئەوان بکات، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ عەرەبی فێری ئەوەکرد و کۆمەڵگەکەی فێری کاری کۆمەڵسازی کرد و ئەم کردارەش پێویستی بە سەرکردەیە، جا لێرەوە سەرکردە بەگوێرەی توانا و هێز و زیرەکی خۆی کاری پێ دەسپێرێت.

کۆمەڵگەیەک ئەگەر ڕێنمایی بکرێت لەلایەن سەرکردەوە، ئەگەر گوێڕایەڵی نەبن چ سوودێکی هەیە و پاشان ئەو کۆمەڵگەیە ئەگەر سەری نەبوو واتا نەگەڕانەوە بۆ لای سەرۆک و سەرکردەکانیان، ئەوا بە دڵنیاییەوە زوو لەناو دەچن.

بە هەرحاڵ گوێڕایەڵی پێویستی بە پەروەردە و گیانی لە خۆبوون هەیە، چونکە هەموو کەس ڕازی نابێ بەوەی کە کۆیلە فەرمانڕەوایی بکات، یاخود هەژار و بێ پارە سەرکردایەتی بکات، یاخود کەسێک خاوەن نەسەبێکی ناسراو و عەشیرەتی بەهێز نییە، ئەمەش پێویستی بە پەروەردەی تایبەتە.

پێغەمبەری خوا ﷺ مانای ئەم لە ژیانیدا ڕوونکردەوە جەختی لەسەر کردەوە، کە پێش هەموو شتێک خەڵکی هەوڵنەدات بۆ سەرکردایەتی و ئەمیر و ئەمارەت بەڵکو زوهدی تێدا بکات، پێغەمبەر ﷺ خەڵکی فێرکرد کە سەرکردایەتی و ئەمارەت بۆ خۆشیی

---

[101] ـ (اِسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنَّ أَمْر عَلَيْكُمْ عَبْدُ حَبَشِي مَا أَقَامَ فِيكُمْ كِتَابُ اَللَّهِ).



نییە بەڵکو تەکلیفە نەک تەشریف، بەرپرسیارێتییە لە دونیا و قیامەتدا، بەخشین نییە، بەڵکو ماندوبوون و کارکردنی جدییە، بەدەستهێنانی بەرپرسیارێتی بۆ بەدەستهێنانی ماڵی دونیا سەر شۆڕییە، پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانانی یەکسان کرد، جیاوازی نەبوو لە نێوان ڕەگەز و ڕەش و سوور و سپی، عەبد و ئازاد و دەوڵەمەند و هەژار، بەڵکو فەزڵ تەنها و تەنها بە تەقوا و خواناسی بوو، دەشێت کۆیلەیەک کە کڕین و فرۆشتنی پێدەکرێت زۆر خواناستر و بە تەقوا تربێت لە پیاوێکی دەوڵەمەند کە خاوەنی ١٠٠ کۆیلەیە!

ئەم پەروەردەیە زۆر سەختە، پێغەمبەر ﷺ کاتی زۆر و ماندووبوونی زۆری بەکارهێنا بۆ بەدەست هێنانی ئەم پرسە، هەرچەند ناتوانم بڵێم خەڵکی ١٠٠٪ قبوڵی کرد، بەڵام جەنابیان دریغیان نەدەکرد، تەنانەت لە ناو هاوەڵاندا زۆرێک قسەیان لەسەر زەیدی کوڕی حارث دەکرد کە خاوەن ئیمارەت بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی نەدا بە کەس کردییە سەرکردەی سوپاکە، بیلالی حەبەشی کردە سەرۆک لە بەیتوماڵ، موسوڵمانانی ئامادە کرد کە گوێی نەدەن بە ڕەگەز و ناو و نیشان و سەروەت و سامان، بەڵکو لەسەر بنەمای لێهاتووی خەڵکی بەکار بهێنن.

مەبەستی پێغەمبەر ﷺ زیاتر لەوە دابوو کە هەر کەس پیادەکەری شەرعی خوا و کیتابی خوا بوو پێویستە گوێی بۆ بگیرێت، بەڵام زۆر جار پێویست دەکات کە خاوەن هێز و توانا و عەشیرەت حوکمڕانی بکات تا موسڵمان گوێڕایەڵی بێت، جادەکرێت لەسەر بنەمای بیروباوەڕ کۆبنەوە لەگەڵ ئەمیرەکان، یان لەسەر بنەمای هیوا و توانای زۆری خەڵکی بەڵام مەرج بۆ هەردوو لاکە خاوەن بیروباوەڕی ئیسلامی بن، حوکم کردن لە ئیسلامدا ئامانج نییە، بەڵکو هۆکارە بۆ قیامەت بۆ چوونە بەهەشتی خەڵک، بۆ پیادەکردنی حوکمی خوا، مەرجە ئەو کەسەی دەبێتە ئەمیر پیادەکەری شەرعی خوا بێت و پێغەمبەری خوا ﷺ کردوێتییە مەرج و دەفەرمووێت دەبێت حوکم بە قورئان بکات (مَا أَقَامَ فيكُم كِتَابَ الله).

ئوممەتی ئیسلام ئەرکی سەرشانی ئەوەیە کە خەڵکی فێری بەندایەتی بکات بۆ خوای پەروەردگار، بەلای کەمەوە بانگەوازی خەڵکی بکەن بۆ بەندایەتی خوای موتەعال.

ئەم بانگەواز و ئوممەتە پێویستی بە سەرۆک و سەرکردە و ئەمیر هەیە کە دەبێت بۆ شەرعی خوا بانگەوازی بکات نەک بۆ شوعی و سەرمایەداری و عەلمانی و دیموکراسی.



خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ۝﴾

واتە: (کاتێک هەندێک لە زاناکانی جوو، هاتن بۆ لات تا داوەریی بکەی لە نێوانیاندا)، داوەری بکە بەو بەرنامەیە (قورئانە)ی کە لەلایەن خواوە بۆت دابەزیووە، شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، وریابە نەوەکو ئەوان ڕێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێک لەو ڕێنموویيانەی کە خوا بۆی ناردوویت (جا ئەگەر ئەو جوولەکانە ڕازیی نەبوون) و پشتیان هەڵکرد، ئەوە بزانە بەڕاستی خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێک لە گوناهەکانی خۆیانیان بکات، بێگومان زۆربەی خەڵکی یاخی و سەرکەش و تاوانبارن.

هەر ئەحکام و یاسایەک دژی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر بوو ﷺ ئەوە جاهیلیەتە، پێویستە دوای نەکەوین و گوێی بۆ نەگرین، گوێڕایەڵی نەکەین، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ۝﴾ [المائدة]

واتە: ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گوێڕایەڵی هیچ کەس مەککەن لە دژایەتی خوا و گوناح و تاوان بەڵکو گوێڕایەڵی تەنها لە کاری چاکدایە.[١٠٢]

---

١٠٢ ـ (لَا طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ ٱلْخَالِقِ).



هەروەها یەکەم ڕۆژی دەستبەکاربوون ئیمامی ئەبوبەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- لە خیلافەت فەرمووی: گوێڕایەڵیم بکەن کە لەناوتاندا بە قورئان حوکمڕانیم کرد، ئەگەر من سەرپێچیم کرد، ئێوەش گوێم بۆ مەگرن.[١٠٣]

هەموو ئەم فەرموودە و ئایەتانەی کە باسمان کرد، شتێکی زۆر گرنگ بۆ ئێمە باس دەکەن خاڵی جەوهەری ئەوەیە کێشە نییە کێ حوکمڕانیت دەکات بەڵام گرنگە بە شەرعی خوا و کیتابی خوا و سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم حوکمڕانی بکات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٠٣] ـ (أطِعُونِي مَا أقَمْتُ فيكُم كِتابَ الله، فَنْ عَصَيْتُه فَلا طَاعَةَ لِي عَلَيْكُم).



## وەسییەت نامەی نۆیەم یەکسان بوون لەبەردەم شەرعی خوادا

یەکسان بوون لەبەردەم یاسادا، جیاوازی نەکردن لە نێوان حاکم و مەحکومدا، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ لە وتاری حەجیماڵاواییدا ئەو وەسیەتەی بۆ کردین لە پیادەکردنی یاسای شەرعی خوادا شەفاف بێت.

فێرمان دەکات کە حاکمیش هەر یەکێکە لەو گەل و خەڵکەی ئەم نیشتیمانە، هیچ فەزڵێکی نییە هیچ کەس فەزڵی بەسەر کەسێکی ترەوە نییە، ئەگەر بە خواناسی و تەقوا نەبێت، هەموو لەبەردەم یاسادا یەکسانن، هیچ کەس پارێزبەن خاوەن (حەصانە) و تایبەتمەندی نییە، (VIP) نییە.

ئەوکات جیاوازی لە نێوان دەسەڵاتداران و خەڵکیدا بە گشتی کرا ئەوە ئوممەت شکست خواردوو دەبێت.

ئەگەر خەڵکی لەبەردەم یاساوە هەموو وەکو یەک نەبن، ئەوا گومان دروست دەبێت و لاوازی لە دڵی خەڵکیدا دروست دەبێت و خەڵکی ڕق و کینە هەڵدەگرن، لەمەولا هیچ ڕێز و ئینتیما بۆ دەوڵەتی ئیسلامی نامێنێت، ئیتر لەگەڵ ئەوکات هەست بە چەوسانەوە دەکات و هەوڵی شۆڕش و بەرخودان ئەدات.

ئەمەش لە ڕێز و نرخ و بەها و یاسا و شەرع کەم دەکاتەوە، ئەگەر هەموو یەکسان نەبن لەبەردەمیدا، دەسەڵات لاواز دەکات، دەبێتە هۆکاری لە ناوچوون و لەناوبردنی گەلان و ئوممەتەکە.

بیرتانە ڕستەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ کە هەموو قسەکانی حیکمەتە لە کاتی فەتحی مەککەدا کە ئافرەتێکی دەوڵەمەندی خاوەن نەسەب دزی کرد، جەنابیان فەرمووی گەلانی پێشتر کە لەناو چوون بە هۆکاری ئەوە بوو، ئەگەر لە ناویاندا دەوڵەمەند و خاوەن شەرەف گەورەکانیان وازیان لێدەهێنن، بەڵام یاسایان لەسەر هەژار و لاوازەکان پیادە دەکرد، ئەویش هۆکاری لەناوچوونیان بوو.



جا هەر لە وتاری ماڵاوایيدا هەموو یاسای جاهیلی کۆتایی پێ هێنا، یەکەم دەستپێک پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە بنەماڵەی خۆیەوە دەستی پێکرد و فەرمووی: (خوێنی جاهیلییەت کۆتایی هات واتا ئەوانەی پێشتر کوژراون و بەدوای تۆڵە سەندنەوەدان کۆتایی هات، ئیتر یاسا و ڕێسای ئیسلامی حوکمڕانی دەکات، جا داوای کرد و فەرزی کرد کە هەرچی تۆڵەسەندنەوەی جاهیلییە کۆتایی پێدێت و فەرزی کرد بەسەر موسڵمانان فەرمووی: یەکەم خوێنی جاهیلی وازمان لێهێنا خوێنی ئامۆزاکەم ڕەبیعی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەڵیبە کە کەسێکی تر کوشتی بەناوی (هوزەیل).[١٠٤]

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی وازی هێنا لە خوێنی ئامۆزاکەی کە لە جاهیلیەتدا کوژرابوو، بنەماڵەی عبدولموتەڵیب وازیان لەو خوێنە هێنا، هەمووان دەزانین کە تۆڵە سەندنەوە لای عەرەب چەند گرنگ بووە، تەنانەت بە شەرەفیان دەزانی، بۆ ئەوەی پاشاگەردانی و هەڕەمەکی دروست نەبێت واز لە ژینگەی هۆزگەرایی بهێنن، هەموویانی هاندا بۆ پیادەکردنی یاسا و شەرعی خوای گەورە.

پاشان لە باسی ڕیبادا، یەکەم کەس لە عەباسی مامییەوە دەستی پێکرد، هەموو وجودی عەباس لەسەربنەمای ڕیبا بوو، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە ڕووی ڕیبا کۆتایی هات، یەکەم ڕیبا وازی لێدەهێنن ڕیبای عەباسە و کۆتایی هات.

چونکە یاسای ڕیبا زۆر بەربڵاو بوو، عەباسی مامی بە هۆکاری ئەوەی زۆر سەروەتی کۆکردبووەوە لە دوای دابەزینی ئەو یاسایە لە ئیسلام دا حەرامکردنی یەکەم کەس بەسەر عەباسی مامی دا پیادەی کرد، بۆ ئەوەی خەڵکی بزانن جیاوازی لە نێوان حاکم و مەحکومدا نییە، لە نێوان دەوڵەمەند و هەژاردا نییە، لەبەردەم یاسادا هەموو یەکسانن.

توخوا کام یاسا هەیە لەم دونیایە دا ئەوەندە دادپەروەر بێت؟!

ئیسلام دینێکی واقیعییەو جێگای جێبەجێ کردنە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٠٤] ـ وإن أول دم أضع من دمائنا، دم إبن ربيعه إبن حارث بن عبدالمطلب.



## وەسییەتی دەیەم خزمەتکردنی هاوەڵانی و پڕۆژەی خزمەتگوزاری دنیا و قیامەت

دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر دوو پرس کار دەکات پرسی سەرەتایی ئەوەیە کە کار و نان و خۆشگوزەرانی و ڕێگاوبان و کەرتی تەندروستی و خوێندن و...هتد، بۆ هاوەڵانی دابین بکات، خوای گەورە لەسورەتی قورەیشدا لە کۆتاییدا دووکاری خزمەتگوزاری زۆر گرنگ کە پێداویستی سەرەتایی هەموو گەلێکە دەگرێتە ئەستۆ، ئەویش نان و ئەمانە (الَّذِي أَطْعَمَهُم مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُم مِنْ خَوْفٍ).

ئەمەش دروشم و قسەیەکی هەروا نییە بەسەردا تێپەڕیت، بەڵکو لە ڕووی مەیدانییەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پیادەی کردووە کە دەوڵەت دامەزراندن، کاری ئابووری و بازار و بازرگانی ڕێکخستن لە شاری مەدینەدا، پڕۆژەی خزمەتگوزاری دامەزراند وەکو دابینکردنی ئاو، پاشان دروستکردنی مزگەوت و هەر لەناو مزگەوتەکەدا کەرتی تەندروستی دامەزراند.

بەڵام لەمانە گرنگتر پرسی دووەمی دەوڵەتی ئیسلامییە کە ژینگەیەکی لەبار و حەڵاڵ ئامادە بکات بۆ هاوەڵانی تا بەرەو بەهەشتیان بەرێت، چۆن دنیایان ئاوەدان دەکاتەوە بە هەمان شێوە قیامەتیش ئاوەدان دەکاتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم کاری لە وتاری ماڵاوایدا پرسە گرنگەکانی دەوڵەت بوو لە کاری خزمەت کردن و خزمەت گوزاری دنیا و قیامەت، جەختی کردەوە و فەرمووی: ئێوە خوای گەورە دەتانگەڕێنێتەوە و لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکات لەسەر کردارەکانتان کە ئەنجامتان داوە.

دەوڵەتی عەلمانی تەماشای پرسی دووەم دەکات، گوێ نادات بەوەی گەل بەرەو کوێ دەڕوات، بۆ جەهەنەم دەچێت یان هەر شوێنێک و دۆڵێک لای گرنگ نییە، تەنها بۆ ئەو گرنگە دونیا ئاوەدان بکاتەوە.



دەوڵەتی ئیسلامی ئەو دید و تێڕوانینەی نییە، بەڵکو ئەوە دیدێکی زۆر سەرەتایی و بێ ئەرزشە، دەوڵەتی ئیسلامی ئەرکی سەرشانی هیدایەتدانی خەڵکییە بۆ دینی خوا و کاری چاکە و پڕۆژەی پڕ بایەخ بۆ لای پەروەردگار.

هەروەها لەسەریەتی کە ئەوانەشی موسڵمان نین هیدایەتیان بدات، ڕزگاریان بکات لە دنیا و قیامەتدا ئەوە ڕۆڵی سەرەکی دەوڵەتە، کە ئەم کارە ڕوویدا دڵسۆزی خەڵک فوارە دەکات و ژیان لە سایەی ئەو دەوڵەتەوە پێش دەکەوێت، ئەم هاوکێشەیە ئۆتۆماتیکی ڕوو ئەدات، ئەزموونی ١٠٠٠ ساڵ لەبەردەم دایە لە ئەندەلوس لە بەغدا و لە سەمەرقەند, لە میسر, لە دیمەشق, لە ئیستانبوڵ, لە هیندستان...هتد.

ئەم بەرپرسیارێتییە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتییە ئەستۆی لەبەردەم گەلەکەیدا، لە دنیادا دەوڵەتی بۆ دامەزراند و جیهادی کرد و قەڵەمڕەوی فراوان کرد، بەڵام پێشنوێژی دەکرد و لەگەڵیاندا بە ڕۆژوو دەبوو وە حەجی ماڵاوایی بۆ کردن.

ئەمە ئەم دە خاڵە بوو، یاخود ئەو دە پرەنسیپە گەورەیە بوو کە لە حەجی ماڵاوایی پێشکەشم کردن لە کتێبی فەرغەلییەوە سەرچاوەی گرتبوو.

بۆیە باسی ڕووداوی نێوان خۆم و نومەیر و ڕاغیبم نەکرد لە بەرگی ٤ی کتێبی نوور دا، بە هۆکاری زۆری باس و ڕووداوەکان، هەروەکو ئاماژەم پێداوە بە هۆکاری گیرفانی گەنجان و توانا و هێزی خوێندنەوەیان بۆ ئەوەی زیاتر باسەکان درێژ نەکەمەوە، ئەوەی لاوەکی بوو وازم لێهێناوە ئەوەی جەوهەری بوو بۆ ئێوەم گواستۆتەوە.

خوای گەورە لێمان قبوڵ بکات، ئامین.



# غەدیری خوم

لە دوای حەجی ماڵاوایی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ ناو شاری مەدینە، لە ڕێگادا لە جێگایەکدا، کە شوێنی پشووی ڕێبواران و حەسانەوەی ماندوێتی کاروانچیان بوو لە ڕێگای مەککە بۆ شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو جێگایەدا لایدا و ئەوانەی لەگەڵیدابوون زۆربەیان خەڵکی شاری مەدینە بوون.

ئەو خەڵکە لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵایان لەسەر ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب تۆمارکرد بوو.

ڕووداوەکە بریتی بوو لەوەی کە خالیدی کوڕی وەلید هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا لە یەمەن شەڕێک ڕوویداوە غەنیمەتێکی زۆر دەست سوپای موسڵمانان کەوتووە، بەڵکو کەسێک بنێرێت وەکو (قاضی) بۆ دابەشکردنی پێش چوونی بۆ حەجی ماڵئاوایی، ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی ڕاسپارد کە بڕوات بۆ یەمەن و پێشی فەرموو کەوا نەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، بەڵکو ڕاستەخۆ بڕوات بۆ مەککە لەوێ لەکاتی حەج دا یەکتری دەگرینەوە، دوای ئەوەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ڕۆشتە ئەوێو بوو بە ئەمیریان و غەنیمەتەکەی بەش کرد، یەکێک لە غەنیمەتەکان ئافرەتێک بوو کەوتە دەستی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و کردیە جاریەی خۆیی و شەو لەگەڵیدا خەوت، بەم هۆکارە لەوێ ڕای جیاواز کەوتبووە نێوان هاوەڵان لە سەردابەشکردنی غەنیمەتەکە یەکێک لەوانە میقداد بوو کە گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وت؛ یا رسول الله ﷺ عەلی بەبێ ئەوەی لەشەڕەکەدا بەشدار بێت کە هات ئەم ئافرەتەی کرد بە جاریەی خۆیی و لەگەڵیشیدا جووت بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار ڕووی لێ وەرگێڕا و هیچی نەوت، تا لە کۆتاییدا فەرمووی: ئەوەی کە عەلی کردوویەتی هێشتا کەمە، واتا لەبەشی خۆی کەمتری بردووە، چونکە ئەوان لە ذی القربان، واتا لە ئالوبەیتن و ئالوبەیتیش خومسیان بەر ئەکەوێت، واتا لە پێنج بەش بەشێک بۆ ئالوبەیتە، بۆیە میقداد کۆتایی دێنێت بەو بابەتە. لەو خومسەی کەوا بەر پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبوو، هەندێك وشتر بوو کە ویستیان لە مەککە بیکەنە قوربانی، بۆیە بە کاروانەکەی وت کەس سواری ئەم وشترانە نەبێت بۆ قوربانی ئامادەم کردووە.



بەڵام کۆمەڵێک لەوێ سەرپێچییان کرد لە فەرمانی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، ئەویش زۆر توڕەبوو بە هۆکاری سەرپێچییەکەیان و چەند قامچییەکی وەشاندبوو.

سکاڵایان بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هێنا ئەوانەی قامچییەکانیان بەرکەوتبوو خەڵکی شاری مەدینە بوون، پێشتریش پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لێپرسینەوەی لەگەڵ ئیمامی عەلی کردبوو.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەوێدا بۆ هەموویانی ڕوونکردەوە کە ئەوەی ئیمامی عەلی ئەنجامی داوە حەقە، نەدەبوو وشتری قوربانی بۆ کاری خزمەتگوزاری بەکاربهێنن، لەوێدا باسی ئەوەی کرد ئیمامی عەلی ئەمیر بوو دەبوو گوێڕایەڵی بکەن، لەگەڵ ئەمیرەکەیدا ئیمامی عەلی ئالوبەیت و ئەهلی کیسا و واتا ئەهلی ژێر عەبای موبارەکی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جا لەو جێگایەدا کە ناسراوە بە غەدیری خوم ئەو کێشەیەی چارەسەر کرد پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

### گرنگی باس چییە؟!

زۆرێک لە موسڵمانان لە ڕێگەی شیعەوە مەفتوون بوون بەوەی کە گوایە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئیمامی عەلی لەو جێگایەدا لە دوای خۆی بە خەلیفەی داناوە، ئەمەش هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە، چونکە ئەگەر بیکردایەتە خەلیفە لە ناو حەج دا باسی دەکرد کە ١٣٠ هەزار هاوەڵ گوێیان بۆ گرتبوو، نەک لە جێگایەک دا کە هەمووی ٣٠ کەسە، پاشان ئەو جێگایە لە ئێستادا بۆتە جەژن لای هەندێک، هەموو ڕووداوەکانی ئەو جێگایە چەند کاتژمێرێک بووە پاشان موسڵمانان گەڕاونەتەوە بۆ ناو شاری مەدینە و کۆتایی بەو کێشەیە هات کە سکاڵا لەسەر ئیمامی عەلی تۆمارکرابوو.

پێغەمبەر هەموویانی بەوە ڕازی کرد کە ئیمامی عەلی لەوە و پارچەیەکە لە پێغەمبەر.[١٠٥]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٠٥] في أحد الصَّحيحين - البخاري ومسلم - بل الذي في صحيح مسلم ليس فيه التمسُّك بالعِترة ولا بالسُّنة، بل فيه التمسُّك بالكتاب، والوصيةُ بالعترة، ولفظُه: أنا تاركٌ فِيكم ثَقَلينِ: أوَّلهما: كتابُ الله، فيه الهُدى والنُور؛ فخُذوا بكتاب الله، واستمسِكوا به، فحثَّ على كِتاب الله ورغَّب فيه، ثم قال: وأهلُ بَيْتي، أُذكِّركم اللهَ في أهلِ بيتي،



## ئامادەکردنی سوپا بۆ سەر ڕۆم

**پێغەمبەری خوا** صلى الله عليه وعلى آله وسلم دوای سێ مانگی لە شاری مەدینە واتە مانگی ذی لحیجە و موحەڕەم و سەفەری ساڵی ١١ کۆچی لە شاری مەدینە منەوەرە بوو لەو ماوەیەدا هەواڵی والی (معان)ی پێگەیشت کە شەهید کراوە لە لایەن ڕۆمەوە.

**پێغەمبەری خوا** صلى الله عليه وعلى آله وسلم خێرا سوپای ئامادەکرد بەسەر ڕۆم، ئەمە بۆ جاری سێیەمە سوپا ئامادە دەکات بۆسەر دەوڵەتی ڕۆم، جارێک لە موئتەدا بوو، جاری دووەم لە تەبووک، وا **پێغەمبەری خوا** صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەمجارەش سوپای بەهێز و گەورەی ئامادەکرد بۆ سەر ڕۆم و ناوچەکانی بندەستی ڕۆم بەسەرکردایەتی (ئوسامەی کوڕی زەید کوڕی حارس)، ئەمەش پیادەکردنی واقعی موسڵمانانە کە لە حەجی ماڵاواییدا ئاماژەی بە گوێڕایەڵی ئەمیردا، بەڵام زۆرێک لە ڕووی نەفسی و دەروونییەوە قیادە و سەرکردایەتی (ئوسامەی کوڕی زەید) یان پێ قبوڵ نەبوو، زیاتر بە هۆکاری ئەوەی لاوێک بوو تەمەنی لە ١٨ تێپەڕی نەکردبوو.

**پێغەمبەری خوا** صلى الله عليه وعلى آله وسلم جەختی لەسەر ئەمیرێتی کردەوە و بە خەڵکی ناو سوپاکەی فەرموو: تانە ئەدەن لە ئەمیرایەتی زەید و پێشتریش تانەتاندا لە ئەمیرایەتی باوکی (بەهۆکاری ئەوەی کۆیلە بوو)، سوێند بەخوا دەڵێیت خوای گەورە بۆ ئەمیرایەتی خەڵقی کردووە.[١٠٦]

**پێغەمبەری خوا** صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەم ئەمارەتەی ئوسامە دوو بایەخی گرنگی گەیاند:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

أُذكِّركم اللهَ في أهل بيتي، أُذكِّركم الله في أهلِ بَيتي (تَركتُ فِيكم الثَّقلين، ما إن تمسَّكتُم بهما، لن تضلُّوا: كِتابَ اللهِ، وعِترتي أهلَ بيتي)

١٠٦ ـ (أَمَّرَ رَسُولِ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُسَامَةَ عَلَى قَوْمٍ فَطَعَنُوا فِي إِمَارَتِهِ، فَقَالَ: إِنْ تَطْعَنُوا فِي إِمَارَتِهِ فَقَدْ طَعَنْتُمْ فِي إِمَارَةِ أَبِيهِ مِنْ قِبَلِهِ ، وَاَيْمُ اَللَّهِ لَقَدْ كَانَ خَلِيقًا لِلْإِمَارَةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَحَبِّ اَلنَّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ هَذَا لَمِنْ أَحَبِّ اَلنَّاسِ إِلَيَّ بَعْدِهِ).



یەکەم: گرنگ نییە سەرکردە کێیە و نەسەبی چییە و لەکام بنەماڵەیە، یاخود تەمەنی چەندە، بەڵام گرنگە خاوەن توانا و هێزبێت لە بواری سەربازیدا، پاشان پیادەکردنی قورئان و سوننەت بێت لە هەموو هەڵسوکەوتێکیدا.

ئەمەش بیرو بۆچوون و دید ڕوونیمان ئەداتێ سەرکردایەتی لە بنەماڵەدا یان لە خەڵکی دەوڵەمەند و خاوەن نەسەبدا کۆنەبۆتەوە و هەموو کەس توانای سەرکردایەتی هەیە.

دووەم: توانا و چالاکی لاوانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ متمانەی پێیەتی، زۆر لەوەش زیاترە تواناکانیان کە بەخەیاڵماندا دێت، هەر لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جاری دووەم کوڕی زۆر گەنج دەکاتە ئەمیری سوپاکە، هەروەها ئاسان نییە ئەو سوپایە بڕوات بۆ ناو ڕۆم، چارەنووسی سوپایەک ناخاتە مەترسی، ئەگەر دڵنیایی تەواوی نەبێت لە ئوسامەی کوڕی زەید، ئەو سوپایە دەیان سەربازی گرنگی لە ژێر دەستدایە، نموونەی ئیمامی (ئەبوبەکر و عومەر و خالید و ...هتد) کە هەمووی سەرکردەی سەرەتایی و بەتوانا بوون.

سوپاکە ئامادەبوو لە مانگی سەفەری ساڵی ١١ کۆچی لە شاری مەدینە دەرچوون و بەرەو ڕێگای شام کەوتنە ڕێ ئەم سوپایە بۆ فەڵەستین و ناوچەی غەززە ئامادە کرابوو، بەڵام لە دووری ٥٠ کم هەواڵی نەخۆشی پێغەمبەریان پێگەیشت و سوپاکە لە جێگای خۆیدا زیاتر نەڕۆیشت بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیابن لە تەندروستی پێغەمبەری خوا ﷺ.



## نەخۆشی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ

سەرەتای دەستپێکی نەخۆشکەوتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا لە ئێستادا لە سەخترین بەشی سیرەتی پێغەمبەری خوادایین صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، لە ئێستادا باسی مردنی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەکەین، گەورەترین ئازار و سوێیە کە گەیشتووە بە دڵی هاوەڵان و پاشان موسڵمانان بە گشتی، ئێستا بەندە کە باسی ژیانی بۆ خوێنەرانم دەکەم دڵ پڕ لە گریان و چەندە ناسۆر گەیشتووە بە دڵم، داخۆ هاوەڵان چۆن بووبێتن لەگەڵ ئەم پێغەمبەرە ئازیزەدا، بە ڕاستی خۆمان پێناگیرێت لە کاتی باسکردنیدا، یان کاتێک دەیخوێنینەوە و ڕووداوی وەفاتی جەنابیان.

گەورەترین موصیبەتە کە بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتووە لە دروستبوونی ئەم بوونەوەرە تا کۆتایی قیامەت.

نەک لەبەر ئەوەی تەنها و تەنها یەکێک بوو لە گەورەی پێغەمبەران و سەید و گەورەی مرۆڤایەتییە و ئیمامی هەموو پێغەمبەرانە، نا بەڵکو لە دوای جەنابیان وەحی کۆتایی هات، واتا کۆتایی ئەبەدی تا ڕۆژی قیامەت، موصیبەتێکی زۆر گەورەیە، چونکە پەیوەندی ڕاستەوخۆی مرۆڤ بە خواوە کۆتایی هات، پەیوەندی سەرزەوی کۆتایی هات بە ئاسمانەوە کۆتایی هات بە ژیانی فریشتەوە، لەبەر ئەوە گەورەترین موصیبەت و ناڕەحەتییە.

خوای مەعبوودم هێز و توانا بدە تا بتوانم بە جوانترین شێوە باسی بکەم لەم زیندانەدا.

هاوەڵان ئارامگربوون کە باسی ئەوە دەکرا وەحی کۆتایی پێهاتووە توانایان نەما و هەموو دەستیان کرد بە گریان، چونکە دەیانزانی لە قەیران گەورەتر و بۆتە موصیبەتێکی گەورە وەفاتی پێغەمبەری خوا.

ئای پێغەمبەر گیان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەم زیندانەدا چەندە خۆشحاڵ بووم لە خزمەتی جەنابتان سالّم بردە سەر وا ئێستا چاو پڕ لە گریانم منیش بۆ ئەو هەموو سات و کاتە خۆشانە لە خزمەت خۆت و هاوەڵە بەڕێزەکانتا بووم.



توخوا بمبەخشە خوای پەروەردگارم، ئەگەر کەموکورتیم هەبوویێت لە باسکردنی پێغەمبەرەکەت، بەڵام سوێند بەخۆت، پێغەمبەرەکەتم خۆش دەوێت، چونکە ئاراستەی وەحی زاتی بەرزتە.

کەواتە کێشە گەورەکە ئەوەیە کە کۆتایی بە وەحی هات لە سەر زەویدا، ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر لەکاتی وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستانی پێغەمبەریان بەسەر دەکردەوە، چوونە خزمەتی ئافرەتێک بەناوی دایکی ئەیمەن، چونکە پێغەمبەر ﷺ زۆر کات سەردانی دەکرد، چوونە لای وتیان وا پێغەمبەر ﷺ لەلای خالقی خۆیەتی دڵنەوایی دایکی ئەیمەنیان کرد، ئەویش وتی: دڵتەنگ نیم بۆ مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە هەموو دەبێت بمرین، بەڵام دڵم تەنگە لەبەر ئەوەی وەحی کۆتایی هات تا ڕۆژی قیامەت لەسەر زەوی، لەبەر ئەوەی لە دوای پێغەمبەر محمد ﷺ هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت ئیتر ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر خۆیان پێ نەگیرا دەستیان کرد بەگریان، هەرسێکیان بەیەکەوە دەستیان کرد بەگریان.

٢٣ ساڵ هاوەڵان لەگەڵ وەحی دا ژیان و هەواڵیان لەلای خوای گەورەوە بۆ دەهات لە هەموو کات و ساتێکدا و لە جێگاکاندا و لە قەیرانەکاندا، هەمیشە پەیوەندی زەوی و ئاسمان بەیەکەوە گرێدرابوو، ئەو پەیوەندییە ڕێگا ڕۆشنکەرەوە و چاوڕوونی و موسڵمانان بوو، بەبێ وەحی ئەستەم بوو موسڵمانان بیانزانیایە.

هەروەکو ئاماژەم پێدا، ڕۆژێک و هەفتەیەک و مانگێک نەبوو بەڵکو ٢٣ ساڵ بەردەوام بوو ڕێگایەکی دوورو درێژ و قووڵ بوو، ڕێگا نیشاندەریان بوو، کردنەوەی بیر و هۆشیان بوو دڵنەوایی و هێمنی دڵ و دەروونیان بوو.

ڕاستە ئیماندار هەڵە دەکات و زوو دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای خۆی، بەڵام هەندێک جار ڕاستی لەگەڵ درۆدا تێکەڵ دەبێت و زۆرجار مرۆڤ ناتوانێت بزانێت ڕاستی لە کوێدایە، زۆرجار مرۆڤ بڕیارێک ئەدات کە پێی وایە ڕاستییە و شەرعییە، بەڵام نازانێت حەقە یان باطڵە، بەڵام لەسەردەمی ڕۆژانی وەحی دا ئەو کێشەیە نەبوو، ڕەوشەکە جیاواز بوو، خێرا حەق ڕوون دەکرایەوە و درۆ و چەواشەکاری دەناسێنرا بە هۆکاری دابەزینی وەحی، تەنانەت بۆی ڕوون



دەکردینەوە کامە چاکە و کامە چاکترینە، کامە باشە و کامە باشترینە، بەڕاستی ژیان لە سایەی وەحی دا زۆر عەجیب و سەرسوڕهێنەر بوو.

ڕاستە خوای پەروەردگار مەنهەجێکی بۆ ناردووین, حەڵاڵ و حەرامی تێدا ڕوون کردۆتەوە تاڕادەیەک، بەڵام هەر ناگات بە ڕۆژانی وەحی.

وەحی بۆی ڕاستەکردنەوە لە بەدردا کە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەمیردا بکەن لە بەدردا یان لە مانگی ڕەجەب دا بۆی ڕوون دەکردنەوە کە لە مەفرەزەی نەخلە بۆی ڕوونکردنەوە وەحی هیچ ڕای جیاوازی نەدەهێشت.

یاخود پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو بە هاوەڵانی، خوای گەورە دەفەرمووێت کە فەرمانی پێکردووە ئوبەی کوڕی کەعب قورئان بخوێنێت بۆم.

ئوبەی دەیووت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوای گەورە ناوی هێناوم؟!

هەموو دڵخۆش دەبوون یان جارێکیان جوبرائیل فەرمووی ئەوە خاتوو خەدیجە هات بۆڵات خواردنی بۆ هێناویت، خوای گەورە سەلامی لێدەکات و پێی بڵێ لە بەهەشت ماڵێکی هەیە بێدەنگ (هێمن)و خۆش.

یان فەرمووی بە بیلال گوێم لە خشە و دەنگی نەعلەکانت بوو لە بەهەشتدا!

هەموو ئەمانە و هەزاران نموونەی تری ئاوا هاوەڵان لەگەڵیدا ژیان و فریشتەیان بە چاوی خۆیان بینی لە جەنگی بەدر و ئەحزاب و حونەین دا یاخود هاوەڵان بە چاوی خۆیان جوبرائیلیان بینی.

یان هەواڵی داهاتوویان پێ ئەدرا، هەواڵی سەرکەوتنیان لە بەدر و سەرکەوتن لە ئەحزاب و پاشان مژدەی لەناوچوونی ئەبو جەهل و وەلیدی کوڕی موغیرە و ئومەییەی کوڕی خەڵەف و...هتد.

وەعدی فەتحی مەککەی دا بە وەحی.

وەعدی فەتحی فارس و ڕۆم و یەمەنی دانێ.



لەگەڵ ڕووێکدا ژیان هاوەڵان کە چاودێرییان دەکرد دەهاتە دی.

هاوەڵان لە دوای وەفاتی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەبێت کار بە قورئان و سوننەت بکەن بە ئیجتیهادیان، بەڵام هیچ هەواڵێک لە ئاسمانەوە بۆیان نایەت بۆ ڕاست کردنەوە.

ئەزموونێکی نوێ دەژین نازانن لەچی ڕاست و دروستە و پێکاویانە و لە چیدا هەڵەیان کردووە، ئەوەش ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگارە، لەمەولا نازانن کێ ئەهلی بەهەشتە و کێ ئەهلی ناو دۆزەخ لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم، بەڵام لەسەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وعلى آله وسلم، هەموو دەزانرا.

بەڕاستی فیتنە و موصیبەتێکی زۆر گەورە بوو وەفاتی خۆشەویستمان پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم تەنانەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئامۆژگاری ئومەتەکەی دەکات و دەفەرمووێت ئەی خەڵکینە (لە ئێوەی ئیماندار) ئەگەر تووشی موصیبەت هاتن با موصیبەتەکەی ـ پێوەر بکات بە موصیبەتی خەڵکانی تر کە موصیبەتەکەیان بەرزترە، یاخود موصیبەتەکەی پێوەر بکات بە وەفاتی جەنابی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم کە گەورەترین موصیبەتە.[١٠٧]

هاوەڵان پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە هەموو شتێک زیاتر خۆش دەویست، لە ماڵ و منداڵ و برا و ژن و کەس و کار، بەڵکو لە خۆیان زیاتر خۆشیان دەویست، ئەو هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە هۆزی بەنو دینار بوو لە جەنگی ئوحود دا باوک و براکەی و مێردەکەی شەهید بوبوون، لە دوای هەواڵی ئەو سێ خۆشەویستەی وتی ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم وەزعی چۆنە؟!

وتیان: سوپاس بۆخوا باشە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٠٧ ـ (يَا أَيُّهَا ٱلنَّاسُ! أَيُّمَا أَحَدٍ مِنْ ٱلْمُؤْمِنِينَ أُصِيبَ بِمُصِيبَةٍ، فَلْيَتَعَزْ بِمُصِيبَتِهِ بِي، عَنْ ٱلْمُصِيبَةِ ٱلَّتِي تُصِيبُهُ بِغَيْرِيٌّ، فَإِنَّ أَحَدًا مِنْ أُمَّتِي، لَنْ يُصَابَ بِمُصِيبَةٍ بَعْدِي أَشَدَّ عَلَيْهِ مِنْ مُصِيبَتِي).



ئافرەتەکە فەرمووی پیشانم بدەن! کاتێک بینی ئینجا فەرمووی لە دوای سەلامەتی جەنابیان هەموو موصیبەتێک ئاسانە.

ئەو هاوەڵە بەڕیزە ڕاستی فەرموو، چونکە خاوەنی ئیمانی کامل بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆی و باوک و مێردەکەی و براکەی خۆشەویستر بوو لای.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ئیمانی نییە لە ئێوە تاکو منی لە باوک و منداڵ و هەموو کەسێک خۆشتر نەوێت.

لە جێگای تردا فەرمانمان پێدەکات کە لە خۆمان خۆشترمان بوێت.

ئیمامی عومەر فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆم لەهەرچی شت و کەس و کارمە خۆشتر دەوێت، تەنها خۆم نەبێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، دەبێت منت لە نەفسی خۆت خۆشتر بوێت.

ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەوە ئێستا تۆم لە خۆم خۆشتر دەوێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە ئیمانت کامل بوو ئەی عومەر.

بەهەرحاڵ موصیبەتی مردنی پێغەمبەر هەروا شتێکی ئاسان و سادە و ساکار نەبوو، بەڵکو زۆر قورس بوو بۆ ئیمانداران.

هەرچەندە خوای گەورە پێشتر موسڵمانانی ڕاهێنابوو لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر وەفات دەکات، بەڵام هاوەڵان لە کاتی وەفاتی تووشی شۆک بوون، وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ شاخی لەرزاند، بەڵام خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئەوەی کردووە کە هەموو مرۆڤێک دەمرێت، ئەمەش بۆ پێغەمبەرانە بەگشتی.

خوای گەورە دەفەرمووێت:



﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةًۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾﴾ [الأنبياء]

**واتە: هەموو کەسێك دەبێت مردن بچێژێت و شەرابی مەرگ بنۆشێت، بێگومان ئێمە ئێوە تاقیدەکەینەوە بەشەڕ و ناخۆشی و بەڵا و خێر و خۆشی و دارایی و توانایی، سەرەنجام هەر بۆ لای ئێمە دەهێنرێنەوە (تا پاداشتان بدەینەوە.**

﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۚ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾﴾ [يونس]

**واتە: پێیان بڵێ (من تەنها پێغەمبەرم) توانای ئەوەشم بەر دەست نییە کە زەرەرێک یان قازانجێک بە خۆم بگەیەنم مەگەر ئەوەی کە ویستی خوای لەسەر بێت، هەموو قەومێک کاتی دیاری کراوی خۆی هەیە بۆ کۆتایی هاتنی، هەر کاتێک ئەو ساتە گەیشت، ئەوا نەتاوێک دوادەکەون، نەساتێکیش پێش دەکەون.**

**هەروەها تایبەت بە پێغەمبەری خوا** ﷺ **خوای گەورە دەفەرمووێت:**

﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴿٣٠﴾﴾ [الزمر]

**واتە: بەڕاستی تۆش دەمریت و ئەوانیش دەمرن و کەس نامێنێت.**

﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ﴿٣٤﴾﴾ [الأنبياء]

**ئێمە پێش تۆ ژیانی هەمیشەیی و نەمریمان بەهیچ کەسێك نەبەخشیوە، جا ئایا ئەگەر تۆ بمریت، (دوای مەرگی تۆ) ئەوە ئەو خەڵکە ژیانی هەمیشەیی دەبەنە سەرو نامرن؟!**

**هەموو ئەم ئایەتانە لە مەککە هاتونەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی بە وەفاتی پێغەمبەر** ﷺ **تووشی شۆک و کارەساتی دەروونی گەورە نەبن.**

**هەروەها ڕاهێنانێکی تر ئەویش لە جەنگی ئوحود ڕوویدا، کە پروپاگەندەی ئەوە بڵاو بوویەوە کە پێغەمبەری خوا** ﷺ **کوژراوە، هەندێک مانەوە خۆڕاگربوون و هەندێکی تر ڕایانکرد، خوای گەورە دەفەرموویت:**



﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ [آل عمران]

واتە: محمد (صلى الله عەليە وسلم) تەنها پێغەمبەرێک نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە)، ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا و شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟! (لەو دین و ئایینەی کە پێی ڕاگەیاندوون) خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەزبێتەوە، ئەوە هەرگیز زیان بەخوا ناگەیەنێت، لە داهاتوویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە.

کەواتە وەفاتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چاوەڕوانکراوە بە وەفاتی ئاسایی یاخود لە جەنگ دا شەهید بکرێت، ئەم هۆشدارییە بۆ ئەوە بوو کە موسڵمانان تووشی کارەساتی دەروونی نەبن و ڕەوشەکە ئاسایی وەربگرن.

تەنانەت جەنابیان خۆی ئامادەکاری کرد بۆ وەفاتی خۆی فەرمووی: لەوانەیە لە ساڵی داهاتوودا نەتانبینمەوە. [١٠٨]

یاخود حەجیماڵاوایی هەموو ئاماژەی گەورە بوو بۆ کۆتایی ژیانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەتایبەت لە دوای هاتنی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت:

﴿... ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ... ﴿٣﴾﴾ [المائدة]

تەنانەت ئیبن عەباس دەفەرمووێت ئەوە مانای نزیکی وەفاتی پێغەمبەری خوایە.

لە ڕاستیدا موسڵمانان سەبووریيان بەو ئایەت و ڕووداوانە بوو، بەڵام کێشەی هاوەڵان توانای دان بەخۆ گرتنیاندا نەبوو سەرەتا جیابوونەوەی پێغەمبەر زۆر سەخت بوو.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ماڵاوایی لە هەمووان کرد، تەنانەت ماڵاوایی لە موشریکەکانیش کرد لە مانگی سەفەری ١١ کۆچی چوو تەشریفی برد بۆ قەبرستانی ئوحود دوعای بۆکردن و نوێژی مردووی لەسەر کردن و پاشان گەڕایەوە بۆ سەر مینبەرەکەی و فەرمووی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٠٨ ـ (لَعَلي لَا أَلْقَاكُمْ بَعْدَ عَامَيْ هَذَا).



من شاهیدم لەسەرتان کە لە پێناوی خوادا شەهید بوون، ئێستا چاوم لە وەفاتی خۆمە لە قیامەتدا و خوای گەورە کلیلی هەموو گەنجینەکانی سەرزەوی پێ بەخشیبووم سوێند بەخوا لە دوای خۆم لەوە ناترسم، بەڵام لەوە دەترسم پێشبڕکێ بکەن لە بەدەستهێنانی ژیان و دونیا.

لە هەمان مانگدا سەردانی بەقیعی کرد و ئەم گۆڕستانە زیاتر بۆ خەڵکی شاری مەدینە بوو لەوێدا دەنێژران و لە نیوەی شەودا لە گەڵ هاوەڵێکدا بە ناوی ئەبو مویهبە، فەرمووی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی باوکی مویهبە فەرمانم پێکراوە لای خوای پەروەردگار کە بڕۆم داوای لێخۆشبوون بۆ ئەهلی (بەقیع) بکەم، جا وەرە لەگەڵم دا.

ئەبو مویهبە دەڵێت لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ چووم بۆ بەقیع، سڵاوی کرد بە سڵاوی ئیسلام لە ئەهلی بەقیع و پاشان فەرمووی ئەوەی ئێوە پێی گەیشتوون هەموو خەڵکی دەبێت پێی بگات، ئەگەر بزانن خوای گەورە ڕزگاری کردوون، لەو فیتنە و ئاشووبانەی تووشی مرۆڤ دەبێت کە وەکو شەوێکی تاریک وایە، سەرەتا و کۆتایی هەر تاریکە، جا سەرەتاییەکەی تا کۆتاییەکەی شەڕە لێ ڕزگاربوونە.

پاشان فەرمووی ئەی باوکی مویهبە، خوای گەورە کلیلی خەزانەی (گەنجینەکانی) زەویی داومەتێ، پاشان بە ئەبەدی تێیدا بژیم و پاشان بڕۆمە بەهەشت، میش وازم لە ژیانی هەتا هەتایی ئەو دنیایە هێنا واتە تا هەڵسانی قیامەت لای خوای گەورەم هەڵبژارد.

ئەبو مویهبە دەڵێت: دایک و باوکم بە قوربانت بێت، کلیلی دونیات وەرگرە و پاشان بەهەشت؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نا ئەبو مویهبە لای خوای خۆم هەڵبژارد و بەهەشتەکەی، پاشان داوای لێخۆشبوونی بۆ مردووانی بەقیع کرد و فەرمووی ئێمەش دێین بۆ لاتان، پاشان گەڕاوە بۆماڵەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شەوە نەخۆش کەوت کە شەوی ٢٩ مانگی سەفەری ساڵی ١١ کۆچی بوو لەگەڵ جەنازەیەکدا ڕۆشت و کە گەڕاوە لە ماڵەوە کەوت بەهۆکاری نەخۆشی.



## قورسترین سەرئێشە بۆ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ

لە دوای گەڕانەوەی لە قەبرستانی بەقیع پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ تووشی سەرئێشەیەکی زۆر قورس بوو، پلەی گەرمی بەرز بوویەوە تووشی تایەکی زۆر سەخت بوو لە تاواندا ئەوەندە ئازاری سەری قورس و سەخت بوو پەڕۆیەکی توندی بەست لەسەری، هاوەڵان هەستیان بەگەرمی لاشەی دەکرد (تا) کەی ئەوەندە بەرز بوو.

لە کاتی هاتنەوەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ماڵەوە خاتوو عائیشەیش سەری دەیەشا و کە پێغەمبەری بینی فەرمووی (ئای سەرم).

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ( ئای سەری من).

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە جەنگدا زۆر بریندار بووە، بەڵام یەکەم جارە بەو شێوەیە باسی ئازاری بکات، لەو حاڵەشدا دڵی خاتوو عائیشەی دایەوە کردی بە قسەی خۆش لەگەڵیدا و فەرمووی: هیچ زەرەر ناکەیت عائیشە ئەگەر بمریت پێش من، خۆم دەتشۆم و کفنت دەکەم و نوێژت لەسەر دەکەم و تەلقینشت ئەدەم! [١٠٩]

ئەمەش سەرەتای نەخۆشی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بوو، دیار بوو خاتوو عائیشە سەرقاڵی کاری تر بوو، بەخەیاڵیدا نەدەهات پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ نزیکە لە مەرگ.

ئینجا خاتوو عائیشەش دەستی کرد بە قسەی خۆش لەگەڵ پێغەمبەردا و فەرمووی: لەبەر چاوم دایە لەدوای ئەوەی کفن و دفنت کردم دێیتەوە بۆ ماڵەوە منت لە بیر دەچێتەوە دەچیتە لای خێزانەکانی ترت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٠٩] ـ (أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: رَجَعَ رَسُولُ ٱللَّهِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ ٱلْبَقِيعِ فَوَجَدَنِي وَأَنَا أَجِدُ صُدَاعًا فِي رَأْسِي وَأَنَا أَقُولُ: وَارْأْسَاهْ. فَقَالَ: " بَلْ أَنَا وَٱللَّهُ يَا عَائِشَةَ وَارْأْسَاهْ ". قَالَتْ: ثُمَّ قَالَ: " وَمَا ضَرَّكِ لَوْ مُتُّ قَبْلِيٌّ ، فَقُمْتُ عَلَيْكِ، وَلُقِّنْتُكِ، وَصَلَّيْتُ عَلَيْكِ، وَدَفَنْتُكِ)



پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە پێکەنین و پاشان ئازار زۆری بۆ هێنا ئەو ئازارەی کە دەبێتە هۆکاری وەفاتی.

دایک و باوکم بە قوربانت بێت پێغەمبەر گیان ﷺ.

لە کاتی نەخۆشییەکەی دا هەر ڕۆژە و دەگەڕا بەسەر خێزانەکانی، ئەوەندە ئازاری هەبوو عوقەیل و عەلی چووبوونە ژێر باڵی، زیاتر ڕەوشی خراپتر دەبوو بەشەرمەوە دەیویست لە جێگایەکدا جێگیر بێت و تا خێزانە بەڕێزەکانی هەموو ڕازی بوون لە ماڵی خاتوو عائیشەدا بمێنێتەوە.

لە ڕۆژی ٥ مانگی ڕەبیعی یەکەم لە ماڵی خاتوو عائیشە جێگیر بوو، پاشان فەضڵی کوڕی عەباس و عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب هاوکاری بوون بەرزیان دەکردەوە، قاچە موبارەکەکانی زەوی نەدەگرت وا لاواز ببوو لە تاو ئازاری سەری، ئەو هەفتەیە هەموو لە ماڵی عائیشەی دایکی ئیمانداران مایەوە.

خاتوو عائیشە فەرمووی: کاتێک ئازاری بۆ دەهات هەردەم سورەتی مەعوذەتینی دەخوێند و فووی دەکرد بە دەستی دا و دەیهێنا بەگیانیدا.

ئینجا کە ئازاری بۆ دەهات خاتوو عائیشە بۆی دەخوێند و فووی دەکرد بەدەستی پێغەمبەردا و ئەیهێنا بە گیانیدا، خاتوو عائیشە لەبەر بەرەکەتی خودی پێغەمبەر ﷺ خۆی فووی دەکرد بەدەستی پێغەمبەردا ﷺ.

نەخۆشییەکەی زۆر سەخت بوو تواناى جوڵەی لێ بڕیبوو، زۆر بە ناڕەحەتی قسەی دەکرد، خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: هیچ ئازارێکم نەدیوە ئەوەندەی ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەوەندە ئازاری هەبوو وتم: ئەی ڕەسوڵی خوا ئازارت زۆرە؟!

فەرمووی: بەڵێ ئازاری من هێندەی دوو کەسە لە ئێوە.



عەبدوڵا فەرمووی: کەواتە دوو ئەجرت هەیە.

فەرمووی: بەڵی ڕاستە.

پاشان فەرمووی: (هەر موسڵمانێک تووشی نەخۆشی و ئازار و موصیبەت بێت خوای گەورە تاوانەکانی هەڵدەوەرێنێت وەکو گەڵای دار چۆن هەڵدەوەرێتە ژێری.

ئەوەی پێغەمبەر تووشی بوو لە ئازار هیچ کەس تووشی نەبووە، لە کاتێکدا گەورەترین پێغەمبەرە و خوای گەورە لە تاوانی هەمووی خۆش بووە.

داخۆ ئێمەی مرۆڤی موسڵمان ئوممەتی ئەم پیاوە گەورە و جوان و سەنگینە ئەتوانین لە نەخۆشی و خۆشییەکانمان وەکو جەنابییان بین.

بەلایەنی کەم ئەتوانین لاساییکەرەوەی ژیانی بین، لە جیاتی ئەوەی لاساییکەرەوەی هونەرمەند و گۆرانیبێژ و سەرکردەی دونیای پیس بین.

بەلایەنی کەم دەتوانین لە باسی مەرگیدا فرمێسک لە چاومان بۆ مەرگی هەڵبڕێژین و وەفای خۆمانی بۆ دووپات بکەینەوە.

دایک و باوکم و خۆم بە قوربانت بین یا رسول الله.



## کۆچی دوایی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم

ڕۆژی چوارشەمە ٧ مانگی ڕەبیعی ئەوەل، پێش وەفاتی بە ٥ ڕۆژ پلەی گەرمی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم زۆر بەرز بوو، ئەوەندە (تا) کەی بەهێز بوو لە هۆش خۆی دەچوو، کاتێک بەهۆش خۆی هاتەوە ویستی بڕواتە ناو موسڵمانان تا وەسیەتیان بۆ بکات، ئەویش توانای جووڵەی نەبوو.

پاشان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بە کەس و کارەکەی فەرموو، لە ٧ بیری جیاواز ئاوم بۆ هەڵگۆزن تاخۆی پێ فێنک بکاتەوە، تا بتوانێت بڕواتە ناو خەڵکی بۆ ئەوەی ڕێنمایی نوێیان بکا.

کە ئاوەکانیان بۆ هێنا چووە ناو تەشتێک و ئاوەکەیان کرد بە گیانیدا بەسەر جلەکانییەوە، بەردەوام ئاویان دەکرد بە سەریدا تا زیاتر توانا و هێز و چالاکی بۆ گەڕاوە و فەرمووی ئیتر بەسە ئاوم پێدا مەککەن.

کاتێک هەستی بە چالاکی لاشەی کرد تەشریفی برد بۆ مزگەوت، سەری موبارەکی بەستبوو، چووە سەر مینبەر، هاوەڵان لە دەوری کۆبوونەوە چاوەڕێیان دەکرد تا بزانن چی دەفەرموێت، هەتا وەکو ئەو کاتەش پێغەمبەری نازدار هەر دەچووە ناوخەڵک و لەگەڵ هاوەڵان دا تێکەڵ دەبوو، لەگەڵ ئەوەی لە زۆر ئازاری هەبوو بەڵام هەر تەشریفی برد بۆ مزگەوت، دەستی کرد بە وتاردان و فەرمووی: لەعنەتی خوا لە یەهوود و نەسرانیی بێت، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت، پاشان فەرمووی خوای پەروەردگار داواتان لێدەکەم هەرگیز گۆڕەکەم نەکەن بە بت و نەیپەرستن.[١١٠]

ئەمەش ئاماژەیەکی زۆر توند بوو بۆ ئەوانەی کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەپەرستن، پاشان ئاماژەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو بۆ نزیک بوونەوەی ئەجەلی پێغەمبەر ئەمەش مەبەستی لەم فەرموودەیە دا ئەوە بوو کە خۆشەویستی بۆ پێغەمبەران و خودی خۆی لە سنوور

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١١٠ ـ (لَعَنَ اَللَّهُ اَلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى ، اِتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِد) البخاري.



دەرنەچێت و تا بگاتە ئاستی پەرستن لەگەڵ خوای پەروەردگاردا نموونەی نەسارای هێنایەوە کە بەنەفرەت بوون چونکە عیسا دەپەرستن و هەروەها یەهوود عوزێر دەپەرستێت، ناویان ناوە بە کوڕی خوا، پەنا بە خوای پەروەردگار.

ئەم ئاگادارییە گرنگە بۆ ئەوە بوو لە ڕێزگرتن حورمەت گرتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نەگاتە ئاستێک لەسنوور دەربچێت و خەڵکی دوای خۆی بیپەرستن و پاشان کافربن و لە میللەتی ئیسلامی دەربچن.

پاشان فەرمووی لە قسە موبارەکەکەی زۆر سەرنج ڕاکێش بوو، خۆی خستە بەردەم تۆڵە سەندنەوە و (قیصاص) فەرمووی: ئەگەر قامچییەک یاخود جەڵدێکی ناحەقم داوە لە هەر کەسێک ئەوە پشتم با بێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە، خۆ ئەگەر قسەیەکم بەکەسێک بە ناحەق وتووە، فەرمووی با بێت قسەکەم پێ بڵێتەوە.[111]

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قسەکەی فەرموو، جەنابیان لە ژیانیدا زوڵمی لەکەس نەکردووە هەرگیز، بەڵکو هەمیشە وازی لە مافی خۆی هێناوە، هەرگیز لەبەر خاتری خۆی توڕە نەبووە هەمیشە حەزی بە هاوڕێیەتی و زمانی پاک و پاراو و بەڕێز بوو تا ڕادەیەک کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: تۆ لەسەر بەرزترین ڕەوشتی، هەرگیزاو هەرگیز قسەی ناشرین و خراپ بەدەمتدا نەهاتووە، تەنانەت لە جەنگ و کاتە سەختەکانی ژیانیشتدا.

پاشان لەسەر مینبەرەکەی دابەزی و کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، نوێژی کرد بە خەڵکەکە و پاشان گەڕایەوە سەرمینبەرەکەی و بەهەمان شێوە داوای لە خەڵکی کردەوە فەرمووی کێ مافی پێغەمبەری لایە بابێت وەری بگرێتەوە، زۆر جەختی کردەوە و دووپاتی کردەوە، کەسێك لە هاوەڵان هەڵسا و فەرمووی: لەلایەن منەوە سێ درهەمت لایە.

پێغەمبەر بە فەزڵی کوڕی عەباسی فەرموو بۆی بگەڕێنەرەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[111] ـ (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي قَدْ دَنَا مِنِّي حُقُوقٌ مِنْ بَيْنِ أَظْهَرِكُمْ; فَمَنْ كُنْتَ جَلَدْتُ لَهُ ظَهْرًا فَهَذَا ظَهْرِي فَلِيَسْتَقِدْ مِنْهُ، إِلَّا وَمَنْ كُنْتَ قَدْ شَتَمَتْ لَهُ عَرَضًا فَهَذَا عَرَضِيُّ فَلِيَسْتَقِدْ مِنْهُ).



لەگەڵ یەقینم ئەو هاوەڵە ئەو سێ درهەمەی نەدەویستەوە، بەڵام زۆر ترسا لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە جەختی کردەوە، تاکو بۆی نەبێت بە تاوان و گوناح، پێغەمبەری خوا ﷺ دونیا بەجێ دەهێڵێت نایەوێت بەئەندازەی دەنکە خەردەل و میسقالە زەڕەیەک هیچی لا بمێنێت.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە وەسێتی لە هەمبەر ئەنساردا و فەرمووی ڕاتاندەسپێرم لە ئاگاداری ئەنساربن، ئەنسار بۆمن تایبەتن و جێگای پاراستنی نهێنی من بوون، هەرکارێکیان کرد لێیان ببورن و بیانبەخشن بەوەی کە هەمیشە چاکەیان هەبووە، چاوپۆشیان لێبکەن.

چونکە هەموو خەڵکی زیاد دەکەن، ئەنسار کەم دەکات، تاوایان لێدێت بە ئەندازەی خوێی ناو خواردنیان لێ دێت، جا هەمیشە هاوکاریان بن و چاوپۆشی لە هەڵەکانیان بکەن.

دیارە ئەنسار بە هۆکاری زۆربوونی عەرەب و هاتنە ناو ئیسلامیان ئەوان کەمتر دەبنەوە، ئەنسار بە هۆکاری شەرم و بەخشندەییان، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بە گشتی ڕاسپارد لە سەریان، مانای چاوپۆشین لە هەڵە و تاوانیان نییە لەبەرامبەر خوای پەروەردگار و یاسای دەوڵەتی ئیسلامیدا، بەڵکو چاوپۆشینە لەناو کۆمەڵگەی مەدەنیدا و زیاتر ڕێزیان بگیرێت ئەگەر کارێک لە ئەنساریەکەوە ڕووی دا لە تورەبوون یان هاوکاریان پێویست بوو زیاتر مەبەستەکەم لەو بوارە دایە، کە باش بن لەگەڵیاندا.[112]

پاشان قسەیەکی زۆر کاریگەری فەرموو کەس تێنەگەیشت لە وتەکەی تەنها و تەنها ئیمامی ئەبوبەکر نەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە بۆیە یەکێک لە بەندەکانی

---

[112] ـ (مَرَّ أَبُو بَكْرٍ وَالْعَبَّاسُ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا بِمَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ اَلْأَنْصَارِ وَهُمْ يَبْكُونَ، فَقَالَ: مَا يَبْكِيكُمْ؟ قَالُوا: ذَكَرْنَا مَجْلِسَ اَلنَّبِيِّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَّا، فَدَخَلَ عَلَى اَلنَّبِيِّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، قَالَ: فَخَرَجَ اَلنَّبِيُّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ عَصَبَ عَلَى رَأْسِهِ حَاشِيَةَ بُرْدٍ، قَالَ: فَصَعِدَ اَلْمِنْبَرَ، وَلَمْ يَصْعَدْهُ بَعْدَ ذَلِكَ اَلْيَوْمِ، فَحَمِدَ اَللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أُوصِيكُمْ بِالْأَنْصَارِ، فَإِنَّهُمْ كَرِشِي وعَيْبَتِي، وَقَدْ قَضَوْا اَلَّذِي عَلَيْهِمْ وَبَقِيَ اَلَّذِي لَهُمْ، فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ وَتَجَاوَزُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ).



هەڵبژاردەی دا وەلێ لە نێوان خۆشی و جوانی دنیا تا ڕۆژی قیامەت، یان هەڵبژاردەی ئەوەی کەلای پەروەردگارە.

لەو کاتەدا ئیمامی ئەبوبەکر دەنگی بەرز کردەوە بە گریانەوە فەرمووی: بە فیدات بم بە دایک و باوکەوە ئەی پێغەمبەری خوا.[113]

هاوەڵی بەڕێز ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: هەموو سەرمان سوڕما لەوەی قسەی ئەو (شێخە) مەبەستی ئیمامی ئەبوبەکر بوو لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ باسی بەندەیەکی خوای دەکرد کە هەڵبژاردەی ژیانی ناداتێ خوای گەورە، کەچی ئیمامی ئەبوبەکر بەگریانەوە دەڵێت بە دایک و باوکەوە بە فیدات بین ئەی پێغەمبەر.

لەو کاتەدا هاوەڵان بە گشتی تێنەگەیشتن لە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەو بەندەیە جەنابییانن هەڵبژاردەکە دراوەتە دەستی و ئەویش لای خوای پەروەردگاری هەڵبژاردووە، ئیمامی ئەبوبەکر لە مەبەستەکەی تێگەیشت بۆیە بە گریانەوە هاواری دەکرد.

پاشان بەردەوام ئیمامی ئەبوبەکر دەگریا لە ناو هاوەڵاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی تایبەتی لەسەر مینبەرەوە بۆ ئیمامی ئەبوبەکری سدیق کرد و فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر بۆ دەگریت؟ ئەبوبەکر بە ماڵ و هاوڕێیەتیت منت لە خەڵک دەپاراست، ئەگەر هەڵبژاردەی ترم لەبەردەم دا نەبوایە لە هەڵبژاردنی هاوڕێ ئەوا ئەبوبەکرم هەڵدەبژارد بەڵام ئەبوبەکر برامە و برای دینیمە، پێغەمبەری خوا ﷺ خیلافەتی خوای گەورەی هەڵبژارد، پاشان فەرمووی هەموو دەرگاکان لەم مزگەوتەدا داخراو بێت، تەنها دەرگای ئیمامی ئەبوبەکر کرایەوە.[114]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[113] - أنَّ رَسُولَ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَلَسَ عَلَى اَلْمِنْبَرِ فَقَالَ: ( إِنَّ عَبْدًا خَيرَهُ اَللَّهِ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ مِنْ زَهْرَةِ اَلدُّنْيَا مَا شَاءَ وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ فَاخْتَارَ مَا عِنْدَهُ) فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا فَكَانَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هُوَ اَلْمُخَيَّرُ)

[114] - (لَا يَبْقَيَنَّ فِي اَلْمَسْجِدِ خَوْخَةٌ إِلَّا خَوْخَةَ أَبِي بَكْرٍ»، وَالْخَوْخَةُ: اَلْبَابُ اَلصَّغِيرُ).



ئەمەش ئاماژەی تەواوە بۆ خیلافەتی ئیمامی ئەبوبەکری سدیق کە ئەو دوای پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەبێتە ئیمام.

بەم شێوەیە ڕۆژی ٧ مانگی ڕەبیعولئەوەڵمان بەڕێ کرد لە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دا.

بۆ ڕۆژی دوای واتا ٨ مانگی ڕەبیعولئەوەل ڕۆژی پێنجشەممە ساڵی ١١ کۆچی بە چوار ڕۆژ پێش وەفاتی ڕووداوێکی زۆر گرنگ ڕوویدا.

لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئازاری زۆر تر بوو داوای کرد لە کەسوکاری کە قەڵەم و وەرەقە بهێنن بۆ ئەوەی لە دوای ئەو هیچ کێشەیەک ڕووبەڕوویان نەبێتەوە فەرمووی: وەرەقە و قەلەمێکم بۆ بهێنن بۆ ئەوەی خۆی قسەبکات و ئەوان بینووسن، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم توانای خوێندنەوە و نووسینی نەبوو پاشان فەرمووی بۆ ئەوەی دوای من سەرلێشیواو نەبن و سەرتان لێ نەشێویت.[115]

لەو کاتەدا زۆرێک لە هاوەڵان لە ماڵەکەیان دابوون، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئازاری زۆر بوو ئیمامی عومەریش لە تاو خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: ئازاری زۆرە قورئانمان لە بەردەستدایە و [116] ئەوەمان بەسە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ٨٩﴾ [النحل]

واتە: ڕۆژێك دێت لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێك دەنێرین لە خۆیان بۆ سەریان، تۆشمان هێناوە (ئەی محمد صلی الله عەلیە وسلم) کە شایەت بیت لەسەر ئەو خەڵکە، قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، هیدایەت بەخش و ڕەحمەتە و مزگێنیشە بۆ موسوڵمانان.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١١٥ ـ (ائْتُونِي أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَا تَضِلُّوا بَعْدِي).

١١٦ ـ (فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ غَلَبَ عَلَيْهِ الْوَجَعُ، وَعِنْدَكُمُ الْقُرْآنُ، حَسْبُنَا كِتَابُ اللَّهِ).



بەهۆکاری ئەوەی دەنگە دەنگ دەستی پێکرد ئەو داوای وەرەقەی کرد لە لایەکی ترا و هاوار لە قەڵەم دەکرا، ئیمامی عومەریش لە تاو خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر ﷺ و ڕەحمەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئازاری مەدەن پێویست ناکات.

لەو کاتەدا هەموو دەنگە دەنگیان کرد لە ناو ئالوبەیتیدا بوو ئیختیلاف بۆ بەدەستهێنانی وەرەقە و قەڵەم، چونکە پێغەمبەر ﷺ هیچی نەفەرمووە تا ڕای جیاوازیان هەبێت لەسەری بەڵکو دەنگە دەنگەکان زۆر بوو، بووە هۆکاری تورە بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی هەڵسن نامەوێ لای من ئەو دەنگە دەنگە و ڕاجیاییە بکەن لەسەر نووسین و نەنووسین، (قوموا عني، ولا تنجنى عندي التنازع).

ئیتر هەموو لە دەوری هەڵسان تا پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر پشوو بدات هەرچەندە ئەم وێزگەیە لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هەندێک لە دووڕوو و ناحەزەکانی ئیسلام بە هەل قۆستیانەوە بۆ دووبەرەکی نێوان موسڵمانان.

پێویستە زیاتر ڕوونی بکەینەوە.



## شیکارییەک لەسەر قەڵەم و وەرەقە بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ

ناحەزانی ئەم دینە ئەم وێستگەیە بەهەل قۆستراوەتەوە بۆ قسە وتن بە هاوەڵان و لە هەمانکاتدا، تانەدانە لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ، هەروەها لە وەحی، ئەم ڕووداوە پێش وەفاتی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ بە ٤ ڕۆژ ڕوویداوە شیکارییەکی بۆ دەکەین لە ٦ خاڵدا ڕوونی دەکەینەوە:

یەکەم: ئەگەر فەرمانێکی خوایی بوایە واجب و فەرز بوایە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ بە تورەبوونێکی هەروا بەئاسانیی وازی لێنەدەهێنا، بەڵکو دیارە کارێکی زەروور و گرنگ نەبووە پاشان، دوای ئەوە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ٤ ڕۆژ ژیاوە و لە ناو هاوەڵاندا بووە لە ناو مزگەوتەکەیدا و هاوەڵان هاتوچۆیان کردووە، بە تایبەت ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و فەزڵی کوڕی عەباس و قیتم برای، عەباسی مامی، خێزانەکانی، ئیمامی ئەبوبەکری سدیق و عومەر....هتد لە خزمەتی دابوون ئەگەر گرنگ بوایە پێیدەوت.

دووەم: ڕای جیاواز و ئیختلافی هەمیشە ڕوو ئەدات، بەڵکو پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ گوێی بۆ ڕای جیاوازی هاوەڵان گرتووە و باشترینی هەڵبژاردووە، لێرەدا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ لەسەر ئەوە تورە بوو کە دەنگە دەنگ دروست بوو ڕای جیاواز لەسەر کاتی نووسینەکە دروست بوو کە هاوەڵان هەندێک پێیان وابوو پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ئازاری هەیە بیخەنە کاتێکی تر، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ لە دەنگە دەنگی ئیختیلافەکە لای خۆیدا هەڵیساندن.

سێیەم: زۆرینەی زانایان لەسە ئەو ڕایەن کە پێغەمەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ڕازی بوو بە قسەکەی ئیمامی عومەر، چونکە هیچ پەیوەندی بە وەحییەوە نەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ بێدەنگی لێ کرد، چونکە ئەگەر وەحی بوایە بە دڵنیایەوە دەیفەرموو بینووسن.

چوارەم: زانایان پێیان وایە کە جەنابیان ویستوویانە ناوی خەلیفەکان دەست نیشان بکات دوای خۆی، بۆ ئەوەی ڕای جیاواز ڕوونەدات، بە بەڵگەی ئەوەی ئیمامی ئەبوبەکر لەم کاتەدا



ئامادە نەبوو، بە خاتوو عائیشەی فەرموو: بانگی باوکت و براکەت عەبدوڕەحمان بکە، تا نووسینێکیان بۆ بنووسین، بۆ ئەوەی لەو ترسە بڕۆینە دەرەوە لەو لایەنەوە دڵنیاببنەوە، کە کەسێک لەخۆیەوە نەڵێت من لە پێشترم (مەبەست حوکمڕانی خیلافەتە) ئەوەی کە مەبەستی ئیمامی ئەبوبەکرە لە دوای خۆم بێت.[117]

پێنجەم: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم وانەی فێرکردن لە ئەنجامی ئیختیلاف دا ئەشێت زانراوەکان لەدەست بدەیت، هەروەکو چۆن لە شەوی قەزادا هاوەڵان بووە ئیختیلاف بۆیە نەیانزانی بە تەواوەتی کامە شەو، (شەوی قەدرە).

شەشەم: هەر لەهەمان ڕۆژدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم واتا لە ٨ ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ١١ کۆچی ڕۆژی پێنج شەممە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم چەند وەسیەتێکی کرد و فەرمووی:

وەسیەتی یەکەم: هەرچی موشریکە لە نیوەدوورگەی عەرەب دەریانکەن.[118]

هەروەکو پێشتر وتمان تەنها مەبەستی ناو خاکی جەزیرەیە واتا یەمەن ناگرێتەوە بەڵام چواردەوری مەککە و مەدینە دەگرێتەوە لە نیوەدوورگەی عەرەبدا.

وەسیەتی دووەم: هەر وەفدێک هات بۆلاتان دیاری پێشکەش بکەن، هەوەکو پێشتر کە خۆم ئەنجامم داوە ڕێزی میوانداری و خزمەتی جوانیان بکەن.[119]

بە باشترین شێوە هەڵسوکەت لەگەڵ نوێنەری میوانەکاندا بکەن.

وەسیەتی سێیەم: ئامادەکردنی سوپای ئوسامە بۆ سەر ڕۆم.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[117] ادْعَى أَبَا بَكْرٍ أَبَاكَ، وَأَخَاكَ، حَتَّى أَكْتُبَ كِتَابًا، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَمَنَّى مُتَمَنٍّ، وَيَقُولَ قَائِلٌ: أَنَا أَوْلَى، وَيَأْبَى اللَّهُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَّا أَبَا بَكْرٍ).

[118] ـ أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ.

[119] ـ (وأجيز و الوفد بنحو ما كنت أجيزهم به).



وەسیەتی چوارەم: مەهێڵن گۆڕەکەم بپەرسترێت وەکو بت.

وەسیەتی پێنجەم: نوێژەکانتان بە جوانی بکەن و لەگەڵ کۆیلە و کەنیزەکاندا باش بن.

وەسیەتی شەشەم: لەسەر قورئان و تێگەیشتنی قورئان بڕۆن.

ئەو ڕۆژە کە ئەوپەڕی ئازاری هەبوو هەر خۆی پێش نوێژی کرد، نوێژی مەغریب سورەتی (المرسلات)ی خوێند، پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی ئینجا ئازار و (تا) زۆریان بۆ هێنا، تاکە زۆر سەخت و قورس بوو لە جوڵەی خست و بێهۆش بوو، پێغەمبەری صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئازیز کە هۆشی هاتەوە بۆ نوێژی عیشا فەرمووی: موسڵمانان نوێژیان کردووە؟! (أصلى الناس؟)

هاوەڵان لەلای بوون وتیان چاوەڕوانی جەنابتانین.

پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: ئاوم بۆ بکەنە ناو تەشتێک، ئەیویست خۆی پێ فێنک بکاتەوە تاکەی زۆر بەرز بوو، بۆ ئەوەی زیاتر چالاکی لاشەی بگەڕێتەوە، پاشان تەشریفی برد و تا نوێژی عیشا بکات دوای خۆشۆردنی و دەستنوێژ گرتنی بەڵام نەیتوانی بێهۆش کەوتەوە، کە هۆشی هاتەوە دیسان فەرمووی خەڵک نوێژیان کرد؟!

وەڵامیان دایەوە وتیان: بەردەوام خەڵکی چاوەڕێی جەنابتانن.

تا سێ جار هەوڵیدا هەر بێ هۆش دەبوو و هۆشی دەهاتەوە، بەڵام تەواو هەستی کرد توانای نییە.



## فەرمانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەبوبەکر کە ببێتە ئیمام

خاتوو عائیشە دەڵێت خەڵکی لە مزگەوت چاوەڕوانی پێغەمبەریان دەکرد بۆ نوێژی عیشا، دوای سێ جار لە هۆش خۆ چوون پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی خەڵکەکە نوێژیان کرد؟! لە وەڵامدا وتیان ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چاوەڕوانی جەنابتین لێرەدا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بڕیاریدا کێ ئیمامی موسڵمانان بێت، ئەمەش ئاماژەیەکی تری ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەبوبەکری سدیق کە خەلیفەی پێغەمبەری خوا بێت، فەرمووی: بە ئەبوبەکر بڵێن با پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکات.[١٢٠]

کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وای فەرموو خاتوو عائیشە بە پێغەمبەری خوا وت: بەخوا خەڵکی بە باوکم زۆر دڵتەنگ دەبن، لەبەر ئەوەی کەسێکی دڵ ناسکە زوو دەست دەکات بەگریان، هەر نوێژ بکات گریان بەسەریدا زاڵ دەبێت، مەبەستی خاتوو عائیشە ئەوە بوو کە موسڵمانان خەفەت نەخۆن بە گریانی ئەبوبکر، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جەختی کردەوە، ئەبوبەکری هەڵبژاردووە بۆ ئەو کارە و ئاگاداری بکەنەوە، جارێکیتر خاتوو عائیشە خێزانەکانی تری هێنا بۆ ڕازیکردنی پێغەمبەری خوا کە باوکی نەچیتە پێشەوە بۆ ئیمامەتی و کەسێکی کە هەڵبژێرێت!

هەندێکیان ئاماژەیان کرد بە ئیمامەتی عومەری کوڕی خەطاب، بەڵام پێغەمبەری صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر تووڕە بوو فەرمووی: سێ جارە دووبارەی دەکەمەوە هۆکاری تووڕە بوونەکەی لەبەر ئەو سێ جارەبوو فەرمووی: ئێوە وەکو ئافرەتانی دەوری یوسفن بڵێن بە ئەبوبەکر با نوێژ بۆ ئەو خەڵکە بکات و پێشیان بکەوێت، بۆ ئیمامەتی.[١٢١]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٢٠] ـ (عَنْ اِبْنِ عُمَرْ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لِمَا اِشْتَدَّ بِرَسُولْ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَعُهُ، قِيلَ لَهُ فِي اَلصَّلَاةِ، فَقَالَ: « مُرُوا أَبَا بَكْرْ فَلْيَصِلْ بِالنَّاسِ» فَقَالَتْ عَائِشَة رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا: إِنَّ أَبَا بَكْرْ رَجُلِ رَقِيقِ، إِذَا قَرَأَ اَلْقُرْآنُ غَلَبَهُ اَلْبُكَاءُ، فَقَالَ: « مُرُوَهُ فَلِيُصَلِّ...)

[١٢١] ـ فَأَعَادَ اَلثَّالِثَةُ، فَقَالَ: « إِنَّكُنَّ صَوَاحِبِ يُوسُفْ مُرُوا أَبَا بَكْرْ فَلْيَصِلْ بِالنَّاسِ »



ئیمامی ئەبوبەکری سدیق نوێژی عیشای کرد بە ئیمامەت بۆ موسڵمانان تەندروستی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو، بەڵام هەر لەو ڕۆژەدا مەبەستێکی زۆر گرنگی کرد بۆ موسڵمانان و فەرمووی: هەرکەس لە سەرەمەرگ دابوو بەباشی بیر بکاتەوە لە خوای گەورە کە دەیخاتە بەهەشت واتا هیوای زۆری بە خوای موتەعال هەبێت.[١٢٢]

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشی زۆری بۆ هێنا و لە ناو جێگادا بوو، نەیدەتوانی بڕوات بۆ مزگەوت، ئیمامی ئەبوبەکر نوێژی عیشای کرد بۆ موسڵمانان و بۆ بەیانی ڕۆژی جومعە هەموو نوێژەکانی کرد و وتاری هەینی خوێندەوە و واتا هەر پێنج فەرزەکەی لە مزگەوتی پێغەمبەردا ئیمام بوو، بە هەمان شێوە ڕۆژی شەممە و یەک شەممە هەر ئیمامی ئەبوبەکر ئیمام بوو.

بۆ بەیانی ڕۆژی دوو شەممە ١٢ ڕەبیعولئەولی ساڵی ١١ کۆچی پەردەی ژورەکەی لادا تەماشای کرد ئیمامی ئەبوبەکر ئیمامە و موسڵمانان ڕیزیان گرتوە بۆ نوێژ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری موبارەکی بەستبوو بە پەڕۆیەک و پاشان فەرمووی: خوایە تۆ شایەدی من پەیامەککەتم گەیاند (اَللَّهُمَّ هَلْ بَلَغَتْ) سێ جار پاشان هەر لە جێگای خۆیەوە فەرمووی: ئەی خەڵکینە بزانن، هیچ پەیامێک نەماوە پێغەمبەر وەکو مژدە بیدات بە ئێوە، تەنها ئەوەی ماوە خەوبینینی چاک و پیاوچاکانە کە موسڵمانان دەیبینن، یان خەڵکی تر دەیبینن، من لەسەرتان قەدەغە دەکەم لە کاتی ڕکوع دا قورئان بخوێنن یان لە کاتی سوجدەدا قورئان بخوێنن چونکە ڕکوع جێگای تەعظیم و بەرز ڕاگرتنی خودایە، سوجدەش جێگای داواکردن و پاڕانەوەیە لە خوای پەروەردگار، دڵنیابن لەوەی کە خوای گەورە وەڵامتان ئەداتەوە.[١٢٣]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٢٢] ـ سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، قَبْلَ مَوْتِهِ بثَلَاثَةِ أَيَّامٍ يقولُ: لا يَمُوتَنَّ أَحَدُكُمْ إلَّا وَهو يُحْسِنُ الظَّنَّ باللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.

[١٢٣] ـ (فَقَالَ : أَيُّهَا اَلنَّاسُ، أَنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ اَلنُّبُوَّةِ إِلَّا اَلرُّؤْيَا اَلصَّالِحَةُ يَرَاهَا اَلْمُسْلِمُ أَوْ تَرَى لَهُ؛ ثُمَّ قَالَ: أَلَا إِنِّي نَهَيْتُ أَنْ أَقْرَأَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا اَلرُّكُوعِ، فَعَظِّمُوا فِيهِ اَلرَّبَّ؛ وَأَمَّا اَلسُّجُودُ، فَاجْتَهِدُوا فِي اَلدُّعَاءِ، فَقَمِنَ أَنْ يُسْتَجَابُ لَكُمْ).



دووشتی زۆر گرنگی دیاری کرد، بۆ ئومەتەکەی دوای نەمانی وەحی واتا بۆ بەردەوامی مرۆڤ بۆ بوونی پەیوەندی بە خوای گەورەوە، بە گشتی لە نوێژدا بە تایبەت لە سوجدەدا و پاشان خوای پەروەردگار پەیامی خۆی بە خەڵکی و بەتایبەت پیاو چاکان بە خەون دەنێرێت.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خەونی چاک و ڕوئیا بەشێکی وەحییە لە ٤٦ بەشی وەحی پێغەمبەرایەتی.[١٢٤]

لە ڕۆژی ١٠ ڕەبیعولئەول ڕۆژی شەممە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی ئەبوبەکر نوێژی بەیانی کرد بۆ موسڵمانان بۆ نوێژی نیوەڕۆ پێغەمبەر ﷺ هەستی بە باشی کرد ویستی بڕوات بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت دوو کەس چووبوونە ژێر باڵی عەباسی مامی و عەلی ئامۆزای، ئیمامی ئەبوبەکر نەیزانی بوو کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێناوە کە بینی پێغەمبەر تەشریفی هێناوە قامەتەکەی دواخست تا پێغەمبەر ﷺ گەیشتە لای میحرابەکەی، ئیمامی ئەبوبەکر ویستی بڕوات بۆ ڕیزی دواوەی ئیمام، بەڵام پێغەمبەری خوا داوای لێکرد کە لە تەنیشتی بێت و ببێتە مەئموم، پێغەمبەر ﷺ دانیشتوو ئیمامی ئەبوبەکری خستە لای ڕاستی و خۆی دانیشت و نوێژی دابەست، پێغەمبەر دەنگی بەرز کردەوە بۆ (الله اکبر) پاشان ئیمامی ئەبوبەکر لە دوای ئەو دەنگی بەرز کردەوە بۆ (الله اکبر) بۆ ئەوەی ڕیزی دواوە گوێیان لێبێت چونکە پێغەمبەری خوا لەبەر نەخۆشی دەنگی بۆ بەرز نەدەکرایەوە، پاشان هەموو نوێژەکانی تر ئیمامی ئەبوبەکر کردی بۆ موسڵمانان، ڕۆژی یەک شەممە ١١ ڕەبیعولئەول، یەک ڕۆژ پێش وەفاتی بەهەمان شێوەی هەموو نوێژەکانی ئەو ڕۆژەی بۆ موسڵمانان کرد.

ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا هەرچی کۆیلە هەبوو ئازادی کرد ئەوەی کە خۆی خاوەنی بوو، هەروەها خاوەنی ٧ دینار بوو هەموو پارەکەی بەخشی و چەک و قەڵغانی بەخشی بە موجاهیدەکان و لە دوای وەفاتی لە ماڵەکەیدا خواردنێکی زۆر کەمی لە ماڵەکەی خۆیدا بەجێی هێشت، لە ماڵەکەیدا هەندێک گەنم و ئاردی ڕەشی بەجێهێشت هەر لەوەی دەخوارد پێغەمبەری خوا ﷺ.

---

١٢٤ ـ (الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنْ النُّبُوَّةِ).



لە ماڵەکەیدا خاوەنی ٩ خێزان بوو، هەروەها خاوەنی دەوڵەتی ئیسلامی بوو فەردەیەک ئاردی نەبوو، یاخود صاعێک، کە هەندێک دەڵێن لە تەنەکە کەمترە.[١٢٥]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٢٥] ـ (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا فِي بَيْتِي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلَّا شَطْرُ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ).



# ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بۆ لای ڕەفیق الأعلی

ڕۆژی دووشەممەی ١٢ ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ١١ کۆچی ئەو ڕۆژەی کە دونیا گەورەترین موصیبەتی بە خۆیەوە بینی، کارەساتێک کە هیچ کات مرۆڤ کارەساتی وای بەسەر نەهاتووە، نیشانەیەکی هاتنی قیامەت، ئەویش ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبەر وەفاتی کرد.

ئەنەس کوڕی مالیک دەڵێت: هیچ کاتێک هێندەی ئەو ڕۆژە پێغەمبەرم نەدیوە دەموچاو جوان و پێست ناسک و شەوقدار بێت، کاتێک تەشریفی هێنا بۆ شاری مەدینە و خۆشترین ڕۆژی ژیانمان بوو، ناخۆشترین ڕۆژی ژیانمان ئەو ڕۆژەبوو کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد.

ئەو ڕۆژەی کە وەفاتی کرد ڕۆژێک بوو زۆر جیاوازتر لە ڕۆژەکانی تر، سەرەتای ڕۆژ هاوەڵان زۆر دڵ خۆش بوون بەڵام کۆتاییەکەی هەموویانی خستە سەرزەوی.

بەیانی ڕۆژی دوو شەمە ئیمامی ئەبوبەکر نوێژی کرد بۆ موسڵمانان، لە کاتی نوێژی بەیانیدا موسڵمانان ڕیزیان بەستبوو لە کاتی خوێندنی نوێژدا بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی لادا کە ژووری خاتوو عائیشە بوو، تەماشای نوێژخوێنانی دەکرد.

ئەنەس دەڵێت: بە پێوە وەستابوو دەموچاوی ئەدرەوشایەوە وەکو کاغەزێکی پاک و بێ گەرد، پاشان زەردەخەنە گرتی کە ئێمەی بینی زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە موسڵمانان ڕیزیان بەستووە بۆ نوێژی بەیانی و لەناو نوێژدان.

هەموو لە خۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخساری جوان و درەوشاوەی، خەریک بوو لە خۆشیاندا نوێژەکەیان ببڕن، ئیمامی ئەبوبەکریش ویستی نوێژەکەی ببڕێت چونکە وایزانی پێغەمبەر ﷺ دێت بۆ پێش نوێژی، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی ئاماژەی کرد بۆیان تا بەردەوام بن و نوێژەکەیان نەبڕن و تەواوی بکەن، پەردەکەی دادایەوە بۆ ئەوەی نوێژەکەیان بە باشی بکەن و سەرقاڵ نەبن بە پێغەمبەرەوە.



ئیتر هەرگیزاو هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ دایکم و باوکم بە قوربانت بێت لەسەر زەویدا نوێژی نەکرد، لەو دەرگایەوە ئیتر نەهات بۆ مزگەوت.

لە کاتی هەڵهاتنی خۆردا پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێن فاطمەی کچیدا، کاتێک هات پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە لە منداڵەکانی تەنها ئەو کچەی مابوو هەموو وەفاتیان کردبوو.

کاتێک بینی خۆشحاڵی دایگرت و وتی کچەکەم بەخێر بێیت.

پاشان لای ڕاستی دانیشت و خاتو فاطیمە دەستی کرد بە گریانێکی بە کوڵ بۆ باوکی پاشان باوکی چرپاندی بە گوێیدا و زۆر بە کوڵ دەگریا، جارێکی تر پێغەمبەر ﷺ چرپاندییەوە بە گوێی دا دەستی کرد بە پێکەنین.

خاتو عائیشە فەرمووی چی بوو یەکەم جار گریاندتی و پاشان دەستت کرد بە پێکەنین؟!

خاتو فاطیمە فەرمووی: نهێنی پێغەمبەر ئاشکرا ناکەم، تا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد پاشان خاتوو عائیشە داوای کرد لە خاتو فاطیمە ئەو باسەی بۆ بکات.

خاتو فاطیمە فەرمووی: ئێستا ئاساییە، وەرە بۆت باس دەکەم.

فەرمووی هەموو ساڵێک کاتێک جوبرائیل هاتووە قورئانی پێ خەتم کردووم یەک جار بەڵام ئەم ساڵ دووجار پێی خەتم کردم ئەمەش واتای نزیک بوونەوەی مەرگ و ئەجەلی منە تۆش ئارام بگرە.

جا بەم هۆکارە زۆر گریام و فەرمووی ئایا فاطیمە حەزناکەیت تۆ سەرۆک و گەورەی ئافرەتانی جیهان بیت پاشان فەرمووی یەکەم کەس کە دێت بۆ لام لە ئەهل و بەیتم لە دوای مەرگم تۆیت، دەڵێت منیش لە خۆشیدا دەستم کرد بە پێکەنین، ئەی چۆن پێناکەنێت دەگەڕێتەوە بۆ لای باوکی کە پێغەمبەرە و دایکی خاتو خەدیجەیە!

﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ۝٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ۝٢٣﴾ [القيامة].

واتە: بەمەرجێك ئەو ڕۆژ، ڕووخسارانێك گەشاوەو ناسك و ئاسوودەن.



واتە: چونکە (هەریەکە بۆ خۆی) تەماشای پەروەردگاری دەکات (لە تەماشاکردنی تێر نابێت).

بەڵام خاتو فاطیمە لە دوای پێکەنینەکەی بۆ نەخۆشی باوکی زۆر کاریگەری لەسەر بوو زانی باوکی زۆر ئازاری هەیە، دیسان دەستی کردەوە بە گریان و ئەیوت بابە گیان ئازار و ناڕەحەتیت زۆرە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی کچی خۆم جارێکیتر باوکت ناڕەحەت نابێت لەمڕۆ بەدواوە.[١٢٦]

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەست بە ناڕەحەتی و ئازار ناکات چونکە کۆتایی ژیانییەتی ئەمڕۆ بەهەشت و جێگای خۆی بینیوە، داخۆ خوای پەروەردگار چی بۆ ئامادە کردبێت؟! هەموو ئیمانداران کە دەمرن لە ناو گۆڕدا جێگای خۆیان لە بەهەشتدا دەبینن، بەڵام پێغەمبەران پێش مەرگیان لە دنیادا جێگای خۆیان لە بەهەشت دەبینن.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: هیچ پێغەمبەرێک گیانی ناکێشرێت، تاکو جێگای خۆی لە بەهەشت دا نەبینێت، پاشان ئازادی دەکەن لە هەڵبژاردنی دنیا یان بەهەشت.[١٢٧]

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەو ڕۆژەدا جێگای خۆی لە بەهەشتدا بینی و سەری کردە سەرسینگی دایکمان خاتوو عائیشە و بۆ ماوەیەک خەوی لێکەوت، پاشان لەخەو هەڵسا فەرمووی بۆ لای ڕەفیق و الأعلای و چاوی لەسەر سەقفیماڵەکەمان بوو، دەیفەرموو بۆلای ڕەفیقی بەرزم (بَلْ الرَفيقُ الأعەلى) ( اللَّهُمَّ الرَّفِيق الأعەلى).

جارێکی تر ئازاری سەرئێشە و (تا) تەنگی بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵچنی، سەری لەسەر سینگی خاتوو عائیشەی دایکمان بوو فەرمووی: ئەی عائیشە تا ئێستاش ئازاری ئەو ژەهرەیە کە دەرخواردیان دام لە خەیبەردا.[١٢٨]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٢٦ - (فَقَالَ: « لَيْسَ عَلَى أَبِيكِ كَرْب بَعْدَ ٱلْيَوْم).

١٢٧ ـ (إنَّه لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ قَطُّ حتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الجَنَّةِ).

١٢٨ ـ (يَا عَائِشَة، مَا أَزَالَ أَجِدُ أَلَمُ ٱلطَّعَامِ ٱلَّذِي أَكَلْتُ بِخَيْبَر).

مەبەستی ئەو مەڕە برژاوە ژەهراوی کراوە بوو کە لە خەیبەردا دەرخواردی درا بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ تفی کردەوە، هەست دەکەم هەموو بۆڕی خوێنەکانم کە بەدڵمەوەیە پچڕاندوویەتی.[129]

خوای گەورە لەگەڵ پلەی پێغەمبەرایەتی پلەی شەهیدیشی کرد بە نسیب پێغەمبەری خوا ﷺ وا چرکەساتی کۆتایی ژیانی پێغەمبەر ﷺ نزیکە، تەنانەت لە ساتەکانی کۆتاییدا ئامۆژگاری ئوممەتەکەی دەکات و دەفەرمووێت (نوێژەکانتان نوێژەکانتان، باشبن لەگەڵ کۆیلە و کەنیزەکاندا). [130]

لەو کاتەدا عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە سیواکێکی بەدەستەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ نەیدەتوانی قسە بکات خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: ئاگام لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای سیواکەکەی دەکرد، ئینجا زانیم حەزی لێیەتی، لە عەبدوڕەحمانی برام وەرگرت و خستمە ناو ئەو جامە ئاوەی کە خۆی پێ فێنک دەکردەوە، بۆیم نەرم کردەوە و پاشان هێنام بە ناو دەمودانی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ، پاشان دەستی خستە ناو جامە ئاوەکە و هێنای بە دەم و چاوی موبارەکیدا، دەیفەرموو (لا أله الاالله) بەڕاستی مەرگ زوخاوی هەیە. [131]

دەیفەرموو خوایە هاوکارم بە لەسەکەراتی مردن و زوخاوی مەرگ.[132]

تەنانەت زوخاو و سەکەراتی مەرگ لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو بەڵکو زۆر سەخت بوو، لە دوای لێ بوونەوەی سیواک بەکارهێنانەکەی دەست و پەنجەی بەرزکردەوە و چاوی بڕییە سەقفی ماڵەکە و لێوەکانی بە هێواشی جوڵاند، خاتو عائیشەی فەرموو گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لەگەڵ ئەوانەی نیعمەتی خۆتت بەسەر دا ڕشتوون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆکان و شەهیدان و چاکەخوازەکان، پەروەردگار لێمخۆشبە و ڕەحمم پێ بکە، بمگەیەنە بە ڕەحمەتی ئەعلا، خوای گەورە بە ڕەفیقی ئەعلا سێ جار

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[129] ـ (فَهَذَا أَوَانِ وَجَدَتْ اِنْقِطَاعَ أُبْهرِيَ مِنْ ذَلِكَ اَلسُّمَّ).

[130] ـ (اَلصَّلَاة وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانَكُمْ، اَلصَّلَاةُ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانَكُمْ).

[131] ـ (لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ).

[132] - (اَللَّهُمَّ أَعْنِي عَلَى غَمَرَاتِ اَلْمَوْتِ أَوْ سَكَرَاتِ اَلْمَوْتِ).



فەرموویەتی ئیتر دەستی کەوتە سەر زەوی و گیانی موبارەکی گەڕایەوە بۆ لای خوای پەروەردگار.[١٣٣]

پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە بۆنخۆش و جوان و پاکی بە مردوویی و زیندوویی ئەی خۆشەویست ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، إنَّا لِله وَإنَّا اليْهِ رَاجِعُون، مردن ڕاستییەکی حەقە دەبێت هەموو بیچێژێت، هەموو کەس دەمرێت خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ۝﴾ [الزمر]

واتە: بەڕاستی تۆش دەمریت و ئەوانیش دەمرن و کەس نامێنێت.

ناخۆشترین ساتی ژیانە، هەموو شاری مەدینە بە وەفاتی تاریکی بەسەر داهات، خۆی نووربارانی کرد کە هیجرەتی بۆ کرد، کردیە مەدینەی منەوەرە، وا ئەمڕۆ تاریکە و باڵای خەم و دەستی بەسەردا کێشاوە، لە ڕاستیدا هەر مەدینە تاریک نەبوو، سوێند بە خوا هەموو دونیا و ژیان تاریک بوو، ئەمەش قسەیەکی ئەدەبی نییە، بەڵکو ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، خۆ پێغەمبەر ﷺ تەنها پیاوێکی سەرکردە و سەرۆکێکی گەورە و پێغەمبەرێکی ئاسایی و باوک و هاوەڵ و برا نەبوو بەتەنها، بەڵکو کۆتا پێغەمبەر بوو کە خوای پەروەردگار ناردی، مرۆڤایەتی چی لەدەست داوە کۆتا پێغەمبەر کە نیشانەی هاتنی ڕۆژی قیامەتە.

لە ناو خەڵکیدا ژیا و وتاری بۆ خەڵکی ئەدا و فەرمانی بە چاکە پێدەکردن و ڕێگری لێدەکردن لە خراپە، لەدوای ئەو هیچ پەیامێکی تر نایەت، پاشان خۆی باسی فیتنەی کۆتایی ڕۆژەکانی ژیانمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: هەوڵی کاری چاکە و چاکەخوازی بدەن، فیتنە و ئاشوب باڵی ڕادەکێشێت وەکو شەوێکی تاریک، پیاوێک لە ڕۆژا ئیماندارە و خواناسە، بەڵام بە شەو

---

[١٣٣] ـ اَلَّذِينَ أَنْعَمَ اَللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ اَلنَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ، وَحُسْنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا. اَللَّهُمَّ اِغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ اَلْأَعْلَى، اَللَّهُمَّ فِي اَلرَّفِيقِ اَلْأَعْلَى، ثَلَاثَةَ مَرَّة.



کافر دەبێت، یاخود بە پێچەوانەوە لە شەودا ئیماندارە و خواناسە، بەڵام بە ڕۆژ کافر دەبێت، دینەکەی بە کەمێک لە دنیا دەفرۆشێت.[١٣٤]

ڕۆشتنی ئەو پێغەمبەرە ﷺ و وەفاتی گەورەترین موصیبەت بوو، خوای گەورە لەو موصیبەتانە بمانپارێزێت، آمین.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٣٤] ـ (بَادَرُوا بِالْأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اَللَّيْلِ اَلْمُظْلِمِ، يُصْبِح اَلرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا، يَبِيعَ دِينَهُ بِعَرْضٍ مِنْ اَلدُّنْيَا).



## هەواڵی بڵاوبوونەوەی وەفاتی ڕەسول

کە هەواڵی مەرگی پێغەمبەری خوا بڵاو بوویەوە، هاوەڵان تووشی شۆک بوون سەریان لێشێوا، تەنانەت هەندێک هەر نەیاندەتوانی بیر بکەنەوە، هەندێک ئەژنۆکانیان توانای بەرزکردنەوەی خۆی نەبوو، هەندێک حەپەسا و توانای قسەکردنیان نەما، هەندێکی تریان ئینکاری وەفاتی پێغەمبەریان دەکرد.

کە ئیمامی عومەر هەواڵەکەی بیست وەکو شێت و هاری لێهاتبوو، سوێندی دەخوارد کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەفاتی نەکردووە، بە دەوری خۆیدا هەڵدەخولا (الله مَا مَاتَ رَسُولُ الله) ئەوەندی تر توڕەبوو هاواری دەکرد، هەر کەس بڵێت پێغەمبەر وەفاتی کردووە دەست و قاچی ئەبڕم! دەیووت پیاوێکی مونافیق بڵاوی کردۆتەوە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەفاتی کردووە، ئەو نەمردووە وەکو موسا چووە بۆ خزمەتی پەروەردگاری، ماوەی ٤٠ شەوی پێچوو دواتر بڵاویان کردەوە کە گوایە موسا مردووە.

بەم جۆرە قسانە دڵخۆشی خۆی ئەدایەوە، لە واقیعەکە تێدەگەیشت لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: بەهێزترین و سەخترین لە کاری موسڵمانان عومەرە.[١٣٥]

لێرەوە لە چاوی ئیمامی عومەرەوە موصیبەتەکەمان بۆ دەرەکەوێت، هەموو ئیمانداران ئاواتەخوازی قسەی ئیمامی عومەر بوون، بەڵام وانەبوو.

ئیمامی ئەبوبەکر کاتێک هەواڵەکەی بیست بە پەلە گەڕایەوە چووە ماڵی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چووە لای عائیشەی کچی، پێغەمبەری بینی لەسەر جێگاکەی وەفاتی کردووە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٣٥ ـ (وَأَشَدُّهُمْ فِي دِينِ اللَّهِ عُمَرُ).



ئیمامی ئەبوبەکر دەستی کرد بە گریان گریانێکی بە کوڵ.

بۆ ئیمامی ئەبوبەکر تەنها پێغەمبەرێک نەبوو، بەڵکو هاوڕێ و برا و جێگای نهێنی یەکتری بوون، خەزووری پێغەمبەر بوو ﷺ سەرۆکی دەوڵەتەکەی بوو، ڕێگا نیشاندەری بوو.

لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستییەدا، ئیمامی ئەبوبەکر زۆر قیادییانە مامەڵەی کرد و خوای گەورە سەباتی پێ بەخشی، هەر چەندە ئەمە تاکە هەڵوێستی نەبووە، بەڵکو ئەوەندە هەڵوێستی جوان و نایابی هەیە لە ژمارە نایەت.

چووە سەر تەرمی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ و ناوچەوانی ماچ کرد، پاشان دەستی خستە سەر چاوی موبارەکی و فەرمووی: وای بۆ پێغەمبەرەکەم وای بۆ هاوڕێکەم وای بۆ پاک و بێگەرد و هەڵبژێراوەکەم.

پاشان فەرمووی: بە دایک و باوکەوە قوربانت بم، بۆن خۆش و جوانی بە مردوویی و بە زیندوویی، سوێند بەخوا جارێکی تر مردن ناچێژیتەوە.

زۆر بە خێرایی ئیمامی ئەبوبەکرد دەرچوو لە ماڵی پێغەمبەر و چووە ناو خەڵکەکە بۆ ئەوەی سەبووریان بدات و کەمێک لە خەم و ئازاریان کەم بکاتەوە، هەرچۆنێک بێت سەبووریان بدات لەسەر ئەو موصیبەتە، هەر چووە دەرەوە بینی ئیمامی عومەر سوێند دەخوات دەڵێت پێغەمبەر ﷺ نەمردووە!

ئیمامی ئەبوبەکر بە ئیمامی عومەری فەرموو دانیشە و ئیتر قسە مەککە، بەڵام ئیمامی عومەر توانای وەستان و دانیشتنی نەبوو، بۆیە ئیمامی ئەبوبەکر ناچار جێیهێشت، ڕۆیشتە ناو خەڵکەکە و هەموو لە دەوری ئیمامی ئەبوبەکر کۆبوونەوە، پاشان لە ناو خەڵکەکە دەستی کرد بە وتار و فەرمووی کێ (محمد)ی پەرستووە!؟ ئەوا (محمد) مردووە، ئەوەی خوا دەپەرستێت خوای پەروەردگار زیندووە و نامرێت.

ئەم وتارەی ئیمامی ئەبوبکر لە ماوەیەکی کەمدا توانی گۆڕانکاری جوزئیەتی بکات لە ناو هاوەڵاندا هەمووی هێور کردنەوە ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە و فەرمووی:



﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ﴿١٤٤﴾﴾ [آل عمران]

واتە: محمد (صلى الله عەليە وسلم) تەنها پێغەمبەرێک نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە)، ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژراو شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟! (لەو دین و ئایینەی کە پێی ڕاگەیاندوون) خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەزبێتەوە، ئەوە هەرگیز زیان بەخوا ناگەیەنێت، لە داهاتوویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە.

هاوەڵان وایانزانی ئەو ئایەتە ئێستا دابەزیوە ئەوەندە، وەفاتی پێغەمبەر ﷺ کاریگەری هەبوو لەسەریان، لە کاتێکدا ٧ ساڵ بەر لەئێستا دابەزیوە.

ئیتر کە ئەم ئایەتە بەرگوێی هاوەڵان کەوت هەموو هێور بوونەوە ئینجا واقیعەکەیان قبوڵکرد.

ئیمامی عومەر فەرمووی: قاچەکانم هێزی تێدا نەمابوو کاتێک ئیمامی ئەبوبەکر ئەم ئایەتەی خوێندەوە هێزی هاتەوەبەر، ئیتر زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ) وەفاتی کردووە.

ئینجا ئیمامی عومەر بەکوڵ گریا، عائیشە گریانی بە کوڵ بۆ خۆشەویستەکەی هەڵدەڕشت، هاواری دەکرد و دەگریا و دەیکێشا بە سینگی خۆیدا، لەو لاوە ئیمامی عەلی، هاوەڵان فرمێسکیان طەی دەکرد، ئاسمان لە تاو فرمێسکی هاوەڵان شەرمەزار بوو بۆ بارینی باران.

فاطیمە هاواری دەکرد، وای باوکە گیان خوای گەورە دوعاکەی گیرا کردی، ئای باوکە گیان تۆ لە جەنەتی فیردەوسی لە بەهەشتی پلە بەرزی میوانیت وای باوکە گیان تۆ لەگەڵ جوبرەئیلدایت.

ئافرەتانی مەدینە هەموو سنگیان دەکوتی، خاتوو عائیشەش سنگی بۆ خۆشەویستی دەکوتی و دەیکێشا بە ڕوومەتی خۆیدا، موصیبەتەکە زۆر گەورەیە.

خاتو عائیشە دەیفەرموو: لەماڵی من لەسەر سینگی من لەکاتی ڕۆژی مندا گیانی بەخشی، کۆتا خۆراکی پێغەمبەری خوا ﷺ لیکی خاتوو عائیشە بوو کە سیواکەکەی



عەبدوڕەحمانی برای هێنا بە دەمیدا و دایکی ئیمانداران لەگەڵ دایکانی تر بە کوڵ گریانیان بۆ خۆشەویستیان هەڵدەوەراند.

سوپاس بۆ خوا هەرچۆن بوو ئیمامی ئەبوبەکر توانی واقیعەکە بەو خەڵکە بڵێت و خەڵکی سەبووری پێ بدات



# هەڵبژاردنی ئیمامی ئەبوبەکر -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- لە باخی سەقیفەی بەنو سەعد دا

لە دوانزەی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ١١ی کۆچی هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج کۆبوونەوە بۆ ئەوەی خەلیفەیەک بۆ موسڵمانان دەستنیشان بکەن، لەجێگایەک کەناسراوە بەسەقیفەی بەنو سەعد، ماڵێکە یاخود بەردەم باخێکە کۆبوونەوە گرنگەکان و بڕیاری سەرەکیان لەو جێگایەدا دەدا هەردوو هۆزەکە.

ئەنسار بۆچوونی وابوو، دەبێت خەلیفە لەوان بێت چونکە ئەوان زۆرینەن، دەیانزانی ئیسلام دین و دەوڵەتە، بۆیە لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی بەخاکی بسپێرن، کۆبوونەوە تا خەلیفەیەک بۆ موسڵمانان دیاری بکەن.

لێرەدا باسەکە ئەوە ناگەیەنێت کەپشتیوانان بەدوای دەسەڵات و سوڵتەدا گەڕابێتن، وەک هەندێک لەموستەشریق و بێدینەکان ئەو ڕەخنەیان ئاراستە دەکەن، بەڵکو ئەوان لەوپەڕی ئیمان و خۆشەویستیان بوو بۆ ئیسلام، چونکە دەیانزانی، کە ئەگەر بێت و سەرکردەیەک یاخود جێگرەوەیەک دانەنێن بۆ پێغەمبەر ﷺ هەموو عەرەب ڕوویان تێدەکات، تا لەگەڵیان بجەنگن. پشتیوانانیش هۆکار بوون بۆ پشتیوانی پێغەمبەری نازدار ﷺ خوای گەورە لەوەسفی ئەنساردا دەفەرمووێت:

﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٌۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٩﴾ [الحشر]

واتە: ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بەئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلییەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن،



فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژار و نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.

پێغەمبەری خوا بەرامبەر بەئەنسار سێ جار فەرمووی: (اللَّهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ)

ئێوە خۆشەویسترین خەڵکن لە دڵی مندا، کە بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە.

هەروەها لەفەرموودەیەکیتردا دەفەرمووێت: مَوْعِدُكُمُ الْحَوْضُ

ئێوەی ئەنسار لەسەر حەوزەکەم چاوەڕوانتان دەبم بەیەکەوە کۆببینەوە، بوخاری لەئەنەسەوە ڕیوایەتیکردوە.

گەورەیی و چاکەی ئەنسار زۆر باسکراوە لەئیسلامدا، بەشێکی تایبەتی بۆ دانراوە لەفەرمووده و ڕاڤەی قورئان دا، تەنانەت پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: خۆشەویستی ئەنسار لەئیمانەوە یە و ڕق لێبوونیشیان لەدووڕوویی و نیفاقەوەیە، هەرگیز ئەنسار داوای نەکردوە، بەڵکو هەمیشە بەخشیوەتی لەئیسلامیشدا بەبەخشندەکان ناسراوبوون.

لە حونەینیشدا ئەو هەموو سەروەت وسامان و غەنیمەتە دەستی موسڵمانان کەوت پشتیوانان یەک بەشیشیان لێ نەبرد.

پوختەی وتە: پشتیوانان، کەکۆبوونەوە لەسەقیفەی بەنو سەعد بۆ ئەوەبوو، کەپشێوی و پەرتەوازەیی نەکەوێتە ناو موسڵمانان، بۆ ئەوەی دەستنیشانی خەلیفەیەک بکەن لەدوای وەفاتی پێغەمبەری نازدار ﷺ .

ئەنسار لەخۆشیان دەترسان، کەکۆچکردووە قوڕەیشیەکان بەجێیان بهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ مەککە، بۆیە خێرا خەلیفەیەکیان لەخۆیان هەڵبژارد، ئەم خەلیفەیە لەشاری مەدینەی مونەوەرەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

یەکەم: لەڕووی سیاسی و عورفی ئەو سەردەمەوە مەدینە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو، ئەوس و خەزرەجی تیا دەژیا.



هەتا سیستەمەککە پێغەمبەرایەتی بوو، ڕازیبوون بەحوکمی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەمیشە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کار و بارەکانیانی دەگەڕاندەوە بۆ خۆیان تا خۆیان بڕیاری لەسەر بدەن، بیریان لەوە کردەوە کەسەرکردەیەکی نوێ بۆ ئەو شارە دابنێن، بەو پێیەی کەئەوان خەڵکی ئەو شارەن. بۆیە هیچ کام لەموهاجیرەکانیانی بانگ نەکرد، چونکە ئەوان هەموویان پەناهەندەی سیاسی بوون.

دووەم: ئەو جێگایانەی کەموسڵمانی لێ دەژی و ئێستا شاری گەورەن، پایتەختی دەوڵەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ مەدینە بوو، مەککە و طائیفیش دووشاری سەرەکین، بەڵام لەڕووی ئیداری و ئابووری و سەربازییەوە مەدینە پایتەختە، یاخود سەرەکیترە.

سێیەم: پشتیوانان بیریان لەوە کردەوە، کەمەدینە جێگایەکی هەستیارە و دەبێت خەلیفەیەکی بۆ دابنێن، بەهۆکاری ئەوەی موهاجیرەکان لەناو خاکی مەدینەدا ناتوانن دەوڵەت دامەزرێنن، چونکە لەڕووی عورفەوە خەڵکی جێگا و مەنزڵگاکە نین، مەککەش پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ یان دەرکردبوو، طائیفیش بەردبارانیان کردبوو، بۆیە هەستیان بەوە دەکرد، کەئەوان لەپێشترن بۆ خەلیفەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەمانیش خۆیان لەهەموویان لەپێشتر دادەنا، چونکە لەپێشتر ئیسلامیان وەرگرتووە.

پارە و سەروەت و سامان و گیانی خۆیان بەختکرد لەپێناوی ئیسلامدا، تەنانەت لەیەکەم غەزوەدا کەغەزوەی بەدر بوو ژمارەیان زۆرتربوو لەکۆچەرییەکان.

چوارەم: خاڵێکی زۆر گرنگە ئەنسار هەستی دڵنیاییان هەبوو کەکۆچبەرەکان دەگەڕێنەوە شاری مەککە لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چونکە جێگا و مەنزڵگای خۆیانە و خاک و ئاو و ماڵیان لەوێیە، ڕاستە پێشتر لەلایەن موشریکەکانەوە داگیرکرابوو، بەڵام ئێستا شاری مەککە موسڵمانە، مافی خۆشیانە کەکۆچبەران بگەڕێنەوە جێگاو ڕێگای خۆیان، لەکاتێکدا کەیەک نوێژ لەشاری مەککە یەکسانە بەسەد هەزار نوێژ.

ئەم دید و بۆچونە کە لەسەردەمی غەزوەی حونەینەوە بۆیان دروست بوبوو، ئەمەش هۆکارێکە، کەپشتیوانان بیریان لەوە دەکردەوە کەخەلیفەیەک لەخۆیان دەستنیشان بکەن.



پێنجەم: ئەنسار هەستی ئەوەی بۆ دروست بوبوو کەعەرەب لەدوای پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ رق و کینەیان بەرامبەر بەئەنسار هەیە، چونکە لەدیدی عەرەبەوە ئەوان بوون، کەپێغەمبەریان صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەرخست.

لێرەو لەوێ و لەنیوەدوورگەی عەرەبییەوە جەنگیان دەکرد و ئیسلامیان گەیاندە هەموو ناوچەکە.

بەم هۆکارە بوو دەترسان لەوەی کەهەموو عەرەب کۆببنەوە و وەک خەندەق لەناویان بەرن، بۆیە لەناو خۆیاندا خەلیفەیان دەستنیشانکرد، کەهاوەڵێکی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو، بەناوی سەعدی کوڕی عوبادە، کەئەوس و خەزرەج پلانیان وا دانابوو کەبیکەنە خەلیفە و بەیعەتی بدەنێ بەبێ ئەوەی یەک موهاجیری لێبێت.[١٣٦]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٣٦] ـ ئەم بابەتە لە ماستەرنامەی نووسەر (ماکوان کەریم) لەژێر ناونیشانی (گوتاری سیاسی لە نێوان ئێستا و ڕابردوودا) بە درێژی باسکراوە.
چاپی هەولێر / ٢٠١٣ / چاپخانەی هێڤی.



## شۆردنی تەرمی موبارەکی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم

لە دوای هەڵبژاردنی ئیمامی ئەبوبەکر بۆ خەلیفە هەنگاوێکی زۆر گرنگ بوو، چونکە دەوڵەتێکی وا گەورە بێ سەرۆک نابێت.

پاشان هەموو لەسەر ئەوە کۆبوونەوە چۆن تەرمە موبارەکەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بشۆن و چۆن کفنی بکەن و چۆن بینێژن لە گۆڕدا؟!

چونکە هەموو دەستەوستان بوون نەیاندەزانی چی بکەن، لە نەبوونی پێغەمبەردا صلى الله عليه وعلى آله وسلم نەیاندەزانی چۆن بڕیار بدەن، پێغەمبەرە! کەسێکی هەروا ئاسان نییە، دەترسن خوای گەورە لێیان بڕەنجێت لەهەر هەڵەیەک یان کارێک کە شایستەی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم نەبێت، ئەمەش پێویستی بە هاوکاری و تەوفیقی خوای پەروەردگارە.

هاوەڵان نەیاندەزانی چۆن تەرمی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بشۆن، ئایا جلەکانی لەبەر داکەنن یاخود هەر بە جلەوە بیشۆن!

ڕای جیاوازیان کەوتە ناو کەسیان نەیاندەتوانی بڕیار بدەن، خوای گەورە هەموویانی خەو لێخستن و بە موعجیزەیەک و پاشان هەموو گوێیان لێبوو لە کاتی خەوەکەیاندا کەسێک لە دەرەوەی ماڵەکەوە پێی وتن، بە جلەکانییەوە بیشۆن و لەسەر جلەکانییەوە ئاوی پێدا بکەن.

ئەوانەی هەڵسان بە شۆردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەموو کەسە نزیکەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بوون واتا ئالوبەیت بوون، ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و ئوسامەی کوڕی زەید و شەقرانی خزمەتکاری پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئاویان پێدا کرد و عەباسی مامی و قیشمی کوڕی عەباس و فەزڵی کوڕی عەباس ئەمدیو و ئەو دیویان پێ دەکرد، هەروەها ئەوسی کوڕی خولی ئەنساری ئەویشیان لەگەڵدا بوو.

پاشان بە سێ پارچە قوماشی یەمەنی سپی کە لە لۆکە دروست کرا بوو کفنیان کرد و واتا نە دوورا بوو، هەوەها عەمامەشی لەسەردا نەبوو.



شۆردنی و کفنکردنی لە ڕۆژی سێ شەممەی ١٣ ڕەبیعولئەوەل ڕوویدا و لە دوای تەواو بوونی، ئینجا دەست کرا بە نوێژ کردن لەسەری و لەسەر جێگای خۆی دانرا لە ماڵی خاتوو عائیشە دا، خەڵکی دەستە دەستە هاتن نوێژیان لەسەر کرد، سەرەتا پیاوان و پاشان خانمان و دواتر منداڵان تا هەموو خەڵکی شاری مەدینە نوێژیان لەسەر کرد.

پاشان نەیاندەزانی چۆن لاشەی موبارەکی بە خاک بسپێرن!؟

دیسان ڕای جیاواز کەوتە نێوان هاوەڵان، تا ئیمامی ئەبوبەکر فەرمووی من گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ فەرمووی: پێغەمبەران لە کوێ ڕۆحیان کێشرا لەوێدا دەنێژرێت و بە خاک دەسپێردرێت. [١٣٧]

بڕیاریان دا لە ناو ژووری خاتوو عائیشەدا بە خاکی بسپێرن، دیسان ئیختیلاف کەوتە نێوانیان لەسەر شێوەی (لەحد) بینێژن، یان (شەق) کە شێوەی مەککە و مەدینەیە لە کۆتاییدا لەسەر شێوەی لەحد بە خاکیان سپارد نەك شێوەی ئەهلی مەدینە و هەردوو شێوەکە شەرعییە.

لە شەوی چوارشەمەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خاک سپێردرا.

هاوەڵان جێگای بڕوایان نەبوو کە بتوانن دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بژین، ئەوان بەسەر زەویدا بڕۆن و لاشەی موبارەکی لەژێر خاکدا بێت.

هاوەڵان کاتێک خۆڵیان دەکردە ناو گۆڕەکەی پێغەمبەر ﷺ دەیان فەرموو خەریک بوو دڵمان ئەتەقی ئەوەندە نارەحەت بووین، دڵمان وەکو جاران نەبوو، تا پێغەمبەرمان لە ناو دابوو هەموو دڵخۆش بووین، دڵ موطمەئین بووین، بەڵام ئێستا هەموو دڵتەنگین.

هاوەڵان خۆیان ئەدزییەوە لە خۆڵ کردن بەسەر تەرمی پێغەمبەر ﷺ دا، بەڵام لە کۆتاییدا دەبوو پڕۆسەکە کۆتایی پێبێت.

بۆ قەزا و قەدەری خوا گەڕانەوە نییە (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ).

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٣٧ ـ (مَا قَبَضَ اَللَّهُ نَبِيًّا إِلَّا فِي اَلْمَوْضِعِ اَلَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيهِ).



تاکە شتێک هاوەڵانی ڕاگرتبوو لەسەر ژیان و ئەو ئاواتە و ئومێدەیان مابوو کە بە خزمەت پێغەمبەر دەگەنەوە لە ڕۆژی قیامەت، پێش مەرگی دەیفەرموو (چاوەڕوانم لەسەر حەوز)، هاوەڵان لەوە دەترسان کە دوور بکەونەوە لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە گەڕەکەکانی مەدینە دا.

تەنانەت جارێک کەسێک هاتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی کەی ڕۆژی قیامەت دا دێت؟!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردووە؟!

وتی: خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەوەیت کە خۆشت دەوێت.

سوێند بەخوا، سوێند بەخوا، پێغەمبەر گیان ماکوانیش تۆی زۆر خۆش دەوێت، بەخوا ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و هەموو هاوەڵانم خۆش دەوێت.

ئاوات و ئومێدم ئەوەیە کە لەگەڵ ئێوە دابم، هەوڵ ئەدەم کرداری ئەوان بکەم.

هاوەڵان هەموو ئاوات و ئومێدیان ئەوە بوو کۆببنەوە لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَدا، بە تەنها لەسەر حەوزی کەوسەر یاخود لە دەرگای بەهەشت، بەڵکو لەناو خودی بەهەشتدا لە خزمەتیدا بن.

پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و فەرمووی: لە خۆم خۆشترم دەوێیت ئەی ڕەسولی خوا، پاشان لە هەموو کەس و کارم، لە کوڕەکەم، هەر کاتێک لەماڵەوەم هەمیشە باست دەکەم تاوەکو دێمە خزمەتت تا چاوم پێت دەکەوێت خۆشحاڵ دەبم، حەز دەکەم مەرگم پێش مەرگت بێت، یاخود مەرگی تۆ مەرگی من بێت، بەڵام ئەزانم کە تۆ چوویتە بەهەشت لەگەڵ پێغەمبەران دایت، خۆ گەر من بچمە بەهەشت نازانم لە کام پلەم ئەترسم نەتبینم.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، تا حەزرەتی جوبرائیل هات و ئەم ئایەتەی بۆ هێنا



﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾ [النساء]

واتە: ئەوەی فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەر بکات، جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن (لە بەهەشتی بەریندا) کەخوا نازونیعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا لەپێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵ و هاوڕێ و هاودەمێکی چاک و بێ وێنەن!

بەڕاستی هاوەڵان بە خۆشەویستی پێغەمبەرەوە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەژیان و دەمردن، هیوا و ئومێدیان گەیشتنەوە بوو بە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە بەهەشتدا، هەر ئەوە بوو پاڵی پێوە دەنان بۆ شەهیدبوون و ڕازی بوون بە بەخشینی ڕۆحیان، بۆ ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەربن.

بیلال لە سەرەمەرگ دابوو ڕازی بوو بە مەرگی، ئەی فەرموو دەگەڕێمەوە بۆ لای خۆشەویستم صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە کاتی مەرگیدا دەیوت. ( سبەینێ ئەگەم بە خۆشەویستانم محمد و یارانم). [١٣٨]

ئەوەتا فاطیمە لە خۆشی ئەوەی دەگات بە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەستی کرد بە پێکەنین، چونکە یەکەم کەس دەبێت لە ئالوبەیت دەمرێت.

ئەنەس دەڵێت: هەمیشە باسی پێغەمبەرم صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کردووە لە مەجلیسەکاندا، هیچ شەوێک نەخەوتووم پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ نەهاتبێتە خەوم.

ڕاستە پێغەمبەر بە لاشەی هاوەڵانی جێهێشت بەڵام هاوەڵان لەگەڵیدا دەژیان بە فیکریان بە عاطیفەیان، لە هەڵوێست و کرداریاندا هەمیشە ئەخلاقی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ تیایاندا ڕەنگی ئەدایەوە، هەمیشە لە خەونیاندا بوو، ئەمە بووە هۆکاری ئارامگری هاوەڵان لە دوای مەرگی ڕەسوڵی نوور.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٣٨ ـ (غَدًا أَلْقِيَ ٱلْأَحِبَّةَ مُحَمَّدًا وَحِزْبه).



## وتەی کۆتایی و تاج لەسەر کردنم

مەدالیای شەرەفی ئەوەم بەرکەوت کە ژیانی ئەو پێغەمبەرە عەزیزە بە دەستی خۆم بنووسم، لەم زیندانەوە خەڵاتی زێڕین و یاقوت و ئەڵماسی ژیانی پێغەمبەری خواصلى الله عليه وعلى آله وسلم م بردەوە، بەڵکو لە مەدالیای سنگم لام گەورە تر بوو، بۆیە هێشتا کەمە بڵێم بەهۆکاری نووسینی ژیانی باشترین پیاوی مرۆڤایەتی، من لە زیندانی طاغوت و خاچپەرستان تاجی پادشاییم کردە سەر، شانازی بە خۆمەوە دەکەم کە ژیانی تۆم نووسی ئەی خۆشەویستم، فەخر و سەربەرزی بۆ تۆی ئازیز ئەی ڕەسوڵی ئەکەرەم.

ناتوانم زیاتر وەسفت بکەم، ناچار قەڵەمەککەم دادەنێم و سوجدەی شوکر بۆ خوای دەبەم، بە تەواوبوونی پڕۆژەکەم.



## لە دوای بەرەندەیم لەم پرۆژەیە

ئەو کەسانەی کە خاوەنی دینن یان هەربێ دینن کاتێک پێغەمبەریان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ لە دوو توێی کتێبەوە ناسیبێت، نەیانتوانیوە چاو لە ئاستیدا بنوقێنن، بەڵکو بە پێوەری زانستی خۆیان توانیان بە پێغەمبەر محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بڵێن باشترین پیاوی مرۆڤایەتی.

زۆرن ئەوانەی وەسف و پێناسەی ئەم پێغەمبەرەیان کردووە کە خاوەنی دینی ئیسلامیش نین، بەڵکو تەنها ئاشنابوون بە ژیانی، جا ئەم کەسانە هەمە جۆرن، فەیلەسوف و بیرمەند و سیاسی و سەرۆکی دەوڵەت و شۆڕشگێرانی دونیا...هتد.

لێرەدا باسی هەندێکیان دەکەم نەک لەبەر خاتری ئەوەی کاریگەری لەسەر دڵ و دەروونی خواناس و ئیمانداران دروست بکەم، نا بەڵکو بۆ ئێمە بەسە کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾ [القلم]

واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت.

بەڵکو تەنها و تەنها وەکو مەنهەجێکی زانستی بۆ تەواوکردنی ئەم پرۆژە پڕ نوورە کە سەبووری شەوانی زیندان و خەم و خەفەتی دەست کافران و ئەو ستەمەی لێمان کراوە، بەهەرحاڵ زۆرن ئەوانەی پێناسەی پێغەمبەریان کردووە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ، هەندێک لەوانە:



# ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسی
# ئیمیل دێرمنگهام Emile Dermenghem



ئەمیل دەرمنگهام دەڵێت: پێویستە هەموو پێغەمبەرێک خاوەنی بەڵگەی پێغەمبەرایەتی بێت، هەروەها پێویستە خاوەنی موعجیزەیەک بێت کە ڕووبەڕووی هەموو نەیاران ببێتەوە، ئەویش خاوەنی قورئانە موعجیزەکەیەتی کە هاوشێوەی نییە، شێوە و نووسینی زۆر ناوازەیە، هێز و توانای ئەو قورئانە بەردەوامە تا دوا چرکەساتی ژیانمان، خەڵکی دەیخوێننەوە، ئەمەش هەر کتێبێکی سادە و ساکار نییە بۆ پەرستن و زاهید و عابیدەکان، بەڵکو محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ تەحەددای هەموو مرۆڤ و جنۆکەی پێکردووە کە هاوشێوەی بهێنن، ئەم تەحەددایەی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ هەموو گەلان نیشانەی ڕاستگۆیی محمدصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و پەیامەککەی دەردەخات و بێجگە لەوەی کە بەوردیی و دەقیقی باسی ڕووداوەکانی کردووە، جا ئەگەر ڕووداوەکە تایبەت بێت بە خودی خۆی، بە شێوەیەکی ئەقڵانی بەرگێکی وای کردووە بە بەردا کە خودی مانا و واتاکان ڕۆحێکی ئەقڵانی تری کردووە بەناو دەقەکاندا ئەمەش پێویست دەکات زیاتر لە نهێنی و توانا و کاریزما و عەزەمەتی و سەرکەوتنی بکۆڵینەوە.[١٣٩]

---

[١٣٩] ـ ئەم وتەیەی ئەمیل دەرمنگهام.لە کتێبی (حياة محمد) لا پەرە ١٩٥دا نووسراوە خۆی نووسەرەکەیەتی (إميل درمنجم) ئەم کەسایەتییە ڕۆژهەڵاتناسێکی فەڕەنسییە، لێپرساوی نووسینگەی ئاسەواری جەزائیر و ماوەیەکی زورتریش بەڕێوەبەری ئاسەواری ئەو وڵاتە بوو، لە ساڵی (١٩٢٩ز) کتێبی (ژیانی پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نووسیوە) هەروەها لە ساڵی (١٩٥٥ز) کتێبی (محمد و سوننەتی ئیسلامی) نووسیوە هەروەها زیاتر لە دەیان لێکۆڵینەوەی کردووە لە (گۆڤاری ئەفریقا) و (لە پەیمانگای لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵات) و (لێکۆڵینەوەی دراساتی عەرەبی

تەماشای نەجیب ئەلعەقیقی بکە: المستشرقون، ئەلقاهیرە، چاپی / ٥ بەرگی (١)ل ٣٤٨ أسوة للعالمين، د. ڕاغب السرجاني ل ٥.



# مێژوونوسی ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیز
## William Muir ویلیام میێر



ویلیام میێر: دەڵێت؛ محمد ﷺ پیاوێکی سادە و ساکار بوو لە ژیاندا، بەڵام خاوەن ئەقڵ و هێزی بیرکردنەوەی قووڵ بوو لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی ڕەوشت بوو لە مامەڵە کردن دا، خاوەنی تەوازوع بووە، بە بەزەیی بووە، خاوەن ئارامگری زۆر بووە، بەخشندەیەکی بێ وێنە بووە، خەڵکی زۆر زوو خۆشیان ویستووە، ئەوانەی دەوروبەری خۆشەویستییەکی بێوێنەیان بۆی هەبووە، هەرگیز بانگەوازی کەسی ڕەت نەکردۆتەوە ئەگەرچی کەسێکی زۆر کەمیش بووبێت لەناو کۆمەڵگەدا، هەرگیز دیاری نەگەڕاندۆتەوە ئەگەر کەمیش بووبێت، هەرگیز خۆی بە گەورە نەزانیوە لە ناو مەجلیس و هاوڕێ و هەژاران هیچ کەس لەلایدا خۆی بەکەم نەزانیوە, محمد بە چاوی کەم و بچووک تەماشای کەسی نەکردووە، لەگەڵ خۆشی خەڵکدابوو لە خۆشیاندا پێکەنیوە، لەناو ناڕەحەتییان دابووە لەگەڵیاندا خەمبار بووە هاوسۆزییان بووە، حەزی بە یەکسانی بووە، لەکاتی ناڕەحەتی و سەختی ژیان قوت و بەشی خۆی لەگەڵ خەڵکیدا بەش کردووە، هەروەها لە کاتەکانی ژیانیدا هەمیشە لە بیرکردنەوە و سەرقاڵی ئەوە بووە خەڵکی لە دەوری چۆن خۆشگوزەران بێت، کتێبی (مرآة محمد) سعید حوی: الرسول ل ١٤٧، د. ڕاغب سرجاني.

هەروەها دەڵێت: لە صیفاتی محمد کە شایەنی باسکردنە، ئازادی بووە لە ڕووی تێگەیشتنەوە، نەرم و نیان و ڕێزی زۆری لە هاوەڵان گرتووە، لێخۆشبوو و نەرم و نیانی بە ڕەحمی لە ناو کەسایەتیدا تێکەڵ بووە، هەرچی لە دەوری بووە خۆشیان ویستووە تەنانەت دوژمنە خراپەکارەکانی بەوپەڕی ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ کردوون و زۆری پێ بەخشیون، خاوەنی کەرەم بوو لەگەڵ خەڵکی شاری مەککە کە دەریان کرد و بۆ ماوەی ساڵانێکی دوور و



درێژ دوژمنایەتیان کرد، تا حیکمەت و حیلمی دەرکەت و هەموویانی بەخشی، (حیاة محمد) لە کتێبی عەبدوڕحمان عەزام ل ٤٤-.٤٥.[١٤٠]

[١٤٠] ـ ویلیام میێر: لە ساڵی (١٨١٩- ١٩٠٥)ز. ڕۆژهەڵاتناس و مێژوونووسی ئینگلیزی بوو، هەروەها لێکۆڵەرەوەی ئیسلام بووە توێژینەوەی لەسەر ڕەوشتی پێغەمبەری صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کردووە، لە وڵاتی هیندستان لە ساڵی ١٨٣٧ز. یاسای خوێندوە لە زانکۆی ئەدنبرە و پاشان لە گلاسکۆ توانی بگاتە پلەی سەرۆکی زانکۆی ئەدنبرە، خاوەنی چەند کتێبێکە لەوانە: سیرەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ مێژووی خیلافەت، مێژووی دەوڵەتی مەمالیك لە میسر، بێجگە لە نووسین و شیعر.



# پزیشک و ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسی

## جۆزف چارڵس ماردریس Joswph Charles Mardrus



جۆزف چارڵس ماردرێس: لە کاتێکدا وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنسا و هەروەها وەزارەتی ڕۆشنبیری فەڕەنسا داوایان کرد لە جۆزف چارڵس ماردرێس ٦٢ سورەت لە قورئان وەربگێڕێت بۆسەر زمانی فڕەنسی لە ساڵی ١٩٢٦ز. پڕۆژەکەی کۆتایی پێهێنا.

دەڵێت بەڕاستی دان بە قورئان دا دەنێم: شێوەی قورئان لە ئوسلوبی نووسینی مرۆڤ ناچێت، بەڵکو ئوسلوبی خالقی ئەم بوونەیە، ئەو شێوە و میتۆدەی لە قورئان دا بەکارهاتووە تەنها و تەنها ئوسلوبی خوایە، هەرچی کتێبی ئەم جیهانەیە لەبەردەمیدا گەردەنکەچن، (گۆڤاری هەنار، محمد رشید رضا ل ٣٣ ژمارە ٢٨٢).[١٤١]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤١] ـ جۆزف چارڵس ماردرێس (١٨٦٨- ١٩٤٩)ز. ژیاوە پزیشك و ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسییە، لە قاهیرە لە دایك بووە، لە پاریس بۆ پزیشکی خوێندوێتی، وەرگێڕی قورئانی پیرۆز بووە بۆ زمانی فەڕەنسی خاوەنی کتێبی (هەزار ویەك شەوە)یە بە فەڕەنسی.

نجیب العقیقي: المستشرقون بەرگی ١ ل ٢٤١.

اسوة للعالمین. د. راغب السرجاني ل ١١٢.



# ڕەخنەگر و نووسەری سکۆتلەندی
# تۆماس کارلایڵ Thomas Carlyle



تۆماس کارلایڵ: محمد هەرگیز لە خەڵکی درۆزن و ساختەکار هەژمار ناکرێت بۆ گەیشتن بە دەسەڵات درۆ و چەواشەکاری بەکار نەهێناوە، تا تەماعی لە سوڵطان و پارە و سەروەت و سامان هەبێت، بەڵکو محمد خاوەنی پەیامێک بوو گەیاندی بە ڕاشکاوانە و ئاشکرا، دەنگی بەرز بوو، هیچ نهێنی نەبوو، محمد هەرگیز بە درۆزن و چەواشەکار ناژمێردرێت چونکە خاوەن سروشتی پاک و دڵێکی پاک بوو, ئەو نوورێک بوو جیهانی بە گشتی ڕووناک کردەوە.

ئینجا نموونەیەک دەهێنێتەوە بۆ ژیانی پێغەمبەر ﷺ (نووسەر) (الأبطال، کارلایڵ، ل ٥٨).

لە ژیانتاندا بینیوتانە کەسێکی درۆزن بانگەشەی ئایینێکی ئاوا گەورە بکات؟!

ئایا لە ژیانتاندا بینیوتانە کەسێکی درۆزن دینێکی ئاوا عەجیب بهێنێت؟!

درۆزن ناتوانێت بونیاتیماڵێک بکات بە قوڕ، لە کاتێکدا شارەزا نییە.

بە کۆڵەکە و گەچ و خۆڵ ئایا خانوو دروست کردن درۆزن کە شارەزا نەبێت بەوەستایی داخۆ دەبێت چی بونیاد بنێت؟!



لە کاتێکدا ئەو بونیادی ماڵێکی کرد وا دوانزە سەدەیە بوونی هەیە و ٢٠٠ ملیۆن[١٤٢] موسڵمان شوێنی کەوتوون،

بەڵام جێگای خۆیەتی باسی بکەم کە ئەوەی ئەو بونیادی نا لەگەڵ یاساکانی سرووشت گونجاوە، ئەگەر درۆی بکردایە، ئەو کافرانە وازیان لێ نەدەهێنا، ئەی دەتوانی محمد بە درۆ ئەو هەموو خەڵکی گەل و ئەممەتە هەڵخەڵەتێنێت، (الأبطال، کارلایڵ، ل ٤٣).

پاشان دەڵێت: مولحید و دەمارگیرەکان دەڵێن: "محمد هیچ کات قیامەتی نەویستووە، بەڵکو هەوڵی بۆ ناو شوهرەت و ناوباگ بوو، نا سوێند بەخوا وا نییە، بەڵکو محمد کەسێکی بە ڕەحم و بەخشندە و پڕ سۆز و خێر بووە، سەراپا حیکمەت و چاکە خواز بووە هەموو بیروبۆچوونەکانی دژی دونیا ویستی بووە، هەرگیز بەدوای دەسەڵات و سوڵطانەوە نەبوو، (تۆماس کارلایڵ، الأبطال ل(٦٨-٦٩).

ئەوەی من لە محمدا دەیبینم، کەسێکی شەریف و سوپاسگوزار و خاوەن کەرامەت و خەصلەتی تایبەت بووە، ڕوون و ئاشکرا دیارە کەسێکی خاوەن ئەقڵ و زیرەکی و پێوانەی ڕاست و دروست بووە، پیاوێکی زۆر بەهێز و ناوازە بووە، ئەگەر بیویستایە دەیتوانی شاعیر بێت کەس لە ئاستیدا نەوەستاوەتەوە یان سوارچاک و بەهێزی بیویستایە خاوەنی بوو کەس لەو بەهێزتر نەبوو، یان دەیتوانی پادشا بوایە، هەر شتێکی دونیا بیویستایە بۆی دەکرا، بەڵام پێغەمبەر بوو. (کارلیل، الأبطال، ل ٨٢).[١٤٣]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٢] ـ لەو کاتەی ئەم باسەی نوسیووە ژمارەی موسڵمانان ٢٠٠ ملیۆن بووە، ئێستا ژمارەی موسڵمانان نزیکی ٢ ملیار کەسە.

[١٤٣] ـ تۆماس کارلایڵ لە ساڵی (١٧٩٥- ١٨٨١)ز. ژیاوە، نووسەر و ڕەخنەگری هەجوو بووە، هەروەها مێژوونوس بووە، خاوەنی کتێبی (شۆڕشی فەڕەنسا) بوو، لە کتێبی (الأبطال) لەم کتێبەدا بەندێکی تایبەت کردووە بە کەسایەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ، هەروەها مامۆستا عەلی ئەدهەم ئەوەی وەرگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی و نجيب العقيقي لە کتێبی المستشرقون بڵاوی کردۆتەوە بەرگی ٢ ل ٥٤.

دکتۆر راغب السرجاني لە کتێبی أسوة للعالمين ئاماژەی پێداوە لە لاپەڕەکانی (٤٢) و (٢٤١) و (٢٤٢).



## نووسەر و شاعیر و سیاسی فەڕەنسی
## ئەلفۆنس دی لامارتین Alphonse de Lamartine



ئەلفۆنس دی لامارتین: دەڵێت: ئەواندەی کە دەڵێن محمد کەسێکی چەواشەکار و هەڵخەڵەتێنەر بووە، خاوەنی درۆ و کاری هەڵبەستراو بووە.

لە دوای ئەوەی بە شوێنیدا ڕۆیشتم و لە ژیانی لێکۆڵینەوەم کرد، بۆم دەرکەوت ئەوەی خاوەنی درۆ و چەواشەکاری و هەڵبەستراو و ساختەکاری و دروست کردنی سکانداڵ بوون، ئەو کەسانە بوون کە چەواشەیان دابووە پاڵ ناوی محمد!

(کتێبی: گەشتەکەم بۆ ڕۆژهەڵات، لاپەڕە ٨٤).

هەروەها دەڵێت: کێن ئەوانەی ئەو جورئەتە ئەدەن بە خۆیان و محمد پێوەر دەکەن بە سەرکردە و ناودارەکانی جیهان لە مێژووی نوێدا، ئەوان لە کاتێکدا جەنگیان دروست کرد و یاسایان دارِشت ئیمپراتۆریان دروست کرد زۆری نەبرد لە ناوچوون کۆتاییان پێهات، ئەو توانی بۆ هۆکاری تواناکانی نەک هەر سوپا دروست بکات و گەلێک حوکمڕانی بکات، بەڵکو ئەو ملیۆنەها خەڵک خۆشیان دەوێت و سێیەکی جیهان لەگەڵیدان و بە سوپا و تەشریعات و ئیمپڕاتۆر وازی نەهێنا بەڵکو هەرچی قومار و خورافیات و بیروباوەڕی خراپ بوو لەناوی برد، بەهەموو پێوەرێک ئەو گەورەی مرۆڤایەتییە.

ئەمەوێت لێتان بپرسم: هەیە لەم جیهانەدا لە محمد گەورەتر؟!

کتێبی مێژووی تورکیا ل ٢٧٦-٢٧٧.[١٤٤]

---

[١٤٤] ـ ناوی: ئەلفۆنس دی لامارتینە، نووسەر و شاعیر و سیاسی فەڕەنسییە، زۆر گەڕاوە بە جیهاندا ماوەیەکی زۆر لە ئەزمیری تورکیا ماوەتەوە، لە ساڵی (١٧٩٠-١٨٦٩)ز. ژیاوە، خاوەنی کتێبی (گەشتەکەم بۆ ڕۆژهەڵات)، هەوەها خاوەنی کتێبی (مێژووی تورکیایە).



## زانای کۆمەڵناسی فەڕەنسی
## گوستاڤ لابنی Gustav Lobne



گوستاڤ لابنی دەڵێت: من بانگەشەی داهێنانێک یان زیادەیەک ناکەم یان بۆ سەرلێشێواندنی خەڵکی هەوڵ بدەم، بەڵکو سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ ئایینێکی عەرەبی، کە خوای پەروەردگار سرووشی کردووە بۆ پێغەمبەرەکەی بەناوی، لە ڕاستیدا محمد ﷺ دەستپاک و ئەمین بوو بۆ گەیاندنی بانگەواز و پەیامەککەی لە ناو عەرەبدا، لە کاتێکدا عەرەب جاهیل بوون بەرد و بتیان دەپەرست لەزەتیان لە تڕۆهاتی جاهیلی دەبینی و تواببوونەوە تێیدا.

ئەو کۆیکردنەوە و ڕیزەکانی ڕێکخستن و قسەی کردن بە یەک و لە کاتێکدا ئەوان پارچە پارچە بوون، هەمووی کردە یەک ڕووگە بۆ پەرستنی خوای ئەم بوونەوەرە، خۆی باشترین کەس و چاکەخوازترین کەس بوو لە خۆشەویستی و لە نەسەب و لە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیدا قورئانێکی عەرەبی دەخوێندەوە.

هەروەها دەڵێت: محمد بەوپەڕی سنگ فراوانی ئازار و ئەشکەنجەیان ئەدا و خاوەنی صەبر و ئارامگرییەکی بێوێنە بوو، پاشان محمد ﷺ مامەڵەی زۆر باش بوو لەگەڵ قوڕەیشدا لە کاتێکدا ئەوان دوژمنی سەرسەختی بوون لەماوەی ٢٠ ساڵدا، بەڵام ئەو پێغەمبەرە زۆر بە لوتف و حەکیمی مامەڵەی لەگەڵ کردن، (شارستانیەتی عەرەب، ل١٠-١٠٥).[١٤٥]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٥] ـ گوستاڤ لابنی لە ساڵی (١٨٤١-١٩٢١)ز. ژیاوە، ڕۆژهەڵاتناس و کۆمەڵناسی جیهانییە، ناسراوە بە لێکۆڵینەوە لە بواری زانستی کۆمەڵناسی و دەروونناسی لە ئەوروپادا لە کتێبە بەناوبانگەکانی (شارستانیەتی



# بیرمەندی ئینگلیزی

## Lane Poole



لەین پوڵ دەڵێت: بەڕاستی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم خاوەنی سیفات و پێناسەی زۆرە، وەکو لوتف و کەرەم و ڕەوشتی بەرز و ئازایەتی...هتد.

هەروەها دەڵێت: مرۆڤ کە شوێن ژیانی دەکەوێت کاریگەری ڕەوشتی دێتە سەر، ئەم وەسف و پێناسەیە لە ئارەزوو هەوا و نەفسەوە نەهاتووە، بەڵکو کاریگەری محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕاستی و ژیانی ئەوت پێدەڵێت، محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم زۆر ئارامگر بوو لە بەرامبەر عەشیرەت و کەسەکانی، بە درێژایی ساڵانێکی طوڵانی کێشایان بە ئێسقانەکانی دا، بەڵام ئەو زۆر لە گەورە و چاکەی خۆی موبالەغەی کرد، ئەوەی دەستی بۆ درێژ بکردایە ئەم خێرا دەستی یارمەتی بۆ دەبرد، تەنانەت ئەگەر منداڵێکیش بوایە، هەرگیز بەلای کۆمەڵێکدا ڕەت نەبووە جا پیاوان بن یان ئافرەتان یاخود منداڵان، محمد سڵاو و هەواڵ پرسینی کردوون، لەسەر لێوەکانی شیرینترین زەردەخەنەی لەسەر بووە لەکاتی قسەکردنی دا خاوەنی دەنگێکی خۆش و بەئاواز بووە، وەکو سیحری کرد بێت لە گوێی خەڵکی، هەروەها زۆر بە زوویی دڵی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە (ئەم وتەیە لە کتێبی (پەیامێک لە مێژووی عەرەب) وەرگێڕاوە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

عەرەب) کە باس لە شارستانیەتی ئیسلامی دەکات دکتۆر علی عامر لە کتێبی (الإسلام و الرسول في فكر هؤلاء) ل ٥٩-٦١.

وەرگیراوە هەروەها دکتۆر راغب سرجانی لە کتێبی أسوة للعالمين (٢٤٢).



لەلایەن نووسەر (عەفیف عبدالفتاح طبارە) ئەویش لە کتێبی (روح الدین الإسلامی) ل ٤٣٨ باسی کردووە و منیش لە دکتۆر راغب السرجانیم وەرگرتووە کتێبی (أسوة للعالمین) ل ٢٤٣).[١٤٦]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٦] ـ لەین پوڵ لە ساڵی (١٨٥٣- ١٩١٧)ز. ژیاوە بیرمەندی ئینگلیز بووە خاوەنی دانانی فەهرستی (المسکوکات) کە پارێزراوە لە (دارالکتب المصریة) لە ساڵی ١٨٩٧ کتێبی (رسالة فی تاریخ العرب) نووسیوە.



## نووسەر و ئەدیب ئینگلیزی خاوەن خەڵاتی نۆبڵ
## جۆرج برنارد شۆ George Bernard Show



جۆرج برنارد شۆ دەڵێت: لێكۆڵینەوەم لە ژیانی محمد كرد، چونكە بیستبووم دەیەوێت پێشبڕكی لەگەڵ مەسیح دا بكات و خۆی لەو بە بەرزتر بزانێت!

بەڵام لە ڕاستییەوە زۆر دوور بوو، بەڵكو ژیانی هیچ پەیوەندی بە (مخاصەمەی) مەسیحەوە نەبوو، بەڵكو بینیم ڕزگاركەری مرۆڤایەتی بوو، ئەوروپا لە ئێستادا وا عاتفی بیروباوەڕی یەكتا پەرستی محمدە، ئەگەر زیادەڕۆیی نەكەم زۆر زیاتر دەڵێم بەڵكو بیروباوەڕی یەكتاپەرستی چارەسەری كێشەكانمانە لە ئەوروپادا، پێویستە بەو تێگەیشتنە و ڕۆحەوە لە پێغەمبەرایەتی تێبگەین (الحسيني الحسيني مجدي) لە كتێبی (الرسول في عيون غربية منصفة) ل ٧٠، لە كتێبی د. راغب هەمان سەرچاوە وەرگیراوە.[١٤٧]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٧] ـ جۆرج برنارد شۆ لە ساڵی (١٨٥٦- ١٩٥٠)ز. ژیاوە نووسەرێكی بەناوبانگی ئینگلیزیە و خاوەنی خەڵاتی نۆبلی ئەدەبە لە ساڵی ١٩٢٥ز، هەروەها داوای لێكرا لە لەلایەن چەند كەسێكی ناحەز بە ئیسلام لە وەزارەتی رۆشنبیری ئەو وڵاتە كە شانۆگەرییەك بۆ ناشرینكردنی محمد بنووسێت، ئەویش بە هەموو شێوەیەك ڕەتی كردەوە و كاری وای نەكرد، بە دووورودرێژی ئەم باسە لە كتێبی (الإسلام ورسوله في فكر هؤلاء) نووسەری كتێب (أحمد حامد) ل ١٣-١٥.



# مێژوونوسی ڕۆژهەڵاتناسی ئەمریکی
# Washington Irving



واشنطتۆن ئیرڤینگ دەڵێت: مامەڵەی کرداری محمد لەکاتی فەتحی مەککەدا ئەی سەلمێنێت کە پێغەمبەرێکی نێردراوە، هەرگیز وا دەرناکەوێت کە سەرکردەیەکی سەرکەوتووی براوەی جەنگ بووبێت، چونکە خاوەنی ڕەحم و بەزەیی زۆر بووە بەرامبەر هاولاتیانی لەگەڵ ئەوەی کە خاوەن هێز و دەسەلات بووە، هۆکاری سەرکەوتنی بەهۆی ڕەحم و بەخشندەیی بووە. (ژیانی محمد لا٧٢).[١٤٨]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٨] ـ واشنتۆن ئیرڤینگ لە ساڵی (١٧٨٣- ١٨٥٩)ز. ژیاوە، ڕۆژهەڵاتناس و مێژوونوسی ئەمریکی بووە تایبەتمەند بووە بە لێکۆڵینەوەی ئیسلامی لە کتێبەکانی ئەنووسی لەسەر (ژیانی محمد) (فتح غرناطة)، المستشرقون: نجيب العقيقي (بەرگی ٣ ل ١٣١).



# زانا بواری زانستە سرووشتییەکان بەلجیکی جۆرج سارتۆن George Sarton

جۆرج سارتن دەڵێت: پوختەی وتە دەبێت محمد بە پێغەمبەران پێوەر بکەین خۆ ئەگەر پێوەریشمان کرد هیچ پێغەمبەرێک لە پێش ئەو و دوای ئەو ناتوانێت ئەو سەرکەوتنانەی ئەو کە بەدەستی هێناوە بەدەستیان بهێنێت، (الثقافة الغربية فی رعاية الشرق الأوسط) لا٣٠٢٨ سارتن.[١٤٩]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٩] ـ جۆرج سارتۆن (١٨٨٤- ١٩٥٦)ز. ژیاوە خەڵکی بەلجیکایە، زانا و تایبەتمەندە لە بواری زانستی سرووشتییەکاندا، هەروەها کەسێکی وەرزشوان بووە، لە زانکۆی عەرەبی ئەمریکی لە بەیروت وانەی وتووەتەوە لە ساڵی ١٩٣١- ١٩٣٣ز. خاوەنی کتێبی بەناوبانگی (المدخل الی تاريخ العلم) نجيب العقيقی هەمان سەرچاوە بەرگی ٣ ل ١٤٧-١٤٨، د. راغب السرجانی ل ٢٤٥ هەمان سەرچاوە.



# لێکۆڵەرەوە لە فەلسەفە (بەریتانیی)
# کارن ئارمسترۆنگ Karen Armgstrong



کارن ئارمسترۆنگ دەڵێت: دڵنیابوون لە پێغەمبەرایەتی محمد شتێکی بەڵگەنەویستە چونکە لە ژیانیدا خوێندەواری نەبووە، لە منداڵییەوە تا تەمەنی گەورەیی نەیتوانیوە بنووسێت و بخوێنێتەوە، ئەمەش ئامراز و ئامێری سەرەکی زانست، هەروەها لە ژیانیدا سەفەری نەکردووە، لە هەموو ژیانی یەک سەفەری کرد بۆ بوصرا لەگەڵ غولامێک کەکاری بۆ خەرج دەکرد، ناکرێت بڵێین لەیەک سەفەردا ئەم هەموو شتانەی دەستکەوتووە، (سیرة النبي محمد، ل ١٥١)، (د. راغب سرجانی هەمان سەرچاوە ل ٣٦٤).[١٥٠]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٥٠] ـ کارن ئارمسترۆنگ ٢٤ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٤٤ لە دایك بووە لە ساڵی ٢٠١٧ مردووە، هەندێک دەڵێن بە موسڵمانی مردووە هەندێک دەڵێن بەردەوام کاتۆلیك بووە، بەهەرحاڵ خاوەنی سیرەی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و خاوەنی کتێبی نایابی (ئیسلامە)، وەرگێڕاوەتە سەر زۆربەی زمانەکانی ئەوروپا، جێگای بایەخی هەموو ناوەندی ڕۆشنبیری و سیاسییەکانە.



## فەیلەسوف و بیرمەندی ئینگلیزی

لایتنر دەڵێت: ئەوەندەی من شارەزام لە ئایینی یەهوودی و نەسرانی هەرگیز محمد هیچی لەوان وەرنەگرتووە، بەڵکو وەحی بۆ هاتووە. (دین الإسلام) ل ٤- ٥ د. راغب سەرچاوەکانی هەمان سەرچاوە .٣٥١[١٥١]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٥١] ـ لایتنر، لێکۆڵەر و بیرمەندی بەریتانییە و خاوەنی چەندین دکتۆرایە لە بواری شەریعەت و فەلسەفە و لاهوت، هەروەها ساڵی ١٨٥٤ چۆتە ئەستانە و بەیعەتی خیلافەتی ئیسلامی، زۆرێك لە وڵاتانی ئیسلامی گەڕاوە، پەیوەندی زۆر باش هەبووە لەگەڵ زانا و سیاسییە موسڵمانەکان، خاوەنی کتێبی دین الإسلام ل. ٤و٥ ئەم وتەیەی نووسیوە.



## ڕائیدی لێکۆڵەرەوە لە سوپای بەریتانی
## ڕۆناڵد ڤیکتۆر بودلی Ronald Victor Bodley



ڕۆناڵد ڤیکتۆر بودلی دەڵێت: هەندێک چاوبرسی و نەزان بانگەشەی ئەوە دەکەن هاتنی وەحی بۆ محمد خەیاڵ بووە, بەڵکو نەخۆشی دەروونی بووە وەکو فێ و پەرکەم و نەخۆشی صرع...هتد

لە وەڵامدا دەڵێم چ ناوێکی لێدەنێن بینێن، بەڵام خۆ ئەگەر (فێ بێت، یان جنۆکە، یان مەلاریا، یاخود لە هۆش چوونی ڕۆحی... هتد) کام لەم نەخۆشیانە خاوەنەکەی کردووە بە پێغەمبەر؟

یاخود کە تەشریع دابنێ و یاسای بەهێز و بە لێزانی کە لە توانای فەیلەسوفدا نییە؟

کام پیاو هەیە لەسەر زەویدا خاوەنی صرع و فێ و پەرکەم بێت بتوانێت ببێتە خاوەن حوکم و سوڵتانی هەزار ساڵەی هەبێت؟!

بەڕاستی ئەوەی کە خاوەنی ئەقڵ بێت تەنها و تەنها محمد بووە.

لە کتێبی The messenger the life of mohammed ل ٥٨-٥٩ هەمان سەرچاوی پێشوو ل (٣٥٠).[١٥٢]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٥٢] ـ ڕۆناڵد ڤیکتۆر بودلی: ڕائیدی لێکۆڵینەوەی سوپای بەڕیتانی بووە لە ١٩٠٨ز. لە عێراق و ئەردەن کاری کردووە، پاشان ڕاوێژکاری سەڵتەنەتی مەسقەط بووە یەکەم کەس بووە بە بیابانی (الربع الخالي) ڕەت بووە،



# ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (١٨٨٩- ١٩٧٥)ز.
# Arnold Toynbee ئارنۆڵد توینبی



ئارنۆڵد توینبی دەڵێت: ژیانی پێغەمبەری عەرەبی و هۆش و بیرەوە خوێندنەوەی کەسایەتی لای موسڵمانان لە بەرزترین جێگا و (ئەعلای عەلییە), هەموو ئیمانیان بەپەیامەککەی هێناوە و هەروەها سونەتی بۆتە سەرچاوەی یاسا، ئەم یاسایانە تەنها باسی لە ڕێکخستنی کۆمەڵگەی ئیسلامی ناکات، بەڵکو ڕێکخستنی پەیوەندی موسڵمانانی سەرکەتوو و فاتیحەکان دەکات بە چاودێر و ئاگابوون بە خەڵکی نا موسڵمان و ئایینە جیاوازەکان، (مختصر دراسة التاريخ) بەرگی ٣/ ل ٩٨ / هەمان سەرچاوە.[١٥٣]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

کاتێك کە خانەنشین بوو لەناو سەحرادا ژیاوە، زۆر لێکۆڵینەوەی هەیە لەسەر بیابان و لە کتێبەکانی (الرسول حياة محمد).

١٥٣ ـ ئارنۆڵد تیوینبی: نووسەر و مێژوونووسی ئابووری ئینگیلزی بووە، کاری کردووە لەبەرەو باشتر بردنی کەرتی کاروکارگوزاری و کرێکاران لە بەریتانیا، توینبی بە نوێترین و گرنگترین مێژوونووس دادەنرێت کە بە شێوەیەکی ورد و هەمەلایەنە لێکۆڵینەوەی لەسەر پرسی شارستانیەتەکان کردووە، بە تایبەت لە ئینسایکلۆپیدیای مێژوویی خۆیدا بە ناوی "لێکۆڵینەوەیەک لە مێژوو" کە لە دوانزە بەرگ پێکهاتووە کە چل و یەک ساڵ بەسەری بردووە بۆ نووسین .



## نووسەر و لاهوتزانی مەسیحی سەربازی دەربەدەری فەڕەنسی
## هێنری دی کاستریس Henri de Castries

**هێنری دی کاستریس دەڵێت: ئیسلام سەیر و ناوازەیە تەنها بە تێکەڵبوونی ژیان لەگەڵیدا چاولێکردنی بە زوویی بڵاو دەبێتەوە، بێ ئەوەی زۆر لە خەڵکی بکات و بانگەوازچی و مژدەدەری هەبێت، زۆر بە ئاسانی ئەو کەسەی کە سەختە بۆ دینداری کەچی دەبێتە موسڵمان و بەڕاستی دینەکەی دەگرێت، لەبەر ئەوەی ئیسلام بە پلەبەندی دێت و دڵی خەڵکی ڕادەگرێت.[١٥٤]**

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٥٤ ـ هێنری دی کاستریس، لە ساڵی ١٨٥٠ی زایینی لەدایک بووە و لە ساڵی ١٩٢٧ی زایینی کۆچی دوایی کردووە، نووسەری مەسیحی فەڕەنسی بووە، ماوەیەکی زۆر لەناو جەزائیرییەکان ژیاوە.

بە یەکێک لە دادپەروەرترین ڕۆژهەڵاتناسە بیانییەکان دادەنرێت بەرامبەر بە ئیسلام، لە کتێبەکەیدا دەڵێت: "هزر و بیری ئیسلام"؛

ئاماژەی بەوەشکردووە، ئامانج لەو کارەی ئەوەیە کە هاوڵاتیانی خۆی لە وێنەیەکی دروستی ئیسلام ئاگادار بکاتەوە بۆ ئەوەی بە ڕاسترین زانیاری لەسەر ئەو باوەڕەی کە بەشێک لە ڕەعیەتەکانیان لە کیشوەری ئەفریقا لە باوەشی گرتووە دەورە بدرێن، ئەمەش کارئاسانییان بۆ دەکات بۆ گەیشتن بە لێکتێگەیشتنەکان و کۆنترۆڵکردنیان".



# بیرمەند ڕۆژنامەنوسی ڕووسی
# Leo Tolstoy



لیۆ تۆلستۆی دەڵێت: لە چاکەکانی ئایینی ئیسلامی ئەوەیە کە وەسیەتی کردووە بۆ موسڵمانان چاک بن لەگەڵ ئایینی یەهوودی و مەسیحیدا، هەروەها لەگەڵ پیاوانی ئایینەکانی ئەو دینانە بەگشتی، هەروەها فەرمانی پێکردوون کە چاکخواز و مامەڵەی باشیان لەگەڵدا بکەن تەنانەت ڕیگەی داوە کە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتانی مەسیحی و یەهوودیدا بکەن لەگەڵ ئەوەی لە هیچ کێشەی نییە لەگەڵ مانەوەیان لەسەر ئایینەکانیان، لای خاوەن ئەقڵ و چاو کراوەکان ئاشکرایە کە ئەم ئاسانکارییە تەنها لە ئایینێکی گەورەوە دەویسترێت، هەر لایەکی ئیسلام تەماشا دەکەیت و لێی قوڵ دەبیتەوە گەورەیی و جوانی پێغەمبەر و ئایینەکەی دەردەخات (کتێبی، حکم النبي محمد) ل ٤٤ هەمان سەرچاوەی پێشوتر.[١٥٥]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٥٥] ـ ڕۆماننووس و چاکەخوازی کۆمەڵایەتی و بیرمەند و نووسەری گەورەی ڕووسی (لیۆ تۆلستۆی) ساڵی (١٨٢٨- ١٩١٠)ز ژیاوە، زۆر سەرسام بووە بە کەسایەتی پێغەمبەری خوا هەمیشە لە پەیوەندی دابووە لەگەڵ جیهانی ئیسامی و ئاشنایەتی زۆر باشی لەگەڵ زانای بەناوبانگ (محمد رشید رضا) (محمد عبده)، ( اقبالی لاهوری)دا هەبووە هەندێك دەڵێن بە هۆکاری موسڵمانبوونی ژنەکەی وتی شێت بووە کردییە دەرەوە، شەوێك لە ناو وێزگەی شەمەندەفەر کۆچی دوای کرد، لە کاتێك لیۆ تۆڵستۆی زۆر دەوڵەمەند بوو، بەڵام بە هاوکاری سەروەتە زۆرەکەی ئەو پلانەی لەلایەن خێزانەکەیەوە بۆ ڕێکخرا، خاوەنی چەندین کتێب و ڕۆمانە، بیرمەندێکی خاوەن بیری قوڵ و بیرکردنەوەی زۆر بووە، ئاشنایەتی بە پێغەمبەر تەنها لە ڕێگای (٤٠ فەرموودەی پێغەمبەری خواوە بووە)، (خاوەنی کتێبی فەرمانڕەوای پێغەمبەر محمد)ە.



# ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانی
# ئارنۆڵد واڵکەر تۆماس Arnold Walker Thomas



ئارنۆڵد واڵکەر تۆماس دەڵێت: بە جددی تەماشای کۆمەڵ و گروپی مەسیحی و ئایینەکانی تر بکەین کە لە ژێر فەرمانڕەوای ئیسلامیدا بوونیان هەیە کە زیاد لە هەزاران ئایینە، ئەمەش چەندین بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای ئەوەمان دەداتێ کە ئیسلام ئایینی پێکەوەژیان و لێبووردەییە، بە درێژایی دەسەڵاتی مەسیحی موسڵمانان خاوەنی نەبوون لە ژێر فەرمانڕەواییدا، ئەمەش گەورەترین نیعمەتە بۆ مەسیحییەکانی ژێر فەرمانڕەوایی موسڵمانان.

(کتێبی : الدعوة الی الإسلام، نووسینی: ئارنۆڵد تۆماس، ل ٨٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هەروەها دەڵێت: ئەو بیرۆکەی کە ناحەزان بۆ ئیسلام بڵاویان کردۆتەوە گوایە ئیسلام بە شمشێر خەڵکی موسڵمان کردووە و بیروباوەڕی ئیسلامی داوە بەسەریاندا زۆر دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە لە بنەڕەتدا تیۆری بیروباوەڕی ئیسلامی پابەندە بە لێبووردەیی و ئازادی و ئازادی ئایینەکان و پێکەوە ژیانیان (کتێبی: الدعوة الی الإسلام) ئارنۆڵد تۆماس ل ١٠٢.[١٥٦]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٥٦ ـ ئارنۆڵد واڵکەر تۆماس ساڵی ١٨٦٤-١٩٣٠ز. ژیاوە، ڕۆژهەڵاتناسێکی بەناوبانگی بەریتانی بوو، سەرەتای کاری ئەکادیمی لە زانکۆی کامبریج دەستی پێکرد، لەوێ خۆشەویستی خۆی بۆ زمانەکان نیشان دا، بۆیە فێری زمانی عەرەبی بوو و دواتر دەچێتە سەر کاری توێژەر لە زانکۆی ئیسلامی ئەلیگار لە هیندستان، لەوێ دە ساڵی بەسەر برد ، لەو ماوەیەدا کتێبە بەناوبانگەکەی (بانگەواز بۆ ئیسلام)ی نووسیوە، پاشان وەک مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی لاهور کاری کردووە، و لە ساڵی ١٩٠٤ گەڕاوەتەوە لەندەن بۆ ئەوەی ببێتە یاریدەدەری سکرتێری بەشی حکومەتی هیندستان کتێبخانەی نووسینگەی دەرەوەی بەریتانیا.لە هەمان کاتدا وەک مامۆستایەکی نیوەکاتی لە زانکۆی لەندەن کاری کردووە و ئەندامی دەستەی سەرنووسەری ئینسایکلۆپیدیای



## سەرۆكی شۆرشی ئاشتیخوازانەی هیندستان)

## Gandhi



مەهاتاما غاندی دەڵێت: ویستم بزانم سیفاتی ئەو پیاوە چییە كە دڵی ملیۆنانەهای بۆ خۆی ڕاكێشاوە لە مرۆڤ، بەڵام هاتمە سەر ئەو باوەڕەی ئەمە بە شمشێر نەبووە، شمشێر ناتوانێت ئەو مەكانەت و جێگایە دروست بكات، بەڵام بۆم دەركەوت بە هۆكاری سادە و ساكاری و متمانەی تەواوی بە خواكەی و پەیامەككەی ئەو خۆشەویستییەی دروست كردووە، ئەو سیفاتانەی بووە، ڕێگای بۆ خۆش كردووە محمد دروست بێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

ئیسلامی بووە، كە لە چاپی یەكەمدا لە شاری لیدنی هۆڵەندا بڵاوكراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٣٠ وەك مامۆستای سەردانكەر لە زانكۆی میسر كاری كردووە.

جێگای سەرنجە مامۆستای بیرمەندی ئیسلامی هیندی محەمەد ئیقبال بووە. ڕۆژهەڵاتناس و مێژوونووسە دیارەكەی بەریتانی لە هونەری ئیسلامی كە لە كۆلێژی ئینگلیز-ڕۆژهەڵاتی موحەمەدیە، زانكۆی موسوڵمانی عەلیگار، پاشان كۆلێژی عەلیگار، و كۆلێژی حكومی، زانكۆی لاهور وانەی دەوتەوە - سێر تۆماس ئارنۆڵد واكەر (١٩٣٠-١٨٦٤، دیڤۆنپۆرت، دیڤۆن) بوو. هاوڕێی ئەحمەد خان سێر سەید بوو و لەسەر پێداگری سەیید كتێبە بەناوبانگەكەی"بانگەوازی ئیسلامی" نووسی. هەروەها مامۆستای ناودار محمد ئیقبال، شاعیر و فەیلەسوف، سید سلێمان نەدوی و هاوڕێیەكی زۆر نزیكی نۆمانی شیبلی كە هاوكات مامۆستا بووە لە زانكۆی عەلیگاری موسڵمانان.



لە دوای ئەوەی بەرگی دووەمی ژیانیم خوێندەوە، زۆر بەداخەوە بووم کە حەزم دەکرد زیاتر لە ژیانی شارەزا تر بم، بەڕاستی ژیانی پڕ گەورەییە.[١٥٧]

( ئەم وتانەی غاندی لە ڕۆژنامەی (ینگ ئەندیا) بڵاوکراوەتەوە لە چاوپێکەوتنێکدا).

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٥٧ ـ غاندی ١٨٦٩-١٩٤٨ز. ژیاوە، سیاسەتمەدار و سەرکردەی ڕۆحی دیاری هیندستانە لە سەردەمی بزووتنەوەی سەربەخۆیی هیندستان. پێشەنگێکی ساتیاگراها بوو، کە بەرەنگاریی ستەمکاری بوو لە ڕێگەی نافەرمانی مەدەنی بەکۆمەڵەوە، کە لە دوای ئاهیمسا یان ناتوندوتیژی تەواو دامەزرا، کە بووە هۆی سەربەخۆیی هیندستان و ئیلهامبەخش بوو بۆ زۆرێک لە بزووتنەوەکانی مافە مەدەنییەکان و ئازادیخوازی لە سەرانسەری جیهاندا. غاندی لە سەرانسەری جیهاندا بە مەهاتما غاندی ناسراوە.

لە هیندستان بە فەرمی وەک باوکی نەتەوە ڕێزی لێدەگیرێت؛ ڕۆژی لەدایکبوونی کە ٢ی تشرینی یەکەمە، لەوێ بە ناوی "غاندی جایانتی" بەڕێوەدەچێت، کە جەژنێکی نیشتمانییە و لەسەر ئاستی جیهانیش ڕۆژی جیهانیی نەکردنی توندوتیژییە. غاندی ڕەگەزپەرست بوو، پێی وابوو ڕەشپێستەکان لە هیندییەکان و سپی پێستەکان کەمترن، هەروەها پشتگیری لە جیاکردنەوەی سپی پێستەکان و ڕەشپێستەکان دەکرد و دەیبینی کە سپی پێستەکان و هیندییەکان ڕەگەزێکی باڵاترن لە ڕەگەزی ڕەشپێستەکان، باوەڕی بە تیۆری ڕەگەزی ئاریایی هەبووە و وای دەزانی کە ڕەشپێستەکان کەسانی ناشارستانی بوون و ژیانیان لە ژیانی ئاژەڵان دەچێت کە زیرەکی کەمیان هەیە، ناوی دەبردن "کێفیر" (زاراوەیەکی سووکایەتیکردن).



# ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانی

## Willim Montogmery Wott



ولیەم مانتگامەری وات دەڵێت: هیوا و ئومێدم زۆرە ئەو لێکۆڵینەوەی لەسەر ژیانی محمد کردوومە هاوکاریمان بکات بۆ گرنگی پێدان سەرلەنوێ لە ژیانی پیاوێک کە گەورەترین پیاوی نەوەی ئادەمە.

ئەم پیاوە لە پێناوی بیروباوەڕدا زۆر دەربەدەر کرا، ڕەوشی ئەم ئایینە وای دەکرد کە ئەوەی ئیمانی پێدەهێنا و شوێنی دەکەوت، (محمد) وەکو سەرکردە و گەورە و پێشەوا تەماشا دەکرد، لەگەڵ گەورەی و کەسایەتیدا خاوەنی دەست کەوتێکی ڕەهایە ئەویش ئاماژەیە بۆ دادپەروەری و پاکی لە ناساوە بەکەسایەتییەوە، (کتێبی: محمد في مكة)

مانتگامەری وات لاپەڕە ٥٢، هەمان سەرچاوی پێشوو.[١٥٨]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٥٨] ـ مانتگامەری وات ساڵی ١٩٠٩-٢٠٠٦ز. ژیاوە، ڕۆژهەڵاتناسێکی ئینگلیزییە و ئوستازی زمانی عەرەبییە لە زانکۆی (ئادنبرە) هەروەها سەرۆکی بەشی دیراساتی عەرەبییە لە هەمان زانکۆدا.

لە نووسینە بەناوبانگەکانی (محمد لە شاری مەککەدا) ١٩٥٨م نووسیویەتی هەروەها کتێبی (محمد پێغەمبەر و پیاوی دەوڵەتە) و هەروەها کتێبی ( ئیسلام و مەسیحیەت لە جیهانی نوێدا) ساڵی ١٩٦٩ نووسیویەتی.



## مێژوونووسی ئەمریکی

## Will Durant



ویڵ دیورانت دەڵێت: ئەگەر بڕیار بدەین کێ گەورەیە، لەناو خەڵکیدا و پێوەری گەورە بوون چییە، دەبێت بڵێین: بەڕاستی محمد گەورەی هەموو گەورەکانە.

کتێبی (قصة الحضارە)ل ٥٩ بەرگی ١٣.[١٥٩]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٥٩] ـ ویڵ دیورانت: مێژوو نووسێکی بەناوبانگی ئەمریکی لە ساڵی (١٨٨٥- ١٩٨١)ز. ژیاوە یەکێک لە هەرە کتێبە بەناوبانگەکانی بەناوی (چیرۆکی شارستانیەت، قصة الحضارة) کە بریتییە لە ٤٢ بەرگ، ئەم کتێبە ٥٠ ساڵی خایاندووە کە نووسیویەتی.

إسوة للعالمين، د. راغب السرجانی.



# لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی و مێژوونووسی ئینگلیزی
## Bosworth Smith



باسۆرس سمیس دەڵێت: لە ڕاستیدا محمد زەعیم و سەرکردەیەکی سیاسی و ئایینی نەبوو لەیەک کاتدا، بەڵام وەکو پیاوانی دینی هیچ حاشیە و جلەبەرگی تایبەت و گۆچان و تایبەتمەندی بێت.

هەروەکو چۆن خاوەنی فەیلەق نەبوو وەکو قەیسەرەکان، سوپایەکی بەهێزی سەربازی نەبوو، یان پاسەوانی تایبەت و باڵەخانەی بەرز و قایم و بەهێز بەڵکو کەسێکی لەسەرخۆ و هێمن و کۆمەڵایەتی بوو، ئەگەر کەسێک بڵێت کێ بە حوکم و هێزی خوای توانا و سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، دەبێت بڵێین بە تەنها محمد بوو، چونکە ئەو توانی ببێتە خاوەنی سوڵطە و دەسەڵات و سوڵطان بێ ئەوەی خاوەنی کەرەستەکانی بێت، پێشتر کەسێک لە کەسەکانی نەبوو داوای ئەو سوڵطانە بکات. (کتێبی) ( محمد و المحمدیة) ل ٩٢ هەمان سەرچاوە.[١٦٠]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٦٠] ـ باسۆرس سمیس ئەدیبێکی گەورەی بەریتانییە و لە ساڵی (١٨٣٩- ١٩٠٨)ز. ژیاوە، لێکۆڵینەوەی زۆری هەیە لە بارەی پەروەردە و مێژووەوە لە کتێبە گرنگەکانی (محەمەد و موحەمەدي).



# شاعیر و ئەدیبی ئەڵمانی
# جۆهان ۆلفگانگ گۆتە Johann Wolfgang Goethe



گۆتە دەڵێت: گەڕام لە مێژوو دا بۆ پێشەنگ و نموونەی مرۆڤ لە کۆتاییدا دۆزیمەوە ئەو کەسە پێغەمبەر محمد. (دیوانی شعری گۆتی).[١٦١]

گۆتە شاعیر و نووسەری وەرگێری زمانەکانی فەڕەنسی ئینگلیزی و عەرەبی بووە لە فرانکفۆرت لە دایک بووە لە ساڵیَ (١٧٤٩- ١٨٣٢) کاریگەری فیکری ئیسلامی زۆر لەسەر بووە وەرگێڕی شانۆگەری محمدە، نووسەری ئەو شانۆگەرییە ڤۆڵتیرە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٦١] ـ لە ژیانیدا یەکجار ئاهەنگی گێڕاوە ئەویش لە شەوی قەدر دابوو، بۆ قورئان ئاهەنگی گێڕاوە لەبەر گەورەیی و جوانی ئەو کتێبە !! (أسوة للعالمين، د. راغب السرجاني).



# زانای فەلەکناسی و بیرکاری ئەمریکی
# مایکڵ هارت Michaell Hart



مایکڵ هارت دەڵێت: هەڵبژاردنی محمد لە لیستی یەکەم پیاو گرنگترین پیاوانی مێژوو هەندێک کەسی تووشی سەرسامی زۆر کردووە، بۆ ئەم مەبەستە خەڵکێکی زۆری تووشی پرسیار گەلێک زۆر کردووە، بەڵام بە بۆچوونی من محمد هەر دەبێت وابێت، چونکە تاکە پیاوە لە مێژوودا سەرکەوتوو بووە لە هەموو ئاستەکاندا بە پلەیەکی بەرز و بەتایبەتی لە بواری ئایینی دا (المائة الأوائل) مایکڵ هارت ل ٢٩ هەمان سەرچاوەی پێشووتر.[١٦٢]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٦٢] ـ مایکڵ هارت زانای گەورەی ئەمریکی لە بواری فەلەك و لە (ناسا) کار دەکات و مێژوونوس و زانای بیرکارییە لە زانکۆی برنستون هەر لەو زانکۆیە دا پلەی دکتۆرای بەدەست هێناوە لە ساڵی ١٩٧٢، لە بەناوبانگترین کتێبەکانی (١٠٠ نەمرەکە)یە کە پێغەمبەر محمد یەکەم کەس بوو تێیدا و پاشان خاوەنی چەندین لێکۆڵینەوەیە لە بوارەکانی مێژوو و پیاوانی مێژوو.



# کۆتایی کتێب

مەملەکەتی نوور کۆتایی هات سوپاس بۆ خوا، پڕۆژەی دوای ئەم کتێبە ڕووداوەکانی خیلافەت دەبێت کە دەشێت لە دوو بەرگ یاخود زیاتر کۆ بێتەوە، ئەویش زیاتر باسی سیستەمی سیاسی و حوکمڕانی و گوتاری سیاسی و یاساکانی فتوحات دەبێت.

بەڵام پێش نووسینی مەملەکەتی خیلافەت، پڕۆژەیەکی ترم لەبەردەست دایە و ئەویش مژدەیەکە بۆ خوێنەرانی ئازیز کە (مەملەکەتی ئەستێرەیە) باس لە ژیانی هاوەڵان دەکات بە شێوەیەکی گشتی بەڵام بە میتۆدێکی نوێ کە لە ناو کورددا و کتێبخانەی کوردیدا هاوشێوەی نییە لە شێوەی سەرد و ئوسلوبی نووسیندا دوعای خێر بۆ ئەم بەندەی خوایە بکەن و خوای گەورە هەموو لایەک مۆفەق بکات.

وَنَسأل الله بأنه كما آمنا به ولم نره، الا يتركنا حتى يدخلنا مدخله، وأن يجمع بيننا وبينه على حوضه، فيسقينا بيده المباركة الشريفة شربة هنيئة لا نظمأ بعدها أبداً، اللهم آمين.



# سەچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- سیرەی ئیبن هیشام.

٣- اسوة للعالمین- د. راغب السرجانی.

٤- فی ظلال القران- سید قطب.

٥- تەفسیری ئاسان ـ برهان محمد امین.

٦- فقه السیرة النبویة ـ محمد رمضان البوطي.

٧- الرحيق المختوم ـ صفي الرحمن المباركفوري.

٨- قراءة السياسية للسيره النبوية ـ د. محمد رواس القلعجي.

٩- السيرة النبوية ـ د. محمد عەلی الصلابي.

١٠- السيره وبناء الأمم ـ د. راغب السرجاني.

١١- زاد المعاد ـ إبن قيم الجوزية.

١٢- تفسير إبن كثير ـ إبن كثير القريشى.

١٣- السيرة النبوية ـ أبو حسن الندوي.

١٤- السيرة النبوية ـ محمد فارس.

١٥- السيرة النبوية تربية أمة وبناء دولة- صالح احمد الشامي.




١٦- گوتاری سیاسی ئیسلامی لە نێوان ئێستا و مێژوودا- ماکوان کەریم ـ ٢٠١٦ز.

١٧- صحيح البخاري.

١٨- صحيح مسلم.

١٩- عون المعبود ـ أبي داود.

٢٠- فتح الباري ـ ابن حجر العسقلاني.

٢١- السيرة النبوية ـ شيخ شعراوي.

٢٢- اللؤلؤ والمرجان ـ مسلم و البخاري.

٢٣- رياض الصالحين ـ الامام النووي

٢٤- قصص الأنبياء ـ ابن كثير.

٢٥- السيرة الرسول ـ د. طارق السويدان.

٢٦- السيرة الرسول ـ مصطفى السباعي.

٢٧- الرسول ـ سعيد حوى.

٢٨- تفسير الجلالين ـ السيوطي.



# پێرست




شەرم لەخۆم دەکەم کە بە ناوی موسڵمـان بوونـەوە نـاوی جـەنابتـان هـەڵدەگرین و گـومـڕا دەبین و تـاوان دەکـەیـن و بـە نـاوی جـەنـابتـان و دینـەکەتەوە تەواو ئەبێت تـا ئەو ڕادەیەی گەورەیی جەنـابتمان لەبیر کرد و بە کـردارەکـانمان ڕێگـە بـە مولحید و کافر دەدەین بۆ سوکایەتیکردن بە فـەزای پـیـرۆزت، تـەنـهـا وەڵامـی موسوڵمـانان ئـەوەیـە کـە ویّتـەی ئـەو ئامرازانـە بگـۆڕن کـە بەرهەمـی ئـەوان بوون بۆ چەند ڕۆژێک.



